زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی

٨






# ڕۆژی دوایی

# ٢

# قیامەتی گەورە

وەرگێڕانی: ئارامی گەلاڵی

لە بڵاوکراوەکانی: نووسینگەی تەفسیر

بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی
قورئان و سوننەتدا

## ڕۆژی دوایی

## ٢

# قیامەتی گەورە

نوسینی: د. عومەر سلێمان ئەشقەر
وەرگێڕانی: ئارامی گەلاڵی
پێداچوونەوەی: نەوا محمد سعید

| | |
|---|---|
| زنجیرەی: | بیروباوەڕ لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا |
| ناوی کتێبە بە عارەبی: | القيامة الكبرى |
| ناوی نوسەر: | د. عومەر سلێمان ئەشقەر |
| نۆرەی چاپ: | سێیەم |
| ساڵی چاپ: | ١٤١١ك - ١٩٩١ز |
| ناوی کتێب بەکوردی: | قیامەتی گەورە |
| ناوی وەرگێڕ: | ئارامی گەلاڵی |
| پێداچوونەوەی: | نەوا محمد سعيد |
| ئەرکی چاپ: | پرۆژەی وەرگێڕان |
| پیتچنین: | نوسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر |
| نۆرەی چاپ: | یەکەم |
| ساڵی چاپ: | ١٤٢٢ك ٢٠٠١ز |
| چاپکردن: | ئۆفسێتی هەولێر |
| تیراژ: | ١٥٠٠ دانە |
| ژمارەی سپاردن: | ٥٤ ساڵی ٢٠٠٠ |

# پێشەکی وەرگێڕان

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە، تا بەهێزتر بێ موسڵمانێتی بەرهەمدارتر و بەرهەمی بەپێزتر و پێزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بو کە گەورەترین وەرچەرخانی بێوێنەی خستە مێژوی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتی لە نشێوی‌و داڕوخان و وێرانی رزگار کرد، رەوشی ستەمئامێزی تارومار کرد، دەستی رەشی زۆردارانی بڕی، کۆیلەو چەوساوانی ئازاد کرد، باڵی بەزەیی و دادگەری بەسەر جیهاندا راهێڵا و سەرجەم گەل و توێژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاری‌و کوشت و بڕ و تاڵان و بڕۆ و بەرهەڵدایی و بێئابڕویی کوژایەوە، روحی مرۆڤپەروەری و رێزی مرۆڤ ژیایەوە.

گەشانەوەی گوڵی چاکەکاری و خۆشی و داد و رێز و هێمنی و خۆشگوزەرانی و ئازادی و سەربەستی بەهۆی بیروباوەڕی ئیسلامیەوە دێتەدی، بەڵام تەقینەوەی بورکانی وێرانی و خراپەکاری و ناخۆشی و ستەم و بێهودەیی و نیگەرانی و تاڵگەردی و ژێردەستەیی و کۆیلایەتیش بەهۆی بیروباوەڕی نائیسلامیەوە بەرپا دەبێ، چونکە هەمویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەست و ئاوەزی بەرژەوەندناسی و هزری کاریگەر بەدەوروبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نەبێ وێرانە و وێرانی دەنێتەوە ئەگەرچی بانگەشەی بنیاتنان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانە سیخناخ بوە کە هەرجارەی بیروباوەڕێکی قرپۆك پەیدابوەو مرۆڤایەتی کردۆتە قوربانی، ئەدی بیروباوەڕی ئەستێرەناسی گەندەڵی فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هەژاری

کردە کۆیلەو بەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی هەرەمەکانی پێ دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کە بەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشەیانە ئاخۆ (مەسیح) خوایە یان مرۆڤ! هەزاران هەزار مرۆڤی کردە قوربانیو سەدان شەڕو کوشتاری درێژخایەنی نایەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی شوفێنیزمی ئەوروپا نەبو کە دو جەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بەملیۆنان مرۆڤیان کرد بە قوربانی؟!، ئەدی هەر بیروباوەڕە شەیتانیەکان نیە کە وای کردوە هەمو رۆژێ بۆمبای ئەتۆمی و هایدرۆجینی و نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتی و زەوی وەبەرهەم بێ؟!

چاك سازانەوەی رەوشی مرۆڤایەتی، رەوینەوەی ترسی وێرانی، گەڕانەوەی خۆشیو ئارامی، بەرپاکردنەوەی دادگەری لەسەرتاسەری جیهاندا؛ بەهۆی براقێکەوە دەبێ کە لەسەر بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد دامەزرا بێ و لەقورئان و سوننەت هەڵێنجرابێ، ئەگەر نا هەر وێرانی لەناو وێرانی بەرپا دەبێ و مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی کاریگەرێکی قوڵ و گەورەی لەخۆ گرتوە، کاریگەرێکی ئەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی تاوانکار و دڵڕەق و بێبەزەیی و وێرانکاریش بێ، سەرلەبەری کیانی ئەم مرۆڤە دەگۆڕێت، گۆڕانێك هەمو لایەنەکانی بگرێتەوە، چونکە بیروباوەڕی ئیسلامی چارەسەر و ئامۆژەکانی بۆ رەگ و ریشاڵی مرۆڤە، هزر و ئاوەز و دەرونی رێك دەخاتەوە و تەپ و تۆزی شەیتان و هەوەست و خۆپەرستی لەسەر دەرونی لادەدات و پاکی دەکاتەوە، ئەمجار رێوشوێنێکی راستاڵی بۆ رادەنوێنێو پێی دەڵێ فەرمو ئەمەش ژیانی خۆشبەخت و بێوێنە و نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکەوە چوبێتە نێو ئەم بیروباوەڕەوە یان لەهەر گۆشەنیگایەکەوە تێی روانیبێ و خزمەتێکی پێشکەش کردبێ و متمانەی بەسەرچاوەی بێگەرد و دور لە خورافات و شتی بێهودە کردبێ، هەڵبەت کارێکی گەورەی ئەنجام داوە و خزمەتەکەی بەشێکە لەم رزگاربونە سەرتاسەریەی کە مرۆڤایەتی دەمێکە بۆی عەودالە.

دیاره ئەم زنجیرەیەی کە دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر نوسیویەتی‌و ناوی ناوە ((العقيدة في ضوء الكتاب والسنة)) بەشداربون و خزمەتێکی گەورەی ئەم مەیدانەیە، کە متمانەی کردۆتە سەر سەرچاوەو ژێدەرە رەسەنەکانی بیروباوەڕ و بیروباوەڕە پوکەڵ و لاڕێ و ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوە و پاك و پوختەکەی راگەیاندوە، کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لە رانواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، ئوسلوبێکی سادە و رێکوپێك و زانستیانەی بەکارهێناوە بەتایبەتی لە بەرگەکانی دواییدا، ناوەڕۆکی پەڕتوکەکەش پتر ئایەت و فەرمودەو دەقی زانا بەرزەکانی هێناوەتەوەو لەبەر تیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی رۆشن کردۆتەوە، ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگەرمی پێشوازیان لێکردو گەلێ زاناو نوسەریش لە نوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە تا موسڵمانان بەهرەی لێوەرگرن، لەناو موسڵمانانی کوردیش سەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ چاکی‌و سودی ئەم زنجیرەیە، بەم پێودانگە پێمان وایە وەرگێڕانی ئەم زنجیرەیە گەلێك پێویست بو بۆ رابونی ئیسلامی لەکوردستان، تا گەلی کوردیش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خۆی حاڵی بێت و لاڕێ نەبێ، لەبەر گرنگی‌و لەبەر چاکی‌و بەهرەی ئەم زنجیرەیە، پشت بەخوا بڕیارمان دا وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی، لە وەرگێڕانەکەدا هەوڵمان داوە ئاستێکی زمانەوانی باشی پێبدەین و ئیشکالات بۆ خوێنەر بەجێنەهێڵین، وا بەرهەمەکان لەبەردیدی خوێنەرانەو ئەوان دەتوانن وەرگێڕانەکە هەڵسەنگێنن، لەخوا داواکارین لەکارەکەماندا سەرکەوتو بین و توانیبمان خزمەتێك بەم رابونە پیرۆزەی کوردستان بکەین، خوا پاداشتی بەرهەراوی خۆی بەئێمە و ئێوەش ببەخشێ.

ئارامی گەلالی　　　　ژیوانی گەلالی

# ڕشتەی بابەتەکان

## بەندی هەشتەم

## بەندی نۆیەم



## بەندی دەیەم

## بەندی یازدەم

بەندی دوازدەم



بەندی سێزدەم



بەندی چواردەم

# پێشەکی

ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە هیچ شتێك دەسەوسان نابێ و توانای بەسەر تەواوی شتان و زانیاری بە سەر هەمو بەدیهێنراواندا هەیە، کە هەمو شتێك و هەمو بەدیهێنراوێك لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە، بەندەکانی لە هیچەوە هێناوەتە ئاراوەو بەرەو نەبونیشیان دەباتەوە پاشان دوبارە زندویان دەکاتەوە و ژینیان بەبەردا دەکاتەوە.

درودو سڵاو پێشکەشی موحەممەدی بەندەو پێغەمبەر بێ؛ کە پەیامبەری هەڵبژێردراوەو خاوەنی تکای مەزن و شوێنپایەی ستایشمەندە، هەروەها سڵاو بۆ هەمو خانەوادەو یاوەرانیشی، بۆ ئەوانەش کە تا ڕۆژی دوایی شوێنکەوتویانن.

خوێنەرانی ئازیز!

ئەمەش پەرتوکی دوەمە، کە باسی ڕۆژی دوایی تێدا دەکەین و بابەتەکەشی بریتیە لە قیامەتی گەورە، ڕێخۆشەکیەك و چوارده بەندی لە خۆوە گرتوە، ڕێخۆشەکیەکە بۆ پێناسەی ڕۆژی قیامەت تەرخان کراوە. لە بەندی یەکەمدا ناودارترین ناوەکانی ڕۆژی دواییم باس کردوەو نهێنی زۆری ناوەکانی ئەو ڕۆژەشم خستۆتە ڕو.

لە بەندی دوەمدا ئەو وێرانیەم ناساندوە کە لەگەڵ فوی یەکەمی کەڕەنادا ژیان لەناو دەچێ، هەمو ئەو دەقانەی کە لەبارەی پێناسەی کەڕەنادا هاتون خستومەتە ڕو. فوکەری کەڕەناو ڕۆژی فوکردنەکەشم باس کردوە، ژمارەی فوەکان چەندە؟ باسم کردون، ئەوانەشم خستۆتە بەرباس کە لەگەڵ مەرگی سەرتاپاییدا نامرن.

بەندی سێیەم تایبەتە بە سیفەتی زندوبونەوەو ڕەوشی بەندەکان. بەندی چوارەم تایبەتە بە باسکردنی چۆنیەتی ئەو زەویەی کە کۆبونەوەی لەسەردا ئەنجام دەدرێ. لە بەندی پێنجەمدا بەڵگەکانی زندوبونەوەم خستۆتە بەر دیدان و وەڵامی

بێبڕوایانیشم داوەتەوە. بەندی شەشەم باسی ئەوە دەکات ئاخۆ ڕۆژی قیامەت لە لای پێغەمبەراندا چۆن باسکراوە، کە هەڵبەت هەموویان باسیان کردوە، لەم بەندەدا جێباسێکیش تەرخانە بە بابەتی "ڕۆژی قیامەت لە پەرتوکی نامەوەران(اهل الكتاب)دا". بەندی حەوتەم تایبەتە بە ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت و خستنە ڕوی ئەو دەقانەی کە باسی لەرزینی زەوی و پەڕەم بەپەڕەم بونی شاخەکان و تەقینەوەی دەریاکان و شەقبونی ئاسمان و پێچرانەوەی ڕۆژو تاریکبونی مانگ و هەڵوەرینی ئەستێرەکان دەکات.

بەندی هەشتەم رەوشی خەڵکی ڕۆژی قیامەت ڕون دەکاتەوە کە دەبنە سێ پۆل: بێبڕواو هاوبەشپەرستەکان، گوناحبارو سەرپێچیکاران، پارێزکارو چاکەکاران. تێیدا باسی ڕیسوایی و سەرشۆڕی و پوچەڵ بونەوەی کردەوە چاکەکانی بێبڕواکان کراوە، باسی هەندێ لەو گوناحانە کراوە کە سزای لە سەرە، باسی ئارامی پارێزکاران و ئەو کردەوانەی دەبنە مایەی ڕزگار بونیان کراوە. بەندی نۆیەم تەرخانە بە تکاخوازی(شفاعة)ی مەزن و شوێنپایەی ستایشمەند(مقام المحمود)ەوە، کە تایبەتە بە موحەممەدﷺ کە لەلای خواوە تکاخوازی دەکات تا خەڵك لە ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت ڕزگاریان بێ، ئەوجا کە خوا بەندەکان دادگایی دەکات، کە پاشان بەهەشتیەکان بۆ بەهەشت و دۆزەخیەکان بۆ دۆزەخ ڕەوان دەکرێن. بەندی دەیەم تەرخانە بە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت و بەندێکی دورو درێژە، باسی واتای لێپرسینەوەو دیمەنەکان و ئەوانەی بەرپرسیارن و ئەو یاسایانەی بنچینەی لێپرسینەوەن و ئەو کردەوانەی پرسیاریان لێدەکرێ و یەکەمین لێپرسینەوە لە چی دەکات. لەم بەندەدا ڕونم کردۆتەوە کە سێ جۆرە لێپرسینەوە هەیە: مشتومڕو گفتوگۆ، ڕانواندنی کردەوان، سەر کۆنە و گازاندە کردن. لە بەندی یازدەم باسی تۆڵە وەرگرتنەوەو چۆنیەتی تۆڵە وەرگرتنەوەم کردوە. بەندی دوازدەمم تایبەت کردوە بە: پێناسەی تەرازو، ڕونکردنەوەی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەت، ئەو شتانەی دەکێشرێن، ئەو کردەوانەی لە تەرازودا قورسن. لە بەندی سێزدەمدا باسی ئەم شتانەم کردوە: کانیاوەکە(حوض)ی موحەممەد ﷺ ، فرەوانیەکەی، شیرنایی و سازگاریەکەی، ئەوانەی لێی تێراو دەبن، ئەوانەی لێی

دەردەکرێن. بەندی چواردەمیش تەرخانە بە باسی دیمەنەکانی کۆکردنەوە بەرەو بەهەشت و دۆزەخ، هەروەها جێباسێکی تێدایە کە لە بارەی پردی دۆزەخەوە دەدوێ، هەروەها رونم کردۆتەوە کە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت لەم بارەوە چۆنە؟

لە خوا دەخوازم لە ڕیزی سەرکەوتوانی ئەو ڕۆژەمان هەژمار بکات و لە گوناح و تاوان و هەڵەکانمان ببورێ و پلەو پایەمان بەرز بکاتەوەو لە ژێر سێبەری بارەگای خۆی ڕامانگرێ کە جگە لەو سێبەرە چیتر نیە. إنَّه قريب مجيب وصلى الله وسلم على عبده ورسوله محمَّد وعلى آله وصحبه وسلم.

د. عومەر سلیمان ئەشقەر

کوێت

١٨/رەمەزان/١٤٠٦ک

٢٦/٥/١٩٨٦ز

# ڕێخۆشەکی
# پێناسەی قیامەتی گەورە

ڕۆژێك دادێ کە لەم ڕۆژەدا خوای هەمیشە زینـدو و مشـورگێڕ هـەرچی ژیـن و ژینەوەر هەیە لەناوی دەبات، وەکو دەفەرموێ:

﴿كُـلُّ مَـنْ عَلَيْـهَا فَـانٍ، وَيَبْقَـىٰ وَجْـهُ رَبِّـكَ ذُو الْجَـلاَلِ وَالإِكْـرَامِ : تەواوی ئەو کەسانەی لەسەر زەوین تونا دەبن. ئەوەی بمێنێ تەنها روی شکۆمەندو بەرێزی پەروەردگارتە﴾ الرحمن ٢٦-٢٧.

﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَـهُ: هـەمو شتێك تونا دەبێت تەنها ڕوی پـەروەردگار نەبێت.﴾القصص ٨٨.

پاشان کاتێك دادێ خوا هەمو بەندەکان زینـدو دەکاتـەوەو لەبەر دەستی خۆیـدا ڕایـاندەگرێت بـۆ ئـەوەی لـە بـارەی کردەوەکانیـان لێپرسـینەوەیان لەگـەڵدا بکـات. هەڵبـەت لـەم ڕۆژەدا سـەرجەم بـەندەکان دوچـاری ناسـۆرو مەرگەسـاتی بـەترس و سامناك دەبن، هیچ بەندەیەك لە ڕەوشـە دژوارەکـەی ئـەو ڕۆژەدا ڕزگـاری نـابێ تەنـها ئەوانە نەبن کە تێشویان پاشەکەوت کردوەو بڕواو کردەوەی چاکـەیان بۆ سـازداوە، ئـەنجا کـە لێپرسـینەوە تـەواو بـو؛ بـەرەو هـەواری گیرسـانەوە(دار القـرار) دەبرێـن، ئەوکاتە یان بەرەو بەهەشتە یان بەرەو دۆزەخ.

جا ئەو ڕۆژە ڕۆژی قیامەتە.

## بەندی یەکەم

# ناوەکانی رۆژی قیامەت

خوای گەورە چەندین ناوی لەو رۆژە ناوە کە جیهانی تێدا وێران دەبیٚو پاشان زیندو بونەوەو کۆکردنەوەو لێپرسینەوەی بە دوا دادێت. زۆر لەزانایان بایەخیان بە کۆکردنەوەی ناوەکان داوە، تەنانەت هەروەکو ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: غەزالیو قورتوبی نزیکەی پەنجا ناویان هەڵژماردوە.[1]

قورتوبی هەمو ناوەکانی هێناوەتەوەو یەك بەیەك راڤەی کردون، بەڵام راڤەکەی لە پەرتوکی ((سراج المريدين))ی ئیبنولعەرەبی وەرگرتوە، ڕەنگە لە راڤەو لێکدانەوەکاندا کەمێکی لێ زیاد کردبێ.[2]

هەندێ زانای تر تەنها ناوەکانیان هەلژماردوە بێئەوەی راڤەو لێکدانەوەیان بۆ کردبێ، بۆ وێنە: ئیبنو نەجاح لە پەرتوکەکەیدا بە ناوی ((سبل الخيرات))و ئەبو حامدی غەزالی لە ((الأحياء))دا، ئیبنو قوتەیبە لە ((عيون الأخبار))دا.[3]

ئێمەش لەم تۆژینەوەیەدا ناسراوترین ناوەکان دەخەینە ڕو، بۆ هەر یەکەشیان پێناسەیەکی کورت و پوختی بۆ دەنوسین.

---

[1] فتح الباري (١١/١٩٦)

[2] التذكرة: ٢٣٣.

[3] التذكرة:٢٣٢.

## ناسراوترین ناوەکانی ئەم ڕۆژە

**١- ڕۆژی قیامەت: ئەم ناوە لە حەفتا ئایەتدا یاد کراوە، بۆ وێنە:**

﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيهِ: **جگە لە خوا خواوەندی تر بونی نیە، ئەو خوایەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا کۆتان دەکاتەوە کە هیچ گومانێك لە بەرپا بونیدا نیە**﴾. النساء:٨٧.

﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا: **لەڕۆژی قیامەتدا بێبڕواکان لەسەر ڕو و بەکوێری و کەڕی و لاڵی کۆدەکرێنەوە**﴾.الإسراء:٩٧.

﴿إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: **دۆڕاوە ڕاستەقینەکان ئەوانەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا خزم و کەسیان دۆڕاندوە، بەو جۆرەی کە خۆیان دەچنە ناو دۆزەخ و خزم و کەسەکانیشیان ئەگەر لە دۆزەخدا بن ئەوا دادیان نادەن، ئەگەر لە بەهەشتیشدا بن لێیان جودا دەبنەوە**﴾. الشورى:٤٥.

**وشەی (القيامة) لە زماندا چاوگە بۆ (قام، يقوم)، جا تێی خڕ(ة)ی بۆ مبالەغە تێخراوە کە باوێکی زمانی عارەبەکانە. کە ئەم ناوەشی لێنراوە لەبەر بەرپابونی ئەو کارەساتە مەزن و کەس نەدیوانەیە کە لەو ڕۆژیدا ڕو دەدەن، هەروەها لەبەر ئەوەیە کە لەو ڕۆژیدا سەرجەم خەڵك بۆ بەردەستی پەروەردگاری جیهانیان هەڵدەستنەوە.**

**٢- ڕۆژی دوایی: بۆ وێنە خوا دەفەرموێ:**

﴿وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ: **بەڵکو چاکە؛ بڕوا بونە بەخواو ڕۆژی دواییو فریشتە و پەرتوك و پێغەمبەران.**﴾البقرة:١٧٧

﴿ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ : **ئەم وتەو فەرمودانەی لە ئایەتەکانی پێشو وترا؛ تەنها ئەو کەسانەتان ئامۆژگاری پیَوەردەگرن کە بڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە**﴾ البقرة:٢٣٢.

﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ: **تەنها ئەو كەسانە مزگەوتەكانی خوا ئاوەدان دەكەنەوە كە بڕوایان بە خواو بەڕۆژی دوایی هەیە**﴾التوبة:١٨

**هەندێ جار تەنها بە (الآخرة: دوایی) یان بە (دار الآخرة: هەواری دوایی) ناوی بردوە، وەكو دەفەرموێ:**

﴿وَلَقَدْ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنْ الصَّالِحِينَ: **هەڵبەت لە دونیادا ئیبراهیممان بۆ پێشەوایی مەردوم هەڵبژارد، هەروەها لە دوایشدا لە ڕیزی چاكەكارانە**﴾ البقرة: ١٣٠..

﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ: **ئەوانەی ژینی دنیایان دەفرۆشن و ژینی دوایی پیٚدەكڕن؛ با لەپێناو خوادا بجەنگن.**﴾النساء:٧٤

﴿تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لاَ يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلاَ فَسَاداً: **هەواری دوایی بەو كەسانە دەبەخشین كە لە زەویدا فیزبالآیی نانوێنن و خراپەكاری نانێنەوە**﴾ القصص:٨٣.

﴿وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ: **ژیانی هەواریی دوایی؛ ژیانی ڕاستەقینەو هەمیشەییە، ئەگەر بزانن.**﴾ العنكبوت:٦٤. **ئەم ڕۆژە لەبەر ئەوەی هیچ ڕۆژی تری بەدوادا نایێت بۆیە ناو نراوە ڕۆژی دوایی.**

**٣- كاتی دیاریكراو: بۆ وێنە خوا دەفەرموێ:**

﴿وَإِنَّ السَّاعَةَ لآتِيَةٌ فَاصْفَحْ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ: **گومانی تێدا نیە كاتی دیاریكراو دێت تا بێبڕواكان سزای خۆیان وەرگرن، بۆیە تۆ بە چاوپۆشیەكی جوان چاوپۆشییان لەگەڵدا بنوێنە**﴾ الحجر:٨٥..

﴿إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا: **كاتی دیاریكراو دێت بەڵام من شاردومەتەوە**﴾طه:١٥.

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ: **خەڵكینە ! لە پەروەردگارتان بترسن، بومەلەرزەی كاتی دیاریكراو كارەساتێكی مەزنە**﴾الحج:١.

**قورتوبی دەڵێ: "(الساعة: کاتی دیاریکراو) لە زمانی عەرەبیدا بە بەشە وەختێکی دیاریکراو دەگوترێ، لە باو و نەریتیشدا بەشێکە لە بیست و چوار بەشی شەو و رۆژێك، کە هەردوکیان بنچینەی کاتن.. بەڵام کە ئەلف لامی دەخرێتە سەر ئەوا گوزارشت لەو کاتە دەکات کە تێیدا دەژین، کە پێی دەڵێن (ئێستا) و بۆ رۆژی قیامەت بەکار هاتوە، جا یان لەبەر ئەوە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە ڕودانی ئەو ڕۆژە نزیکەو هەمو هاتوێکیش هەر نزیکە. یانیش لەبەر ئەو ڕوداو و قەومانە گەورەو مەزنانەیە کە پێستی مرۆی لەبەردا دەتوێتەوە. هەروەها هەندێ زانا وتویانە: بۆیە پێی وتراوە وەختی دیاریکراو چونکە لە ناکاوی وەختێکی دیاردا بەرپا دەبێ))**[1].

**٤- رۆژی زندوبونەوە(یوم لبعث):** بۆ وێنە خوا دەفەرموێ:

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنْ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ: **خەڵکینە! ئەگەر گومانتان لە زندوبونەوە هەیە؛ ئەوا ئێوەمان لەخۆڵ بەدیهێناوە**﴾ الحج:٥.

﴿وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْبَعْثِ فَهَذَا يَوْمُ الْبَعْثِ: **ئەوانەی خوا زانیاریو بڕوای پێداون بە بێبڕواکان دەڵێن: لە دوای مردنتانەوە تا ڕۆژی زندوبونەوە لە زانستی پەرتوکی خوادا دابون، بەڵێ ئەوەتانێ ڕۆژی زندوبونەوە**﴾ الروم: ٥٦.

**ئیبنومەنظور دەڵێ : (البعث: ئەوەیە کە خوا مردوان زندو دەکاتەوە، زندوکردنەوەی مردوانیش ژیاندنەوەیانە بۆ رۆژی زندوبونەوە)**[2].

**٥- رۆژی دەرچون(یوم الخروج):** خوا دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ: **لە رۆژێکدا بە ڕاستەقینەیی شاخەو شریخەکە دەبیستن، ئەم رۆژە رۆژی دەرچونە**﴾ ق:٤٢..

﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنْ الأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ: **ئەو رۆژەی کە**

---

[1] التذكرة: ٢١٦.

[2] لسان العرب: ماددەی: (ب.ع.ث) (١/٢٣٠).

**خێرا له گۆڕەکانیان دەردەچن، وەك بڵێی بۆ بتەکانیان تاو بدەن.**﴾المعارج: ٤٣..

﴿ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِنْ الأَرْضِ إِذَا أَنْتُمْ تَخْرُجُـونَ: **پاشان کە یەکجار بانگتان دەکات ئێوە دەستبەجێ لە زەویدا دەردەچن.**﴾ الروم: ٢٥.

**بۆیە ناوی نراوە رۆژی دەرچون چونکە بەهۆی فوی کەڕەناوە تەواوی بەندەکان لەنێو گۆڕدا دەردەچن.**

**٦- راچڵەکێنەر(القارعة): خوا دەفەموێ:**

﴿الْقَارِعَةُ، مَا الْقَارِعَةُ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ: **راچڵەکێنەر؟! راچڵەکێنەر چیە؟ تۆ چوزانی راچڵەکێنەر چیە؟**﴾.القارعة :١-٣

**قورتوبی دەڵێ: بۆیە ناو نراوە راچڵەکێنەر چونکە کارەسات و پێشهاتەکانی ئەو رۆژە دڵ رادەچڵەکێنێ، عارەب زمانان دەڵێن : (اصابتهم قوارع الدهر: کارەسات و پێشهاتەکانی رۆژگاریان دوچار هات)).**

**خەنساء وتویەتی:**

تعرفني الدهر نهشاً وحز ا وأوجعني الدهر قرعاً وغمزاً

**لەم دێرە شیعرەدا مەبەستی لەوە دێ کە بە کارەساتی گەورەو گچکەی رۆژگار گرفتار بوە.**[1]

**٧- رۆژی جودابونەوە (یوم الفصل): خوا دەفەرموێ :**

﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ: **ئەوەتانێ، ئەوە رۆژی جودابونەوەیە کە بڕواتان پێ نەدەکرد**﴾ الصافات : ٢١.

﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْــــلِ جَمَعْنَــاكُمْ وَالأَوَّلِيــنَ: **ئەمڕۆ رۆژی جودابونەوەیە، ئێوەو پێشینانمان کۆکردۆتەوە**﴾ المرسلات : ٣٨.

---

[1] التذكرة : ٢٠٩

﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا: **رۆژی جودابونەوە کاتی کۆبونەوەی مەردومانە**﴾النبأ:١٧.

**ئەم رۆژە بۆیە بە رۆژی جودابونەوە ناو نراوە چونکە بەندە نەیار و ناکۆکەکان لێك جودا دەکرێنەوەو دۆز و کێشەکانیان شی دەکرێتەوەو بڕیاریان بۆ دەدرێ. خوا دەفەرموێ:**

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ: **لە رۆژی قیامەتدا خوا بە خۆی جودایان دەکاتەوەو ناکۆکی نێوانیان ساغ دەکاتەوە**﴾ السجدة:٢٥..

**٨- رۆژی پاداشت و سزا(*یوم الدین*): خوا دەفەرموێ:**

﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ، يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ، وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ، ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ، يَوْمَ لاَ تَمْلِكُ نَفْسٌ لِنَفْسٍ شَيْئًا وَالأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ: **بەدکاران لە دۆزەخن. لەرۆژی پاداشت و سزادا دەچنە ناوی. بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە و لێی دەرناچن. تۆ چوزانی رۆژی پاداشت و سزا چیە. دیسان تۆ چوزانی رۆژی پاداشت و سزا چیە؟ رۆژێکە هیچ کەس هیچی بەدەست نیە بۆ هیچ کەس، لەو رۆژەدا فەرمان تەنها بۆ خوایە**﴾ الإنفطار: ١٤-١٩.

﴿وَقَالُوا يَاوَيْلَنَا هَذَا يَوْمُ الدِّينِ: **بێبڕواکان دەڵێن: ئەی هاوار! خۆ ئەوە رۆژی پاداشت و سزایە**﴾ الصافات:٢٠.

**وشەی (الدین) لە زمانی عەرەبیدا بە واتای پاداشت و سزاو لێپرسینەوە دێت. شاعیرێك دەڵێ:**

**حصادك يوماً ما زرعت وإنّما　　يدان الفتى يوماً كما هو دائن**

**کەواتە بۆیە بەو رۆژە وتراوە رۆژی پاداشت و سزا چونکە لەو رۆژەدا خوا لە بەندەکانی دەپرسێتەوەو سزاو پاداشتیان دەداتەوە.**

**٩- شاخەوشریخە(الصاخە): خوا دەفەرموێ:**

﴿فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ : **ئەو کاتەی شاخەو شریخەکە دێت.**﴾ عبس:٣٣..

**قورتوبی دەڵێ: ((عیکریمە دەڵێ: شاخەوشریخەکە، فوی یەکەمە، کارەساتی هەرە گەورەش فوی دووەمە. طەبەری دەڵێ: من وادەزانم کاتێك کە دەڵێن؛ (صخّ فلان فلانا) مەبەست ئەوەیە: فلان فیساری کەڕ کرد. ئیبنولعەرەبی دەڵێ: (الصاخّة) دەبێتە مایەی کەڕبون کەچی دەشبیسترێ، هەڵبەت بەکارهێنانی ئەم وشەیە رەوانبێژیەکی ناوازەی تێدایە، تەنانەت هەندێ گەنج و تازە پێگەیشتو وتویانە:**

أصم بك الناعي وان كنت أسمعا

**یەکێکی تر وتویە:**

أصمَّني سيرهم أيام فرقتهم فهل سمعتم بسير يورث الصمما

**ئێ دە بەو خوایە خەڵك شاخەو شریخەی رۆژی دوایی دەبیستێ، لە ئاست دنیا کەڕیان دەکات و تەنها کاروباری ئاخیرەتیان گوێ لێدەبێ))[1].**

**ئیبنو کەثیر دەڵێ: ((بەغەوی دەڵێ: (الصاخّة) واتە: هاوار و قیژەی رۆژی دوایی، بۆیە بەم ناوە ناودێرکراوە چونکە گوێ کاس دەکات و مرۆڤ بە جۆرێکی وا گوێی لێدەبێ هەر ئەوەتە کەڕی ناکات)).[2]**

**١٠- کارەساتی هەرە گەورە(الطامة الكبرى): خوا دەفەرموێ:**

﴿فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَى: **جا کە کارەساتی هەرەگەورە قەوما**﴾ النازعات:٣٤.

**بۆیە بەم ناوە ناو نراوە چونکە هەمو روداوە مەزن و سامناکەکان لەو رۆژەد بەرپا دەبن. هەروەکو خوا دەفەموێ:**

﴿وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ: **کاتی دیاریکراو ژوانگەیانە، کە سزای ئەو رۆژ سەختترو تاڵترە**﴾القمر:٤٦

---

[1] التذكرة: ٢٢٧.

[2] تفسير ابن كثير (٧/٢١٧).

قورتوبی دەڵێ: (الطامَة) واتە (زاڵ). ئەگەر شتێك زاڵ و بالا ببێ دەڵێن (طمّ الشيء). جا لەبەر ئەوەی کارەسات و روداوەکانی رۆژی دوایی هەمو شتێك دادەگرنەوە بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە. حەسەن دەڵێ: کارەساتی هەرە گەورە: فوی دوەمە. هەروەها وتراوە: ئەوەی پێمەبەستە کە بێبڕواکان بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن))[1].

١١- رۆژی ئاخ هەڵکێشان(يوم الحسرة): خوا دەفەرموێ:

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ: هەرەشەی رۆژی ئاخ هەڵکێشانیان لێ بکە کە کار لە کار تەواو بوە، کەچی ئەوانیش لە بێئاگاییدان و بڕوا ناهێنن.﴾ مريم:٣٩..

بۆیە بەم ناوە ناسێنراوە چونکە مرۆڤ لەو رۆژەدا داخ و خەفەت و حەژمەتێکی بێئەندازە دەخوات و ئەفسوسێکی بێپایان هەڵدەکێشێ، داخ و حەژمەت و پەشیمانی بێبڕواکانیش هەر باسی ناکرێ.

﴿حَتَّى إِذَا جَاءتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا يَاحَسْرَتَنَا عَلَى مَا فَرَّطْنَا فِيهَا: ئەو بێباوەڕانە پەشیمان نابنەوە تا لە ناکاوێکدا کاتی دیاریکراویان دوچار دەبێ ئەنجا دەڵێن: داخی داخان! بە سەبارەتی پێ دریژیو سەرپێچیمانەوە چمان لە خۆ کرد!﴾الأنعام:٣١.

فەرمو بزانە، بێبڕواکان کە توشی سزاو ئەشکەنجە دەبن چ ئاخێك هەڵدەکێشن:

﴿أَنْ تَقُولَ نَفْسٌ يَاحَسْرَتَا عَلَى مَا فَرَّطْتُ فِي جَنْبِ اللَّهِ وَإِنْ كُنْتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ، أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي لَكُنْتُ مِنْ الْمُتَّقِينَ، أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى الْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنْ الْمُحْسِنِينَ: بگەڕێنەوە، بەر لەوەی پەشیمانی هەڵکێشن و بڵێن: بەداخەوە! چم لە خۆم کرد، سەر پێچیم لە فەرمانەکانی خوا کردو دور لەخوا بوم، ئاخ! خۆ من یەکێك بوم لە گاڵتەجاڕان!. بگەڕێنەوە بەر لەوەی بڵێن: ئاخ ! خۆ ئەگەر خوا ڕێنوێنی بکردبام منیش لە پارێزکاران دەبوم و هاوبەشم پەیدا نەدەکرد. بگەڕێنەوە بەر لەوەی سزای خوا ببینن و بڵێن : ئاخ ! وای ئەگەر بۆ دونیا

[1] التذكرة: ٢٢٧.

دەگەڕامەوە چۆن کاری چاکم دەکرد!﴾ الزمر:٥٦-٥٨.

بێبڕواکان ئەوپەڕی داخ و ئەفسوس و حەژمەت هەڵدەکێشن و دەگەنە ڕادەیەك یەخە لە یەکتر هەڵدڕن و گەورە و بچوکیان کەس خۆی نەکاتە کەسی کەس:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا كَذَلِكَ يُرِيهِمْ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنْ النَّارِ: شوێنکەوتوانی یاخیەکان لەو ڕۆژەدا دەڵێن: وای ئەگەر تەنها بۆ ئەم جارە بۆ دنیا دەگەڕاینەوە، تا خۆمان لێ بێبەری کردبان هەروەك چۆن ئەوان خۆیان لە ئێمە بێبەری کرد، بەڵێ ئەمەیە حاڵیان، خوا کردەوەکانیان پێ نیشان دەداتەوە تا داخ و خەفەتی پێ بخۆن، هەرگیز لە دۆزەخ ناچنە دەرەوە﴾البقرة :١٦٧.

لەم ڕۆژەدا بڕوادارانیش ئاخ هەڵدەکێشن لەبەر ئەوەی چاکەو باشەی پتریان ئەنجام نەداوە.

١٢- داپۆشەر(**الغاشية**) خوا دەفەرموێ:

﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ: باس و خواسی داپۆشەرت پێگەیشتوە؟﴾الغاشية:١

بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە ترس و داخ و خەفەت و ئەفسوسی ئەم ڕۆژە سەرجەم خەڵکی دادەپۆشێ، واتایەکی تری ئەوەیە کە بێبڕواکان لە هەمو لایەکەوە ئاگر دایاندەپۆشێ، لە لای سەریانەوە لە ژێر پێیانەوە، هەموی هەر ئاگرە. هەر وەکو خوا دەفەرموێ:﴿ يَوْمَ يَغْشَاهُمْ الْعَذَابُ مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾ العنكبوت:٥٥، ﴿لَهُمْ مِنْ جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِنْ فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ الأعراف:٤١.

١٣- ڕۆژی هەمیشەیی(**يوم الخلود**): خوا دەفەرموێ:

﴿ ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ: بە بڕواداران دەوترێ: بە ئارامیو بەبێ ئازار بفەرمون بۆ ناو بەهەشت. ئەم ڕۆژە ڕۆژی هەمیشەییە﴾ق:٣٤.

بۆیە بە ڕۆژی هەمیشەیی ناودێر کراوە چونکە ئیتر خەڵك لە هەواری

**هەمیشەییدا (دار الخلود) دەبن؛ بێبڕواکان لەناو ئاگری دۆزەخدا و بڕوادارانیش لەناو نازو بەهرەی بەهەشتدا هەمیشەیین. خوا دەفەرموێ:**

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **ئەوانەی بێبڕوابون و ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی ئەوانە یاوەری دۆزەخن و بەهەمیشەیی لەناویدا دەمێننەوە**﴾البقرة:٣٩.

﴿وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللَّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **بەڵام ئەوانەی ڕوخساریان سپی بوە؛ وەبەر میهری خوا کەوتون و بەهەمیشەیی لەناو بەهەشتدان.**﴾آل عمران:١٠٧.

**١٣- ڕۆژی لێپرسینەوە(یوم الحساب): خوا دەفەرموێ:**

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ: **ئەو کەسانەی لە ڕێی خوا گومڕا دەبن، لە ڕۆژی ژیانەوەدا سزاو ئەشکەنجەیەکی سەختیان بۆ هەیە، چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیر کردبو**﴾ص:٢٦..

﴿وَقَالَ مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ مِنْ كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لاَ يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ: **موسا گوتی: من خۆم بە پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوە پەنا دەگرم لە هەمو فیز بەرزێك کە بڕوای بەڕۆژی لێپرسینەوە نەبێ**﴾غافر:٢٧.

**بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە لەو ڕۆژەدا خوا لە بەندەکانی دەپرسێتەوە.**

**قورتوبی دەڵێ: ((لێپرسینەوە ئەوەیە کە خوا یەك بە یەك کردەوە چاك و خراپەکانی بەندەکانی هەڵدەژمێرێ، هەروەها هەمو بەخششەکانی خۆی بەسەردا دەژمێرێ ئەنجا بەرامبەریان پێ دەکات، ئەنجا تای کام جۆرە کردەوە قورستر بێ بەو جۆری دادگایی دەکات، ئەگەر چاکە بو بە چاکە، ئەگەر خراپە بە خراپە. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ما منکم أحد إلاّ وسیکلمه الله لیس بینه وبینه ترجمان: لەڕۆژی لێپرسینەوەدا خوا قسە لەگەڵ هەمو یەکێکتان دەکات بێئەوەی وەرگێڕ لەنێوانیاندا هەبێ)).**

**١٥- قەومانی گەورە(الواقعة): خوا دەفەرموێ:**

﴿إِذَا وَقَعَتْ الْوَاقِعَةُ: **ئەگەر قەومانی گەورە ڕویدا**﴾ الواقعة:١..

**ئیبنو کەثیر دەڵێ: ((بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە بونی ئەم ڕۆژە بە بێ گومان دێتە دی))[1]. وشەی (وقع) لە بنەڕەتدا بەمانای (وجد: هاتۆتە ئارا) دێت.**

**١٦- ڕۆژی هەڕەشە(یوم الوعید): خوا دەفەرموێ:**

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ: **فو لە کەڕەنا کرا، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەڕەشەیە**﴾ ق:٢٠.

**چونکە ڕۆژی ژینەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوا بەڵێنی بە وەدیهاتنی داوە. (الوعید) ڕاگەیاندنی ئەو سزاو تۆڵەیە دەگەیەنێ کە بە هۆی سەرپێچییەوە تەرخان دەکرێ.**

**١٧- ڕۆژی نزیك(یوم الآزفة): خوا دەفەرموێ:**

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الآزِفَةِ إِذْ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ: **لە ڕۆژی نزیك بیانترسێنە، کە لەبەر ترسەکەی دڵ دێتە ناو گەرو و خەم و پەژارە دایاندەگرێ**﴾المؤمن(غافر): ١٨.

**لەبەر نزیکی ئەم ناوەی پێوتراوە. هەروەکو خوا دەفەرموێ:**

﴿أَزِفَتْ الآزِفَةُ، لَيْسَ لَهَا مِنْ دُونِ اللَّهِ كاشفة: **ڕۆژی نزیك نزیك بووە، خوا نەبێ کەسی تر ئاشکرای ناکات.**﴾النجم:٥٧-٥٨.

**هەڵبەت ڕۆژی دوایی زۆر نزیکە، چونکە، شت هەرچەندی زۆریشی مابێ بەڵام مادەم رو بدا هەر نزیکە. بەتایبەتی دوای هاتنە ئارای نیشانەکان ئەو کات زۆر زۆر نزیکترە.**

---

[1] تفسیر ابن کثیر: (٥٠٧/٦).

١٨- ڕۆژی کۆبونەوە: خوا دەفەرموێ:

﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِتُنْذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنْذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لاَ رَيْبَ فِيهِ: بەم جۆرە قورئانێکی عەرەبیمان بە سروش بۆ ناردی تاوەکو خەڵکی مەککەو دەوروبەری پێ بێداربکەیەوە، تا خەڵك لە ڕۆژی کۆبونەوە بترسێ کە هیچ گومانێك لە هاتنیدا نیە﴾ الشورى:٧.

لەبەر ئەوە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە سەرجەم خەڵك لەم ڕۆژەدا کۆ دەبنەوە، هەروەکو خوا فەرمویەتی:

﴿ذَلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ : هەمو خەڵك بۆ ئەم ڕۆژە کۆدەبنەوە﴾ هود:١٠٣.

١٩- وەدیهاتە(الحاقة): خوا دەفەرموێ:

﴿الْحَاقَّةُ، مَا الْحَاقَّةُ: وەدیهاتە ! وەدیهاتە چیە ؟!﴾الحاقة:١-٢.

بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە لەو ڕۆژەدا بەڵێن و هەڕەشەکان وەدی دێن[1].

بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەڵێ: ((وەدیهاتەیە چونکە لەو ڕۆژەدا پاداشت و هەقیقەتی کرداران دەخرێنە ڕو. (الحقة) و (الحاقة)ش یەك واتایان هەیە)).

ئیبنوحەجەر لەڕاڤەی وتەکەی بوخاریدا دەڵێ: ((ئەم ڕاڤەیە لە وتەی (الفراء) وەرگرتوە. کە لە (معاني القرآن)دا دەڵێ: (الحاقة): ڕۆژی ژیانەوەیە، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە لەو ڕۆژەدا پاداشت و هەقیقەتی کرداران دەخرێنە ڕو. پاشان دەڵێ: (الحقة)و(الحاقة) هەردوکیان هەمان واتایان هەیە. طەبەری دەڵێ: ناوی نراوە وەدیهاتە چونکە هەقی تێیدا دێتە دی. وەکو ئەم وتەیە کە دەڵێ: لیلٌ قائم. هەندیکی تر دەڵێن: پێی وتراوە وەدیهاتە چونکە کەسانێك بەهەشتیان بۆ وەدی دێ‌و کەسانێکیش دۆزەخ. هەروەها وتراوە: بۆیە پێی وتراوە (الحاقة) چونکە ڕکەبەرایەتی بێبڕواکانی تێدا دەکرێ کە بێفەرمانی پێغەمبەرانیان کردوە، کە دەڵێن حاققته فحققته: واتە ڕکەبەرایەتیم لەگەڵدا کرد و بەزاندم. هەشە دەڵێ: لەبەر ئەوە پێی وتراوە (الحاقة) چونکە ڕۆژێکی هەقەو گومانی تێدا نیە))[2].

---

[1] تفسير ابن كثير: (٧/٩٩).

[2] فتح الباري (١١/٣٩٥).

**٢٠- ڕۆژی دیدەن(یوم التلاق): خوا دەفەرموێ:**

﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنْذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ: **خوا خاوەنی هەمو پلەیەکی بەرزە، خاوەنی بارەگایە، بۆ هەر بەندەیەك کە خۆی مەبەستی بێ بەرنامەو شەریعەتی بە سروش بۆ دەنێرێ تا لە ڕۆژی دیدەن بیانترسێنێ** ﴾المؤمن:١٥.

**ئیبنو کەثیر دەڵێ: ئیبنو عەباس دەڵێ: لەو ڕۆژەدا ئادەم و دواهەمین وەچەی بەدیداری یەکتر دەگەن. ئیبنو زەید دەڵێ: بەندەکان بەدیداری یەکتر دەگەن. قەتادەو سەدی و بیلالی کوڕی سەعد و سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێن: خەڵکانی ئەرزو ئاسمان بەدیداری یەکتر دەگەن، بەدیهێنەر و بەدیهێنراو بەیەکتر دەگەن.**

**مەیمونی کوڕی مەهران دەڵێ: ستەمکارو ستەمدیدە یەکتر دەبیننەوە. ڕەنگە هەندێك بڵێن ڕۆژی دیدەن هەمو ئەوانە دەگرێتەوە.هەروەها هەمو بکەرێکیش دەگرێتەوە کە دەگاتەوە دیداری کردەوە چاك و خراپەکانی، هەروەکو هەندێك وا دەڵێن)).**[١]

**٢١- ڕۆژی بانگ**

**خوای بەرزو بێهاوتا ئامۆژگاری بڕوادارەکەی خانەوادەی فیرعەون دەگێڕێتەوە کە بە هۆزەکەی گوتوە:**

﴿وَيَاقَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ: **نەتەوەکەم! من لەڕۆژی بانگ لێتان دەترسم.** ﴾المؤمن:٣٢.

**هەڵبەت لەبەر ئەو هەمو گاسکردن و بانگەی کە لەو ڕۆژە دایە ناونراوە ڕۆژی بانگ. بۆ لێپرسینەوەو پاداشت و سزا هەمو کەسێك بەناوی خۆی بانگ دەکرێت. بەهەشتیو دۆزەخیەکان بانگی یەکتر دەکەن، ئەعرافیەکان بانگی دۆزەخیو بەهەشتیەکان دەکەن.**

---

[١] تفسیر ابن کثیر (٦/١٣٠).

**٢٢- رۆژی زیانباری(یوم التغابن). خوا دەفەرموێ:**

﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَـــابُنِ: **خوا لە رۆژی کۆبونەوەدا کۆتان دەکاتەوە کە رۆژی زیانبار بونی بێبڕواکانە** ﴾ التغابن: ٩.

**بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە بەهەشتیەکان کە دەچنە بەهەشت بەشی بێبڕواکان هەڵدەقۆزنەوە کە بەمەش بێبڕواکان زیانبارو بەهەشتیەکانیش بەهرەمەند دەبن.**

**ئەو ناوانەی بەر لە ئێستا باسمان کردن ناسراوترین و بەناوبانگترین ناوەکانی رۆژی ژیانەوەن، هەندێ زانای تر ناوی دیکەشیان بۆ هەڵژماردوە. کە بە رێگەی داتاشین ناوەکانیان ناو لێناوە، بۆ وێنە بە پێی ئەم ئایەتەی دەفەرموێ:** ﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ﴾ الزلزلـة: ٦ **ناوی (یوم الصدر)یان داتاشیوە. هەروەها (یوم الجدال: رۆژی دەمەقاڵێ)یان لە ئایەتی**﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا﴾النحـل:١١١ **داتاشیوە. هەروەها هەندێ زانا بە پێی وەسفەکانەوە ناوەکانیان ناودێر کردوە بۆ وێنە : (یوم عسیر: رۆژی دژوار)، (یوم عظیم: رۆژی مەزن)، (یوم عبوس قمطریر: رۆژی روگرژو سەخت)، (یوم عقیم: رۆژی نەزۆك).**

**جگە لەم ناوانەی رابورد، ناوی تریشیان باس کردوە، بۆ وێنە وەکو:**

**یوم المآب: رۆژی ژیوانگە.**

**یوم العرض: رۆژی رانواندن.**

**یوم الخافضة الرافعة: رۆژی بەرزو نزمکەرەوە.**

**یوم القصاص: رۆژی تۆڵە.**

**یوم الجزاء: رۆژی سزاو پاداشت.**

**یوم النفخة: رۆژی فو.**

**یوم الزلزلة: رۆژی بومەلەرزە.**

**یوم الراجفة: رۆژی لەرزە.**

**یوم الناقور: رۆژی کەرەنا.**

يوم التفرق: ڕۆژی دابڕ دابڕبون.

يوم الصدع: ڕۆژی شەقبون.

يوم البعثرة: ڕۆژی یەکالآبون.

يوم الندامة: ڕۆژی پەشیمانی.

يوم الفرار: ڕۆژی هەلاّتن.

هەندێ ناوی تریش وەکو:

يوم تبلى السرائر: ڕۆژی ئاشکرابونی ڕازو نهێنی.

يوم لا تملك نفس لنفس شيئاً: ڕۆژی کەس هیچ بەدەس نەبون بۆ هیچ کەس.

يوم يدّعون الى نار جهنم دعاً: ڕۆژی پاڵەستۆدان بۆ دۆزەخ.

يوم تشخص فيه الأبصار: ڕۆژی ئەبڵەقبونی چاو.

يوم لاينفع الظالمين معذرتهم: ڕۆژی بێهودەبونی عوزر هێنانەوەی ستەمکاران.

يوم لاينطقون: ڕۆژی قسە نەکردن.

يوم لاينفع مال ولا بنون: ڕۆژی بێهودەبونی دارایی‌و منداڵ.

يوم لا يكتمون من الله حديثاً: ڕۆژی نەشاردنەوەی هیچ وتەیەك لە خوا.

يوم لامردّ له من الله: ڕۆژی بێ لەمپەر لە هاتنیدا.

يوم لابيع فيه ولا خلال: ڕۆژی نەکڕین و نەفرۆشتن و نەبونی دۆستایەتی.

يوم لاريب فيه: ڕۆژی بێگومان.

زانای تر هەن ڕەنگە ناوی تریشیان بۆ دانابێ، ڕەنگە ناوی وایان بۆ دانابێ گوزارشت لەو ڕۆژە بکات. قورتوبی دەڵێ: "بەربەستی نیە ئەگەر بە گوێرەی چیەتی‌و چۆنیەتی‌و ڕەوشی ئەو ڕۆژە ناوی تری لێ بنرێ وەکو ڕۆژی ئاپۆرە بەستن(ازدحام) و تەنگەبەری‌و پلەوپایە جیاوازی‌و زەبونی‌و ڕیسوایی‌و بێنرخی‌و پێویستی و بێدەسەلاّتی‌و داشکان و بەڵێن و ڕوانگەو زۆر ناوی‌تر)).[1]

---

[1] التذكرة: ٢٣٣.

## نهێنی فرەیی ناوەکانی

قورتوبــی دەڵــێ[1]: ((هــەمو شــتێك ئەگــەر بایــەخ و گرنگیەکــەی فــرە بــو و ئاکــارو ئەدگاری زۆر بو، ئەوا ناویشــی زۆر دەبێ، ئەمــەش بــاوی زمــانی عارەبانــە. ئــەوە نیــە شمشێرو شتی تریش کە مایەی سودو کەڵکێکی زۆر بوە بۆیان نزیکــەی پێنج ســەد ناویان بۆ هەڵناوە. ژیانەوەش کــە ڕوداوی مــەزن و کارەســاتێکی زۆری تێدایــە، بۆیــە خوای گەورە بە جۆرەها ناو و سیفەت هەڵیداوە)).

---

[1] التذکرة: ٢١٤.

# بەندی دووەم

# لەناوچونی بونەوەر

## جێباسی یەکەم

### فوی کەڕەنا

ئەم گەردونە سەیرو پان و پۆڕەی کە ئێمە تێیدا دەژین بە هەزاران هەزار ژینەوەری بینراو و نەبینراوی تێدایە، بەردەوام جمەیان دێت و لە جوڵەدان و بۆ چاوترووکانێکیش وەستانیان نیەو ناسرەون، شیرازەو رەوشی ئەم گەردونە هەر وەکو خۆی دەمینێتەوە تا ئەو رۆژەی خوای باڵادەست وێرانی دەکات و سەرجەم بونەوەران لەناو دەبات، تەنها ئەوانە نەبن کە خوا نایانمرێنێ:
﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ﴾الرحمن: ٢٦، ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ﴾ القصص:٨٨.

کە ئەو رۆژە دادێت وکەڕەنا فو دەکرێ ئیتر ژیان لە ئەرزو ئاسمان دەبڕێتەوەو کۆتایی دێت :

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ: کە کەڕەنا فوی پێدا کرا ئەوا هەرچی لە ئەرزو ئاسمانەکاندایە دەستبەجێ دەمرن، تەنها ئەوانە نەبن کە خوا نایەوێ بمرن ﴾ الزمر: ٦٨.

ئەم فوە بریتیە لە زایەڵەیەکی ئێجگار توندوتیژو وێرانکەر کاتێك کە مەردوم گوێی لێدەبێ دەسەوسان دەبێ و ئەژنۆی دەشکێ تەنانەت ناتوانێ ئامۆژگاریەکیش بوێژێو نایپەرژێ بگەڕێتەوە لای خانەوادەو هاوڕێیانی:

﴿مَا يَنظُرُونَ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ، فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَـةً وَلاَ إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ: **ئەم بێبڕوایانە بڕوا ناهێنن، دیارە چاوەڕێی تاقە زیرەیەك**[1] **دەكەن كە فوی یەكەمە، لەو كاتە دوچاریان دەبێ كە خەریكی ئاڵوویرن. جا كە توشیان بو، تەنانەت ناتوانن ئامۆژگاریەكیش دابدەن یاخۆ ناتوانن بگەڕێنەوە لای خانەوادەكەشیان چونكە هەر دەستبەجێ دەمرن.**﴾ یس:٤٩-٥٠.

**لە فەرمودەش هاتوە كە فەرمویەتی:**

((ثم ينفخ في الصور، فلا يسمعه أحد إلاّ أصغى ليتا، ورفع ليتا، قال: وأول من يسمعه رجل يلوط حوض إبله. قال: فيصعق ويصعق الناس: **پاشان كەڕەنا فو دەكرێ، هەركەسێك گوێی لێبێ پەڕەی ملی لاردەبێتەوەو قیتی دەكاتەوە، یەكەمین كەس كە گوێی لە قیژەو زیرەكە دەبێ پیاوێكە حەوزی وشترەكەی سواق دەدات، ئەو دەمرێو پاشانیش خەڵك بەدوای ئەودا دەمرن**))[2].

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوەشی كردوە كە خەڵك لەو ڕۆژەدا زۆر بەخێرایی دەمرن:**

((ولتقومنّ الساعة وقد نشر الرجلان ثوبهما بينهما، فلا يتبايعانه ولا يطويانه، ولتقومنّ الساعة وقد انصرف الرجل بلبن لقحته فلا يطعمه، ولتقومنّ الساعة وهو يليط حوضه، فلا يسقي فيه، ولتقومن الساعة وقد رفع أكلته الى فيه فلا يطعمها: **كە ڕۆژی دوایی دادێت پیاو هەیە لولەی كوتاڵەكەیان هەڵوەشاندۆتەوە بیفرۆشێ بەڵام ناپەرژێ نە بیفرۆشێ و نە هەڵی بكاتەوە. كە قیامەت هەڵدەستێ پیاوی وا هەیە شیری وشترەكەی دۆشیوەو ناتوانێ تامی بكات، چونكە یەكسەر دەمرێ. پیاوی واش هەیە حەوزەكەی سواق دەدات كەچی ناتوانێ خۆیو ماڵاتەكەی لێ ئاو بدات. پیاوی وا هەیە خواردنەكەی بۆ دەمی دەبات بەڵام ناتوانێ بیخوات و دەمرێ**))[3].

---

[1] زیرە: قیژاندنێكی بەهێز، لێرەدا بەواتای (صيحة) بەكارهاتوە

[2] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب خروج الدجال: (٤/٢٢٥٩) ورقمه: ٢٩٤٠.

[3] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب... تصدقوا، فتح الباري: (١٣/٨٢) عن ابي هريرة. ورواه في كتاب الرقاق، فتح الباري(١١/٣٥٢).

# جێباسی دووەم

## کەڕەنای فو

صور لە زمانی عارەباندا واتە قۆچ. لەبارەی صورەوە لە پێغەمبەرﷺیان پرسیوە، ئەویش بەو واتایە وەڵامی داونەوە کە عارەبەکان لە زمان و قسەدا ناسیویانە. لە سونەنی تیرمذی و ئەبوداود و ئیبنوحیببان وموسنەدی ئەحمەدو موستەدرەکی حاکمدایە کە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص گێڕاویەتیەوەو دەڵێ: خێڵەکیەك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی: صور چیە؟ ئەویش فەرموی: ((الصور: قرن ينفخ فيه: صور: قۆچێکە فوی پێدا دەکرێ)).[1]

هەندێك دەڵێن: گوایە حەسەنی بەسرایی صوری بە (صوَر: شێوەکان) خوێندۆتەوە کە کۆی (صورة: شێوە)یەو بەو جۆرە راڤەی کردوە کە فوی کەڕەنا بریتیە لە فوکردن بە جەستەکاندا تا گیانیان بەبەردا بێتەوە.

هەروەها لە ئەبو عوبەیدەو ئەلکەلەبی گێڕدراوەتەوە کە وتویانە: صور کۆی (صورة: شێوە)یە هەروەکو چۆن (سور المدينة: شورەی شار) کۆی (سورة: شورە)یە و (صوف: خوری) کۆیە بۆ (صوفة: خوری)، (بُسْر)یش کۆی (بُسرة)یە. هەندێکی تر وتویانە: مەبەست لە فوی کەڕەنا فوکردنە بە جەستەکان تا گیانیان بەبەردا بێتەوە.

هەڵبەت ئەوەی وتویانە لە چەندین ڕووەوە هەڵەیەو راستی نەپێکاوە:

---

[1] قال الحاكم: صحيح الأسناد ووافقه الذهبي وقال الترمذي فيه: حديث حسن صحيح. سلسلة الأحـــاديث الصحيحة (٣/٦٨). رقم ١٠٨٠.

**یەکەم:** ئەو خوێندنەوەیە بە ناوی حەسەنی بەسرایی ڕاگەیانراوە؛ نەزانراوە یەکێك بە صەحیحی لەو پێشەوایانەی خوێندنەوەیان لێ وەردەگیرێ بە هەمان جۆری خوێندبێتەوە.

**دووەم:** کۆی (صورة)، (صُوَر)ـە، نەك (صوْر) کەواتە ئەوەی ئەبو عوبەیدەو ئەلکەلەبی دەیڵێن وانیە. خوا دەفەرموێ:

﴿وَصَوَّرَكم فأحسن صُوَرَكُمْ: بە باشترین شێوە شێوەرێژی کردون.﴾ غافر:٦٤.
هیچ خوێنەرێکیش نەبوە وا بخوێنتەوە و بڵێ ﴿فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾.

**سێیەم:** ئەو وشانەی بە پێودانگ[1] دەیهێننەوە (کۆ) نین بەڵکو ناون بۆ (کۆ)، بە تێی خڕ(ة) تاك و کۆیان جیا دەکرێتەوە.

**چوارەم:** ئەم وتەیە لەگەڵ وتەی یارانی ڕێبازو کۆمەڵ(سنة والجماعة) ناکۆك و پێچەوانەیە. چونکە یارانی ڕێبازو کۆمەڵ پێیان وایە (صور) شەیپورێکە[2] فوی پێدا دەکرێ.

**پێنجەم:** ئەم وتەیە لەگەڵ وەڵامەکەی پێغەمبەر ﷺ جیاوازو ناکۆکە کە کەڕەنای بەشەیپور ڕاڤە کردوە هەروەها لەگەڵ زۆر فەرمودەیتر ناکۆکە کە لە بارەی (صور) دواوە.

**شەشەم:** خوا دەفەرموێ:

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ: کە کەڕەنا فو کرا ئەوا هەرچی لە ئەرزو ئاسمانەکاندا هەیە دەستبەجێ دەمرن تەنها ئەوانە نەبن کە خوا نایەوێ بمرن، پاشان فوێکی‌تری پێدا دەکرێ ئەمجارە دەستبەجێ سەرجەمیان هەڵدەستنەوە و

---

[1] پیودانگ: قیاس

[2] شەیپور: کەرەنا، القرن

**چاوەڕێی فەرمان دەبن** ﴾ الزّمر: ٦٨.

**لێرەدا خوای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێ کە دو جاران فو بە کەڕەنادا دەکرێ، جا ئەگەر مەبەست لە (صور) فوکردن بە (صُوَر: شێوەکان، کە بریتیە لە جەستەکان) بوایە، ئەوا بوترێ:** ﴿ثم نفخ فيه أخرى: **پاشان فوێکی تری پێدا کرا** ﴾ الزّمـــــر: ٦٨، **چونکە لە ژیانەوەدا جەستەکان تەنها یەك جار گیانیان بەبەردا دەکرێتەوە.**[1]

**هەندێ زانا دەڵێن کەڕەنا لە مرواری یان لە ڕوناکی دروست کراوە، بەڵام نەمانزانیوە هیچ فەرمودەیەکی صەحیح لەم بارەوە هەبێ. خوای گەورەش زاناترە.**

---

[1] بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: تذكرة القرطبي: ١٨٢، ١٨٥. فتح الباري (١١/٣٦٧). لسان العرب (٢/٤٩٣).

# جێباسی سێیەم

## فوکەری کەڕەنا

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: ((وا ناسراو و بەربڵاوە کە فوکەری کەڕەنا ئیسرافیلی فریشتەیە ، ئەلحولەیمی لەم بارەیەوە کۆدەنگی زانایانی ڕاگەیاندوە. لە فەرمودەکەی وەهبی کوڕی مونەببەھ و فەرمودەکەی ئەبو سەعید لەلای بەیهەقی‌و فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە لەلای ئیبنو مەردەویێ هەروەها لە فەرمودە درێژەکەی کەڕەنادا ناوی ئیسرافیل هاتوە)).[1]

پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە فریشتەی شەیپورەوان هەر لەوەتەی خوا بەدیی‌هێناوە هەمیشە ئامادەیەو چاوەڕێی فەرمانی فوە. لە موستەدرەکی حاکمدا لە ئەبو هورەیرە  دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((إنَّ طرف صاحب الصور منذ وُكِل به مستعد ينظر نحو العرش، مخافة أن يؤمر قبل أن يرتد إليه طَرْفه، كأن عينيه كوكبان دُرِّيان: شەیپورەوان لەوەتەی خوا ئەرکی فوکردنی پێ ڕاسپاردوە پێڵوی چاوەکانی زەق کردۆتەوەو تەماشای بارەگا دەکات، هەردەم چاوەڕێی فەرمانی فوە، چاوی نانوقێنێ نەبادا بەر لەوەی چاوەکانی بتروکێنێ فەرمانەکەی پێبکرێ، چاوەکانی دەڵێی هەسارەی پڕشنگدارن)).[2]

لەم ڕۆژگارەدا کە ڕۆژی دوایی نزیکتر بۆتەوە ئیسرافیلی شەیپورەوان پتر سازو ئامادەیە بۆ فوکردن، ئیبنولموبارەك لە (الزهد) و ترمزی لە سوننەکەی‌و ئەبو نوعەیم

---

[1] فتح الباري (١١/٣٦٨).

[2] قال الحاكم صحيح الأسناد و وافقه الذهبي. سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣/٦٥)، ژمارە: (١٠٧٨).

**لە حلیەکەی‌و ئەبو یەعلا لە موسنەدەکەی‌و ئیبنوحیببان لە صەحیحەکەی‌و حاکم لە موستەدرەکەکەی، هەموویان لە ئەبو سەعیدی خودری دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((كيف أنعم، وقد التقم صاحب القرن القرن، وحنى جبهته، وأصغى سمعه، ينتظر أن يؤمر أن ينفخ، فينفخ. قال المسلمون: فكيف نقول يا رسول الله؟ قال: قولوا: حسبنا الله ونعم الوكيل، توكلنا على الله ربنا: **من چۆن خۆشی بکەم و خۆش ڕابوێرم، لە کاتێکدا ئیسرافیلی خاوەن کەڕەنا، کەڕەناکەی لە دەم ناوەو نێوچەوانی بەسەردا شۆڕکردۆتەوەو گوێی هەڵخستوەو چاوەڕوانە، کە هەردەمێك فەرمانی پێ‌بکرێ دەستبەجێ فوی پێدا بکاو کۆتایی بە جیهان بێنێ؟! موسڵمانەکانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەدی ئێمە چ بکەین؟ فەرموی: بڵێن: حسبنا الله ونعم الوكيل، توكلنا على الله ربنا)).**[1]

[1] قال الترمذي: حديث حسن، شێخ ناصري ئەلبانی هەمو بێژەرەوە یاوەرەکان و ڕێگاکان و موتابەعات و شەواهیدەکانی لە سلسلة الأحاديث الصحيحة (٦٦/٣) ژمارە (١٠٧٩) هێناوەتەوە کە بەڵگەیە بۆ صەحیحێتی فەرمودەکە.

## جێباسی چوارەم

## ڕۆژی فوکردن

**ڕۆژی دوایی لە هەینیدا بەرپا دەبێ. لە صەحیحی موسلیمدایە کە ئەبو هورەیرە‌ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((خير يوم طلعت عليه الشمس يوم الجمعة، فيه خلق آدم، وفيه أدخل الجنة، وفيه أخرج منها، ولا تقوم الساعة إلاَّ يوم الجمعة: **باشترین ڕۆژ هەتاوی لێ هەڵبێ ڕۆژی هەینیە، لەو ڕۆژەدا ئادەم بەدیهێنراوەو لەو ڕۆژەدا خراوەتە بەهەشت و لەو ڕۆژەدا دەرکراوە، ڕۆژی دواییش هەر لەو ڕۆژەدا بەرپا دەبێ))** [1].

**لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺ ڕادەگەیەنێ کە لە ڕۆژی هەینیدا ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێو هەر لە هەینیدا سەرجەم بەندەکان دەمرن، ئەوسی کوڕی ئەوسﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((إنَّ من أفضل أيامكم يوم الجمعة، فيه خلق آدم، وفيه قبض، وفيه النفخة، وفيه الصعقة، فأكثروا عليَّ من الصلاة فيه، فإنَّ صلاتكم معروضة عليَّ: **یەك لە باشترین ڕۆژەکانتان هەینیە، لەو ڕۆژەدا ئادەم بەدیهێنراوە و لەو ڕۆژەدا مردوە و لەو ڕۆژەدا کەڕەنا فو دەکرێ و لەو ڕۆژەشدا مەرگی سەرجەمی دێتە ئارا، بۆیە لەو ڕۆژەدا درودی زۆرم پێشکەش بکەن، درودەکانتانم بۆ ڕادەنوێنرێ))** [2].

---

[1] مشكاة المصابيح: (١/٤٢٧)، ژمارە: (١٣٥٦).

[2] ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو ماجە و دارمي و بەیهەقیش لە (الدعوات الكبير) گێڕاویانەتەوە: مشكاة المصابيح: (١/٤٣٠) ژمارە (١٣٦١) لێکۆڵەری مشکاە لە بارەی ئیسنادەکەی ئەبو داود دەڵێ: صحيح و صححه جماعة.

هـەروەها لـە موسـنـەدی ئەوسـەطی طەبـەرانیو حلیـەی ئـەبو نوعـەیم دایـە کـە ئەنەسی کوڕی مالیك‌ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((عرضت عليّ الأيام، فعرض عليّ فيها يوم الجمعة، فإذا هي كمرآة بيضاء في وسطها نكتة سوداء، فقلت: ما هذه؟ قيل: الساعة: ڕۆژەکانم بۆ ڕانوێران، لەنێویاندا ڕۆژی هـەینیم بۆ ڕانوێنرا، وەکو ئاوێنەیەکی ساف و سپی وابو بەڵام لـە ناوەندەکەیدا پنتێکی ڕەش هەبو. گوتم: ئەوە چیە؟ گوتیان: ڕۆژی دواییە)).[1]

جا لەبەرئەوەی ڕۆژی دوایی لە هەینیدا بەرپا دەبێ بۆیە گشت بەدیهێنراوان کە ڕۆژی هەینیان بەسەر دادێ سام دەیانگرێ و دەترسن تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبن. لـە (موطـأ)ی پێشـەوا مـالیك و سـونەنی ئـەبوداود و سـونەنی تـیرمذیو نەسـائیو موسـنەدەکەی پێشـەوا ئەحمـەد دایـە کـە ئـەبو هورەیـرە‌ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ دەفەرموێ:

((خير يوم طلعت فيه الشمس يوم الجمعة، فيه خلق آدم، وفيه هبط، وفيه تيب عليه، وفيه مات، وفيه تقوم الساعة، وما من دابة إلاَّ وهي مصيخة، يوم الجمعة من حين تصبح حتى تطلع الشمس، شفقاً من الساعة، إلاَّ الجن والإنس: باشترین ڕۆژ کە خۆری تێدا هـەڵاتبی ڕۆژی هەینیـە، لـەو ڕۆژەدا ئـادەم بەدیـهێنراوەو بـۆ سـەر زەوی دابـەزیوەو تەوبـەی لێوەرگیراوەو مردوە، لەو ڕۆژەدا ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێ، هەمو بەدیهێنراوێك لەگەڵ گەردی بەیانی هەینیدا چاوەڕێیەو لە ترسی بەرپابونی ڕۆژی دوایـی تا ڕۆژ هـەڵدێ ترس دەیگرێ تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێ)).[2]

---

[1] شیخ ناصر لە (٤/٣١) ژمارە (٣٨٩٥) صحیح الجـامع دا هێمای صەحیحێتی بۆ داناوە، لە سلسـلة الأحاديث الصحيحة (٤/٥٦٨) ژمارە (١٩٣٠)دا هەمو ڕێگاکانی هێناوەتەوە.

[2] مشکاة المصابیح: (١/٤٢٨) ژمارە (١٣٩٥) لێکۆڵەری مشکاة بۆ (موطأ) و ترمذیشـی گەڕاندۆتەوە ترمذی دەڵێ: حسن صحیح.

## جێباسی پێنجەم

# ژمارەی فووەکان

ئەوەی ئاشکرایە؛ دوجاران کەڕەنا فو دەکرێ، لە جاری یەکەمدا مەرگی سەرتاسەری دێتە ئارا، لە جاری دوەمدا زندوبونەوە ڕودەدات.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ: که کەڕەنا فو کرا ئەوا هەرچی لە ئەرزو ئاسمانەکاندا هەیە دەستبەجێ دەمرن تەنها ئەوانە نەبن کە خوا نایەوێ بمرن، پاشان فوێکی تری پێدا دەکرێ ئەمجارە دەستبەجێ سەرجەمیان هەڵدەستنەوە و چاوەڕێی فەرمان دەبن.﴾ الزمر: ٦٨.

قورئانی پیرۆز فوی یەکەمی بە (الراجفة: هەژێنەر) و فوی دوەمیشی بە (الرادفة: پاشینە) ناو بردوە خوا دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ، تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ﴾النازعات: ٦-٧.

لە جێگەیەکی تردا بە فوی یەکەمی فەرموە (الصیحة: زیڕە) و ناوی فوی دوەمیشی وەکو خۆی هێناوە، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿مَا يَنظُرُونَ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ، فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلاَ إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ، وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُمْ مِنَ الأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ: وا دیارە ئەم بێبڕوایانە بڕوا ناهێنن و چاوەڕێی تاقە زیڕەیەك دەکەن کە فوی یەکەمە، ئەو کاتەی کە دوچاریان دەبێ خەریکی مشتومڕن. جا کە توشیان بو تەنانەت ناتوانن ڕاسپاردەیەکیش ڕاگەیەنن یا خۆ ناتوانن بگەڕێنەوە لای خانەوادەکەشیان چونکە دەسبەجێ دەمرن. کە فوی دوەمیش کرا ئیتر دەسبەجێ لە گۆڕەکانیان زندو دەبنەوەو بە تاو بۆ لای پەروەردگاریان هوروژم دەکەن.﴾یس: ٤٩-٥١

**لە فەرمودەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ تەنها باسی دو فو کراوە. لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:** ((ما بين النفختين أربعون: **نێوانی هەردو فو چل وەختە)) گوتیان: چل مانگ؟ گوتی: نەخێر نازانم، گوتیان: چل ساڵ؟ گوتی: نەخێر نازانم))**.[1]

**هەروەها لە صەحیحی موسلیمدا عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەرﷺ بوە فەرمویەتی:**

((ثم ينفخ في الصور، فلايسمعه أحد إلاّ أصغى ليتا، ورفع ليتا، فأول من يسمعه رجل يلوط حوض إبله، قال: فيصعق، فيصعق الناس، ثم يرسل الله – أو قال: ينزل الله مطراً، كأنه الطلُّ، أو كالظلُّ،[2] فتنبت منه أجساد الناس، ثم ينفخ فيه أخرى فإذا هم قيام ينظرون: **یەکەمین کەس کە گوێی لێدەبێ پیاوێکە حەوزی وشترەکەی سواق دەدات، ئەو پیاوە دەستبەجێ دەمرێ، پاشان لەدوای ویدا خەڵکیش دەمرن، پاشان خوای گەورە نەرمە بارانێك دەبارێنێ جەستەکانی خەڵکی پێ شین دەبێتەوە، پاشان فوێکیتر دەکرێ هەمو خەڵك قیت دەبنەوەو چاوەڕێی فەرمانی خوا دەکەن))**.[3]

**بەیهەقیش بە سەنەدێکی قەویو بە مەوقوفی لە ئیبنو مەسعودی گێڕاوەتەوە کە دەڵێ: ((پاشان فریشتەی شەیپورەوان (خاوەن کەڕەنا) لە نێوانی ئەرزو ئاسماندا هەڵدەستێ و کەڕەناکە فو دەکات. کەڕەناش قۆچێکە، لەگەڵ ئەم فوەدا هەر بەدیهێنراوێك لە ئەرزو ئاسمانەکاندا هەبێ دەمرێ تەنها ئەوانە نەبن کە خوا نایەوێ بمرن پاشان لە نێوان لە هەردو فوەکەدا خوا دەزانێ چەند ماوە هەیە))**[4].

**هەروەها ئەوسی کوڕی ئەوسی ثەقەفی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:** ((إنَّ أفضل أيّامكم يوم الجمعة فيه الصعقة وفيه النفخة: **باشترین ڕۆژتان ڕۆژی هەینیە لەو ڕۆژەدا مەرگی سەرتاسەری بەرپا دەبێ و هەروەها لەو ڕۆژەشدا فوی**

---

[1] بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویە: کتاب التفسیر، تفسیر سورە الزمر، فتح الباري (١١/٥٥١) هەروەها موسلیمش لە صەحیحەکەیدا گێڕاویە (٤/٢٢٧٠) ژمارە (٢٩٥٥).

[2] ئێرەدا نوعمانی کوڕی سالم کە یەکێکە لە راویەکانی ئەم فەرمودەیە گومانی بردوە (ظل) یێ یان (طل).

[3] موسلیم گێڕاویە: (٤/٢٢٥٨)، ژمارە (٢٩٤٠).

[4] فتح الباري: (١١/٣٧٠).

دوەم ئەنجام دەدریٚ)) [1].

لەم ئایەت و فەرمودانەی هیٚنامانەوە وا دەفامریٚتەوە کە دو فو بە کەڕەنادا دەکریٚ، هەڵبەت کۆمەڵە زانایەکیش پەسەندی ئەم بۆچونە دەکەن، قورتوبی [2] و ئیبنو حەجەری عەسقەلانی [3] لەوانن.

بەلاَم کۆمەڵە زانایەکی تر پیٚیان وایە سیٚ فو دەکریٚ: فوی ترس، فوی مردنیٚ، فوی زندوبونەوە. ئەم کۆمەڵە زانایەش لەگەڵ ئەو بۆچونەدان: ئیبنولعەرەبی [4] ئیبنو تەیمیە [5] ئیبنو کەثیر [6] سەفارینی [7]. بەڵگەی یارانی ئەم بۆچونە کە دەڵیٚن فوی ترس هەیە، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرمویٚ:

﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ: لە ڕۆژی دواییدا کە کەڕەنا فو دەکریٚ ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە دەترسیٚ تەنها ئەوانە نەبن کەخوا نایەویٚ بترسن.﴾ النمل:(٨٧).

هەروەها بەڵگەیان بە هەندیٚ فەرمودەی تریش هیٚناوەتەوە کە باس لە سیٚ فو دەکات، بۆ نمونە: فەرمودە دریٚژەکەی کەڕەنا کە طەبەری تەخریجی کردوەو تیٚیدا هاتوە کە دەفەرمویٚ: ((ثم ينفخ في الصور ثلاث نفخات، نفخة الفزع ونفخة الصعق ونفخة القيام لرب العالمين: پاشان سیٚجاران کەڕەنا فو دەکریٚ: فوی ترس، فوی مردنیٚ، فوی زندوبونەوە و هەستانەوە بۆ لای پەروەردگاری جیهانیان)) [8].

بەلاَم ئەم ئایەتەی کە بە بەڵگەی دیٚننەوە بە ڕاشکاوی ئەوە ناگەیەنیٚ سیٚ فو بیٚ و کە خوای گەورە باسی ترسانی خەڵکانی ئەرزو ئاسمانان دەکات ئەوە

---

[1] فتح الباري: (١١/٣٧٠).أخرجه أبو داود والنسائي وأحمد وصححه ابن خزيمة وابن حبان والحاكم.

[2] التذكرة: ١٨٣،١٨٤.

[3] فتح الباري: (١١/٣٦٩).

[4] فتاوى شيخ الإسلام: (٤/٣٦٠).

[5] فتح الباري (١١/٣٦٩)، تذكرة القرطبي: ص ١٨٤.

[6] النهاية لإبن كثير: (١/٢٥٣).

[7] لوامع الأنوار البهية: (٢/١٦١).

[8] فتح الباري: (١١/٣٦٩).

ناگەیەنیٚ فویٚکی ترسیٚنەری سەربەخۆ هەبیٚ. چونکە هەر فوی یەکەمە کە بەر لە مەرگی سەرتاسەری خەڵکەکە دەترسیٚنیٚ، هەروەها فوی دوەمیش لە زندوبونەوەکەدا خەڵك دەترسیٚنیٚ.

ئیبنو حەجەر (بەر میهری خوا بیٚ) دەڵیٚ: ئەوە ناگەیەنیٚ کە مەرگ و ترسەکە لەیەك جودا بن. دەکریٚ هەردوکیان لە فوی یەکەمدا رو بدەن. لە تەذکیرەی قورتوبیدا هاتوە دەڵیٚ: فوی ترسیٚ هەمان فویمردنیٚیە. چونکە ترس و مردن بە یەکەوە رودەدەن واتە ترسیٚکی وا دەیانگریٚ پیٚی بمرن.[2]

فەرمودە دریٚژەکەی کەرەناش هەروەکو ئیبنو حەجەری زانای فەرمودەناسی دەڵیٚ: فەرمودەیەکی زەعیف و (مضطرب)ـە، تەزعیفەکەشی لە بەیهەقی نەقل کردوە.[3]

ئیبنو حەزم (بەر میهری خوا بیٚ) دەڵیٚ: (فوەکانی رۆژی دوایی چوارن: یەکەمیان: فوی مراندنە، دوەمیان: فوی ژیاندنەوەیە کە هەمو مردویٚکی لە گۆرِدا پیٚهەڵدەستیٚتەوەو بۆ لیٚپرسینەوە کۆ دەکریٚنەوە، سیٚیەمیان: فوی ترس و بورانەوەیە کە خەڵکی پیٚ لە هۆش خۆ دەچیٚو کەسی پیٚ نامریٚ. چوارەمیان: فوی واگا بونەوەیە لە بورانەوە)[4].

ئیبنوحەجەر دوای ئەوەی وتەکەی ئیبنوحەزم دیٚنیٚتەوە دەڵیٚ: (ئەوەی ئیبنوحەزم دەڵیٚ رون و ئاشکرا نیە، چونکە فوەکان هەر دو فون، جیاوازی هەر فویٚك بە گویٚرەی ئەوانەیە کە گویٚبیستی دەبن: لە فوی یەکەمدا هەرچی زندوە دەمریٚ و ئەوانەش کە خوا هەڵیواردون و مەبەستی نیە بمرن دەبوریٚنەوە، لە فوی دوەمیشدا هەرچی مردوە زندو دەبیٚتەوە، ئەوانەش کە بوراونەتەوە بەهۆش خۆیان دیٚنەوە. خوای گەورەش زاناترە)[5].

---

[1] فتح الباري: (٣٦٩/١١).
[2] تذكرة القرطبي: (١٨٤).
[3] فتح الباري: (٣٦٩/١١).
[4] فتح الباري: (٤٤٦/٦).
[5] فتح الباري: (٤٤٦/٦).

# جێباسی شەشەم

## ئەوانەی لەگەڵ خودا نامرن

خوای بەدیهێنەر پێی ڕاگەیاندوین کە هەندێك بەدیهێنراو لە ئەرزو ئاسمانەکاندا هەن لەگەڵ فوی مەرگی سەرتاسەریدا نامرن:

﴿ونفخ في الصُّور فصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ﴾[الزمر:٦٨]

زانایان لە دیارکردنی ئەو کەسانەی کە خوا هەڵیواردون ﴿إِلاَّ مَنْ شَـاءَ اللَّـهُ﴾ بۆچونیان جیاوازە:

١) ئیبنو حەزم پێی وایە تەواوی فریشتەکانن، چونکە بە بیروباوەڕی ئەو: فریشتە گیانێکن گیانیان لەبەردا نیە، بۆیە هەرگیز نامرن.

ئیبنو حەزم کە پێی وایە فریشتەکان نامرن پەسەند ناکرێت، چونکە فریشتەش بەدیهێنراوێکی خوایە بەندایەتی بۆ خوا دەکەن و لە ژێر دەسەڵات و ویستی خوا دەرناچن. مادەم خواش بەدیهێناون دەشتوانێ بیانمرێنێ و زندویان بکاتەوە

فەرمودەی صەحیح هەیە کە لە چەندین لا و لە چەندین یاوەرانەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((إنّ الله اذا تكلم بالوحي أخذ الملائكة منه مثـل الغشـي: ئەگەر خوا بە سروش قسە بفەرموێ فریشتەکان توشی حاڵەتێکی وەکو بورانەوە دەبن)).

لە بێژانەوەیەکی تردا دەفەرموێ:

((اذا سمعت الملائكة كلامه صعقـوا: ئەگەر فریشتەکان گوێ بیستی وتەی خوا بن دەبورێنەوە)).

لەم فەرمودەیەدا دەفەرموێ دەبورێنەوە، جا ئەگەر بورانەوەیان بۆ هەبێ.

---

فتح الباري: (٦/ ٣٧١).

مردنیشیان بۆ هەیە.

٢) موقاتیل و هیتریش پێیان وایە: جوبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل و فریشتەی مەرگەوانن[1] هەندێ زانای تر فریشتەکانی بارەگا هەڵگریشیان سەربارکردوە.[2] ئەم وتانەیان بە گوێرەی چەند فەرمودەیەك وتوە كە خۆیان گێڕاویانەتەوە. بەڵام زانایانی فەرمودەناس ئەم جۆرە فەرمودانە بە صحیح دانانێن.[4]

٣) پێشەوا ئەحمەد (بەر میهری خوا بێ) پێی وایە پەری و منداڵەکانی ناو بەهەشت دەگرێتەوە. ئەبو ئیسحاقی شاقیلەی حەنبەلیو ضەحاکی کوڕی مەزاحیم. بەهەشتەوان و ئاگرەوان و مارو دوپشکەکانی ناو دۆزەخیشیان سەربار کردوە.[5]

ئیبنو تەیمیە (بەر میهری خوا بێ) دەڵێ: (ئەوانەی ئاوارتە(استثناء) کراون پەریەکانی بەهەشتێ دەگرێتەوە چونکە بەهەشت مەرگی تێدا نیە).[6]

٤) ئەبولعەبباسی قورتوبی خاوەنی (المفهم الى شرح مسلم) دەڵێ: هەمو مردوێك دەگرێتەوە چونکە مردوەکان هەستیان تێدا نیە، بۆیە ناترسن و نامرنەوە.[7]

ئەگەر (صەعقە) بە (مردن) لێك بدەینەوە ئەوا بۆچونەکەی ئەبولعەبباس ڕاست دەردەچێ چونکە مرۆڤ یەك جار دەمرێ. خوا دەفەرموێ:

﴿لا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلاَّ الْمَوْتَةَ الأُولَى: مرۆڤ لە دنیادا تەنها مردنی یەکەم دەچێژێ﴾ الدخان: ٥٦.

ئیبنولقەییم لە پەرتوکەکەیدا بە ناوی (الروح) بەندێکی تایبەتی لە بارەی ناکۆکیو ڕاجیایی زانایان لە بابەت مەرگ و مانەوەی گیانەکان لەکاتی فوی کەڕەنادا تەرخان کردوە. بۆچونەکەی ئیبنولقەییم ئەوەی تاسەنگ(ترجیح) کردوە کە دەرچون

---

[1] بگەڕیوە: مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٢٦٠/٤).الروح لابن القيم: ل٥٠؛ فتح الباري: (٣٧١/٦).

[2] الروح لابن القيم: ل٥٠. فتح الباري: (٣٧١/٦).

[3] فتح الباري: (٣٧١/٦).

[4] بگەڕیوە بو فتح الباري: (٣٧١/٦).

[5] الروح: (ل ٥٠)؛ فتح الباري: (٣٧١/٦).

[6] مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٢٦١/٤).

[7] فتح الباري: (٣٧٠/٦).

و جیابونـەوەی گیانـە لـە جەسـتە. بەرپـەچی ئـەو بۆچونەشـی داوەتـەوە کـە دەڵـێ گیانەکان لەناو دەچن. چونکە دەق زۆرن لـە بابـەت ئـەوەی کـە گیانـەکان لـە بـەرزەخدا یان بە بەختەوەری یان بە ئازاردراوی دەمێننەوە.[1]

بـەڵام ئەگـەر (صەعقەکە) بە بورانەوە لێکدەینـەوە ئـەوا گیانـەکانیش دەبورێنـەوەو ناچنە نێو جوغزی[2] ئاوارتەکانەوە چونکە مرۆڤ ڕەنگە شتێك ببینێ یان گوێـی لێبـێ پێی بترسێ‌و ببورێتەوە، وەکو پێغەمبـەر موسا ﷺ کە شاخەکەی دیت لـە جێگـەی خۆیدا نەما بورایەوە ﴿وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًـــا﴾[3]. ئەم واتایە بە ڕاشکاوی لـە هـەندێ فەرمودەدا هـاتوە: لـە فەرمودەکـەی ئـەبو هورەیـرەدا ﷺ کـە بوخـاری دەیگێڕێتـەوەو دەڵێ: پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی:

((لا تخيروني على موسى، فإن الناس يصعقون فأكون أول من يفيق، فإذا موسى باطش بجـــانب العـــرش. فـــلا أدري أكـــان فيمـــن صعـــق فأفـــاق قبلـــي، أو كـــان ممـــن اســـتثنى اللهﷻ: لە موسام بە باشتر دامـەنێن چونکە کە خـەڵك دەبورێنـەوە مـن یەکـەمین کەسم بەئاگا دێمەوە. ئەو کات موسا دەبینم توند خۆی بەدامێنی بارەگاوە گرتوە، جا نازانم بەر لـە من واگا بۆتەوە یا خۆ لەوانە بوە کە خوا هەڵیوارتون و نەبوراوەتەوە))[4].

بوخاری لە فەرمودەیەکی تریشدا لـە ئـەبو هورەیـرەی گێڕاوەتـەوە کە پێغەمبـەرﷺ فەرمویەتی:

((إني أول من يرفع رأسه بعد النفخة الآخرة، فإذا موسى أنا بموسى متعلق بالعرش، فـلا أدري، أكذلك كان. أم بعـــد النفخـــة: مـن یەکـەمین کەسم کـە لـە فـوی دواهـەمیندا سـەرم قیت دەکەمەوە. ئەوکات موسا دەبینم خۆی بە بارەگاوە هەڵواسیوە، جا نازانم پێشتریش هەر لەوێدا بوە یان لە پاش فوەکە لەوێدا دەبێ؟!))[5].

لە شوێنی سێیەمدا بەم واژەیە(لفظ) دەیگێڕێتەوە:

---

[1] الروح: ل٩٤.
[2] جوغز: بازنەی گەورە
[3] الأعراف:١٤٣.
[4] صحيح البخاري، كتاب أحاديث الأنبياء، باب وفاة موسى، فتح الباري: (٦/٤٤١).
[5] صحيح البخاري، كتاب التفسير، تفسير سورة الزمر، فتح الباري (٨/٥٥١).

((فإن الناس يصعقون يوم القيامة فأكون أول من يفيق، فإذا موسى باطش بجانب العرش، فلا أدري أكان فيمن أفاق قبلي، أو كان ممن استثنى الله)).[1]

ئەم فەرموودەیە بە ڕاشکاوی ڕادەگەیەنێ کە مردووەکانیش دەبوورێنەوە، جا ئەگەر پێغەمبەرﷺ ببوورێتەوە کە سەروەری پەیامبەرانە، ئەوا کەسانیتر شایستەترن ببوورێنەوە. هەندێ لە زانایان وای بۆ چوونە کە لە ناو مردووەکاندا تەنها شەهیدەکان لەگەڵ فوودا دەبوورێنەوە. هەندێکی تر پێغەمبەرانیشیان ڕەگەڵ داون.

نەهێنی بورانەوەی تەنها شەهیدو پێغەمبەران هەروەکو شێخی قورتوبی: ئەحمەدی کوڕی عومەر دەڵێ ئەوەیە: ((شەهیدەکان لە دوای کوژران و مردندا لە لای خوادا زندون و بژێوی دەدرێن و شادن و مژدە دەدەن)) کە ئەوەش سیفەتی زندوانی سەر دنیایە، جا ئەگەر ئەمە ڕەوشی شەهیدان بێ ئەوا پێغەمبەران لە پێشتر و شایەنترن. وێڕای ئەمە بە صەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە کە زەوی جەستەی پێغەمبەران ناخوات و نایانڕزێنێ، هەروەها پێغەمبەرﷺ لە شەوی شەوڕەوی لە بەیتولمەقدیسدا لەگەڵ پێغەمبەران کۆبۆتەوە، هەروەها لە ئاسمانیشدا بە دیداریان گەیشتوە بە تایبەتی موسا عليه السلام، هەروەها پێغەمبەرﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە ئەگەر یەکێك سڵاوی لێ بکات خوا گیانی بەبەردا دەکاتەوە تا وەڵامی سڵاوەکە بداتەوە..

زۆر فەرموودەی تر لەم بارەوە هاتون، بەمجۆرە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مردنی پێغەمبەران بە جۆرێکی وایە کە لە ئێمە بزرە و ئێمە پەی پێ نابەین، ئەگەرچی زندوشن جا ئەگەر گەیشتینە ئەو دەرەنجامەی کە زندون کەواتە کاتێك کەرەنا فوی بورانەوەی پێدا دەکرێ ئەوا هەر کێی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە دەبورێتەوە تەنها ئەوانە نەبن کە خوا نایەوێ ببورێنەوە)).[2]

بەیهەقی وای بۆ دەچێ کە تەنها شەهیدان و پێغەمبەران لەگەڵ فوەکەدا ببورێنەوە، لە بارەی بورانەوەی پێغەمبەراندا دەڵێ:

---

[1] صحيح البخاري: كتاب الرقاق، باب النفخ في الصور، فتح الباري (١١/٣٦٧).

[2] تذكرة القرطبي:١٦٩.

((من پێم وایە ئەوانیش وەکو شەهیدان لەلای خوادا زندون، لەگەڵ فوی یەکەمدا دەبورێنەوە، ئەم بورانەوەیە بە هیچ واتایەك مردن ناگەیەنێ تەنها ئەو کاتە نەبێ کە هەستیان نامێنێ، پێغەمبەریش ﷺ شێمانە(احتمال)ی داناوە کە ڕەنگە پێغەمبەر موسا لە ئاوارتەکان(استثناء) بێ، جا ئەگەر موسا لەوانە بێ کە نابورێتەوە، ئەوا لەم حاڵەتەدا بە هۆی فوی بورانەوە هەست پێکردنەکەی ناڕوات)) [1].

بەپێی ئەم تێگەیشتنە پێغەمبەران و شەهیدان لەو کەسانەن کە دەبورێنەوە و لە جوغزی ئاوارتەکانیش نین. بەڵام لە ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرەو سەعیدی کوڕی جوبەیریان ڕاگواستوٚتەوە کە پێغەمبەران و شەهیدان لەوانەن کە خوا ئاوارتەی کردون [2] ئیبنو حەجەر ئەم وتەیەی بۆ بەیهەقی گەڕاندۆتەوە [3]. جا ئەگەر مەبەستەکە ئەوەبێ کە لە مردن ئاوارتە کرابن ئەوا ڕاستە بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە لەو بورانەوەیە ئاوارتە بن کە دوچاری مردوان دەبێ هەروەکو لە فەرمودەکەی موسادا ئاماژەی بۆ دەکات؛ ئەوا بەم جۆرە نیە.

هەندێ زانا وای بۆ دەچن کە بۆ موسڵمانان وا شایەنترە لە دیاریکردنی ئاوارتەکراوەکان هەڵوەستە بکەن، چونکە هیچ دەقێکی صەحیح لەو بارەوە نەهاتوە. قورتوبی خاوەنی (التذکرة) دەڵێ: ئەبولعەبباسی شێخمان دەڵێ: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لە بارەی دیاریکردنی ئاوارتەکراوەکان هیچ فەرمودەیەکی صەحیح نەهاتوە. هەمو بۆچونەکانیش ڕێیان تێدەچێ)) [4].

ئیبنو تەیمیە دەڵێ: ئاوارتەکان پەریەکانی بەهەشت دەگرێتەوە چونکە بەهەشت مردنی تێدا نیە، هەروەها جگە لەوانیش دەگرێتەوە. ناتواندرێ بڕیاری بێ مشتومڕ لەبارەی هەمو ئاوارتەکراوەکان بدرێ چونکە خوا لە قورئاندا بەرەهایی فەرمویەتی... پێغەمبەریش ﷺ هەڵوەستەی لەحاڵەتی پێغەمبەر موسادا کردوە ئاخۆ لەو کەسانەیە کە خوا ئاوارتەی کردون یان نا؟

---

[1] فتح الباري: (١١/٣٧١).
[2] الروح: ص ٥٠.
[3] فتح الباري: (١١/٣٧١).
[4] التذكرة: ص١٦٧.

جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ هەمو ئەوانەی پێ ڕانەگەیاندرابێ کە خوا ئاوارتەی کردون، ئێمە چۆن دەتوانین بڕیاری بێ مشتومڕ بدەین. ئەم بابەتە وەکو بابەتی کاتی داهاتنی ڕۆژی دوایی و ناوی پێغەمبەرانە[1] کە خوا ئەم جۆرە بابەتانەی پێڕانەگەیاندوین ئەم زانستەش تەنها بە پێڕاگەیاندنەوە وەدەست دێ ئیتر خوا زاناترە)).[2]

قورتوبی لە ئەلحولەیمی ڕاگواستۆتەوە کە بەرپەرچی ئەوەی داوەتەوە کە ئاوارتەکراوەکان هەڵگرانی بارەگا بن یاخۆ جوبرائیل و میکائیل و مەرگەوان بن. یاخۆ منداڵ و پەریەکانی بەهەشت بن یان موسا بێ. پاشان نەهێنی نینکاریکردنەکەی ئاشکرا کردوەو دەڵێ: چونکە هەڵگرانی بارەگا خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی نین لەبەر ئەوەی بارەگا لە ژور سەرجەم ئاسمانەکانەوەیە، بۆیە ناکرێ لەناو ئاسمانەکاندا هەڵیانگرتبێ.

هەروەها جوبرائیل و میکائیل و مەرگەوانیش لەو فریشتانەن کە لە دەوری بارەگا ڕیز بون و پاکیگار(تسبيحات)ی خوا دەکەن، کە بارەگاش لە سەروی ئاسمانەکانەوەیە کەواتە کۆبونەوەو دەوردانەکەیان لەناو ئاسمانەکاندا نیە. بە گوێرەی منداڵ و پەریەکانی ناو بەهەشتیش هەمان قسەیە، بەهەشتەکان ئەگەرچی پلە پلە و لەسەر یەکن بەڵام هەر هەمویان لەسەروی ئاسمانەکان و لەژێرەوەی بارەگان، بەهەشتەکان بۆ خۆیان جیهانێکی سەربەخۆن و خوا بۆ مانەوەی بەدیهێناون، بێگومان لەو بەدیهێنراوانە جیاوازن کە خوا بۆ لەناوچون بەدیهێناون، جا ئەگەر بڵێن موساش دەگرێتەوە ئەوا ڕێی تێناچێ چونکە موسا بەمردنێکی ڕاستەقینە مردوە، خۆ بۆ ئەم جارەش لەگەڵ فوی کەڕەنادا نامرێتەوە)).[3]

هەروەها وتەی ئەوانەشی بەرپەرچ داوەتەوە کە دەڵێن ئاوارتەکراوەکان مردوەکانن ((چونکە ئاوارتەکردن بۆ ئەوانەی کە ناکرێ بخرێنە ناو جوغزەوە هیچ واتایەك ناگەیەنێ، ئەوانەی بەر لە فوی کەڕەناش مردون مەرج نیە ببورێنەوە، بۆیە

[1] ئەوانەی لە قورئان و سوننەتدا یادیان نەکراوە. -وەرگێڕ-
[2] مختصر فتاوى شيخ الإسلام: (٤/٢٦١).
[3] تذكرة: ل ١٦٨.

**هیچ ڕێی تێناچیٚ ئاوارتە بکرێن)).[1]**

**پێی وایە ئەو بورانەوەیەی توشی موسا دەبیٚ ئەو صەعقەیە نیە کە خەڵك دەمرێنیٚ، بەڵکو صەعقەیەکە لە دوای زیندوبونەوەدا توشی خەڵك دەبیٚ، ئەمە بە پێی یەك لەو دو شێمانەیەی لەلای ئەودا هەیە.**

**قورتوبی لە ئەحمەدی کوڕی عومەری شێخەکەی ڕاگواستۆتەوە کە ئەویش هەمان بۆچونی وەرگرتوە و دەڵیٚ:**

**((ئەحمەدی کوڕی عومەری مامۆستامان دەڵیٚ: ڕواڵەتی فەرمودەکەی پێغەمبەرﷺ وا دەگەیەنیٚ کە ئەم بورانەوەیە لە دوای فوی دوەمی زندو کردنەوە بێت. دەقە قورئانیەکەش وا دەخوازیٚ ئاوارتە کردنەکە لە دوای فوی مردنیٚ بیٚ، جا ئەگەر هەندیٚ زانا وایان گوتبیٚ کەواتە ئەگەری تیٚ دەکەویٚ موسا عليه السلام لەو پێغەمبەرانە بێت کە نەمردون. ئەمەش پوکەڵ(باطل)ە، چونکە لە پێشودا باسکراوە کە موسا مردوە. قازی عیاض دەڵیٚ: ڕەنگە مەبەست لەوەدا شاخەو شریخە(صعقة)ی ترسیٚ بیٚ لەدوای زندوبونەوەدا، ئەو کاتەی ئاسمانەکان و زەوی شەق دەبن، بەم جۆرە فەرمودەو ئایەتەکان سەربەخۆ دەبن، خواش بەراستی زاناترە)).[2]**

**ئیبنولقەییم بیٚ یەك و دو دڵیٚ ئەو بورانەوەیەی پێغەمبەر ﷺ باسی لێوە فەرموە لەدوای زندوبونەوەدایە ئەوەی پیٚ مەبەستە کە خوا لەم ئایەتەدا دەفەرمویٚ:**

﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلاَقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ: **وازیان لیٚبێنە، با ڕۆبچن و یاری بکەن تا بەو ڕۆژەیان دەگەن کەتێیدا دەبورێنەوە**﴾الزخرف:٨٣.[3] **خواش زاناترە.**

---

[1] التذكرة: ل ١٦٨.

[2] التذكرة: ل ١٦٨.

[3] الروح: ل ٥٢.

## بەندی سێیەم

# زیندوبونەوە

## جێباسی یەکەم

### پێناسەی زندوبونەوە

مەبەست لە زندوبونەوە بریتیە لە دوبارەبونەوەی جەستەو ژینەوەی بەندەکان لە ڕۆژی قیامەتدا. (النشور) هەمان واتای (البعث: زندوبونەوە)ی هەیە. کە دەڵێن: نشر المیت نشوراً، واتە لەدوای مردندا ژیاوە، یان کە دەڵێن انشره الله، واتە خوا زیندوی کردەوە.

جا کاتێك کە خوا دەیەوێت بەندەکان دوبارە بکاتەوەو بیانژێنێتەوە فەرمان بە ئیسرافیل دەکات، ئەویش کەڕەنا فو دەکات و گیانەکان دەچنەوە ناو جەستەکان و سەرجەم خەڵکی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان هەڵدەستنەوە:

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ: کە کەڕەنا فو کرا ئەوا هەرچی لە ئەرزو ئاسمانەکاندا هەیە دەستبەجێ دەمرن تەنها ئەوانە نەبن کە خوا نایەوێ بمرن، پاشان فوێکی‌تری پێدا دەکرێ ئەمجارە دەستبەجێ سەرجەمیان هەڵدەستنەوە و چاوەڕێی فەرمان دەبن.﴾الزمر: ٦٨.

خوا لە ئایەتی تردا باسی دیمەنی سەیرو سەرسوڕهێنەری زندوبونەوەی فەرموە و دەڵێ:

﴿ونُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُمْ مِنَ الأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ، قَالُوا يَاوَيْلَنَا مَنْ بَعَثَنَا مِنْ مَرْقَدِنَا هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَانُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ، إِنْ كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾: **کەڕەنا فو دەکرێ، ئیتر دەسبەجێ بەتاو لە گۆڕەکانیان بەرەو لای پەروەردگاریان دێنە دەرەوە. بێبڕواکان دەڵێن: هەی هاوار! ئەوە کێ لە گۆڕدا زندوی کردینەوە؟ پێیان دەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خوای بەخشندە بەڵێنی پێدابون و پێغەمبەران ڕاستیان فەرمو. ئەم ڕۆژە هیچ ئەستەمیەکی تیدا نیە. تاقە قیژەیەکەو سەرجەمیان لە لاماندا ئامادە دەبن.** ﴿یس: ٥١-٥٣﴾.

**فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕادەگەیەنن کە بەر لە فوی دوەمدا باران دەبارێت و جەستەکانی پێ شین دەبێتەوە. لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە کە عەبدوڵلای کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((ثم ينفخ في الصور، فلا يسمعه أحد إلاّ أصغى ليتا ورفع ليتا. قال: وأول من يسمعه رجل يلوط حوض إبله، قال: فيصعق، ويصعق الناس. ثم يرسل الله – أو قال: ينزل الله – مطراً كأنه الطَّل أو الظِّلّ. فتنبت منه أجساد الناس، ثم ينفخ فيه أخرى فإذا هم قيام ينظرون:

**پاشان فوی یەکەم دەکرێ، هەر کەسێك گوێی لێبێ پەڕەی ملی دادەنەوێ‌و قیتی دەکاتەوە. یەکەمین کەسیش کە گوێی لێدەبێ پیاوێکە حەوزی وشترەکەی سواق دەدات. لەگەڵ قیژەی فوەکەدا دەمرێ و خەڵکیش بەدوای ئەودا دەمرن. پاشان خوا نەرمە بارانێك دەبارێنێ جەستەی خەڵکی پێ شین دەبێتەوە، پاشان فوی دوەم دەکرێ. ئیتر سەرجەم خەڵکی قیت دەبنەوەو چاوەڕێی فەرمانی خوا دەکەن)).**[1]

**ئەو بارانەی کە خوا دەیبارێنێ‌و جەستەکانی لە گڵدا پێ شین دەبێتەوە هاوچونی ئەو بارانەیە کە خوا لەئاسمانی دنیادا دەیبارێنێ‌و گژو گیای پێ‌شین دەبێ. بۆیە خوا لە قورئانی پیرۆزدا زۆربەی جاران زندوبونەوەی دوایی بە زندوبونەوەی زەوی چواندوە کە لە دوای باران باراندا گژو گیای تێدا شین دەبێ. خوا دەفەرموێ:**

---

[1] صحيح مسلم: (٤/٢٢٥٩)، ژمارە: (٢٩٤٠).

﴿وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَنْزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَى لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾: خوا ئەو خوایەیە کە وەکو موژدەیەك بۆ بارینی باران چەندین با ھەڵدەکاو دەیاننێرێ کە چەندین ھەورو پەڵە ھەوری قورسی پڕ بارانیان ھەڵگرتوە، ئەنجا بەرەو ھەرێمێکی ڕوت و مردویان دەنێرین. پاشان بە ھۆیانەوە باران دەنێرین و چەندین جۆرە میوەی لە زەوی پێ شین دەکەین. لەڕۆژی ژینەوەشدا ئاوەھا مردوان شین دەکەینەوە، ئەم وێنەیە دێنینەوە تا بەڵکو یادەوەر بن.﴿الأعراف: ٥٦﴾.

﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ﴾: خوا ئەو خوایەیە کە با ھەڵدەکات کە بەگورجی ھەور بە جولە دەخەن، پاشان ھەورەکان بۆ ھەرێمێکی ڕوتەڵەی مردو دەنێرین، لە دوای مردنی زەویەکەیدا بەسای بارانەکە زندوی دەکەینەوە، ژینەوەش ھەر بەم جۆرەیە﴿فاطر: ٩﴾.

سەرنجدە لە ھەردو ئایەتاندا دەفەرموێ:

﴿كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَى﴾، ﴿كَذَلِكَ النُّشُورُ﴾

بەڵگەو ئاماژەن بۆ ئەوەی کە لە ڕۆژی ژینەوە بەر لە فوی دوەمدا شینبونەوەی جەستەکان و دوبارەبونەوەیان بەھۆی باران بارینەوە، لەگەڵ بارین و شینبونی گژو گیای زەوی ھاوچونە. ئاشکرایە زۆرینەی گیاو ڕوەك لە دەنکە تۆی وردیلە پێکدێت، کە لە ژێر زەویدا مات و خامۆشە، بەڵام ھەر کە باران باریو ئاوی گەیشتێ ژینی تێ دەشنەوێ و ڕەگ و ڕیشاڵ بۆ ناخی زەوی دەردەکات و قەد بەرەو ئاسمان باڵا دەکات.. پاشان دەبێتە ڕوەکێکی سەوزی ڕەخسکاو.

مرۆڤیش لە ڕۆژی ژینەوەدا لە ئێسکۆڵەیەك دوبارە دەبێتەوە، کە ئاوی پێ‌دەکەوێت وەکو دەنکە تۆی ڕوەك و گیا گەشە دەکات. ئەم ئێسکۆڵەیە پێی دەڵێن نوکە کلێنجە.

لـه صـەحيحى بوخـارى و موسـليمدا ئـەبو هورەيـرە ﷺ دەلـێ: پێغەمبـەرﷺ فەرمويەتى:

((مابين النفختين أربعون، ثم ينـــزل من السماء ماء، فينبتون كما ينبت البقـــل، وليـــس في الإنسان شيء إلاّ يَبْلى، إلاّ عظم واحد، وهو عجب الذنب منه يركب الخلـــق يـــوم القيامـــة: ماوەی نێوان هـەردو فو چل وەختە. پاشان خوای گـەورە بـارانێك دەبـارێنێ جەسـتەكان وەكو گيا دەڕوێنەوە. مرۆڤ هيچ جێگايـەكی نيە نـەڕزێ تەنـها يـەك ئێسـكۆڵە نـەبێ كـە ئەويش نوكە كلێنجەيە، لەڕۆژی ژيانەوەدا خەڵك لە كلێنجەوە دەڕوێنەوە)).

هەروەها لە گێڕانەوەيەكی موسليمدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((إنّ في الإنسان عظماً لا تأكله الأرض أبداً، فيه يركب يوم القيامة، قالوا: أي عظم هو يـــا رسول الله؟ قال: عجب الذنـــب: مـرۆڤ ئێسكۆڵەيەكی هەيـە هـەرگيز نـاڕزێ، لـە ڕۆژی قيامەتدا لەو ئێسكۆڵەيە دەڕوێتەوە. گوتيان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەم ئێسـكۆڵەيە چيە؟ فەرموی: نوكە كلێنجەيە)).

هـەروەها لـە بێژانەوەيـەكی تـری موسـليم و لـە موەطـأ و ئـەبو داود و نەسـائيدا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

((كل ابن آدم تأكله الأرض إلاّ عجب الذنب منه خلق وفيـــه يركـــب: خـۆڵ سـەرتاپای جەستەی مرۆڤ دەخوات تەنها نوكە كلێنجەكەی نەبێ كە خۆی لـە نوكـە كلێنجـەوە بەديهێنراوەو لەويشەوە دەڕوێتەوە)).[1]

زۆر فـەرمودەی صـەحيح لـەم بـارەوە هـەن كـە لەشـی پێغەمبـەران وەكـو لەشـی بەندەكانی تر ڕزی نابێ‌و خۆڵ نايانخوات. لەو فەرمودەيەی ئەبوداود دەيگێڕێتەوەو ئيبنوخوزەيمەو كەسانی‌تريش بەصەحيحيان داناوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

((إنّ الله حرَم على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء: خوا لە زەوی حەڕام كردوە لەشـی پێغەمبەران بخوات)).[2]

---

[1] جامع الأصول: (١٠/٤٢١)، ژمارە: ٧٩٤١.

[2] تەماشای فتح الباري (٦/٤٨٨)بكە.

## جێباسی دووەم

## زندوبونەوە؛ بەدیهێنانێکی سەرلەنوێیە

خوای بالا دەست خودی بەندەکان دوبارە دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ بەدیهێنانی دنیایان کەمێك جیاوازی هەیە، یەك لەم جیاوازیانە ئەوەیە کە نامرن: ﴿وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ: لە هەمو ڕوێکەوە مەرگ پەلاماری دەدات بەڵام نامرێ﴾ إبراهيم: ١٧.

حاکم فەرمودەیەك بە ئیسنادێکی صەحیح دەگێڕێتەوەو دەڵێ عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی دەڵێ: جارێکیان موعازی کوڕی جەبەلﷺ هەڵساوەو گوتی: ((هۆ هۆزی ئەود! من نێردراوی پێغەمبەری خوام، دەزانن سەرەنجام بۆ لای خوایە، پاشانیش بۆ بەهەشتە یان دۆزەخ، کە نیشتەجێبونێکی بێ کۆچ و ڕەوە، مانەوەیەکی هەمیشەیی بێمردنە، لە جەستەیەکدا کە هەرگیز نامرێ)). هەروەها طەبەرانی لە ((الکبیر)) و لە ((الأوسط))دا هاوشێوەی گێڕاوەتەوە.

جیاوازیەکی تر ئەوەیە کە لەوێدا هەندێ شت دەبینن، لێرە لە دنیادا نایبینن، وەکو دیتنی فریشتەو جنۆکەو زۆر شتی تریش کە هەر خوا خۆی دەیزانێ. هەروەها بەهەشتیەکان تف و میزو پیسایی ناکەن.

بەڵام ئەوە ناگەیەنێ ئەوانەی لە ڕۆژی دواییدا زندو دەکرێنەوە کەسانێکیتر بن. ئیبنو تەیمیە (بەر میهری خوا بێ) دەڵێ: ((هەردو بەدیهێنانەکان دو جۆری یەك ڕەگەزن؛ لە ڕوێکەوە تێکدەکەنەوەو وەکو یەك و هاوچونن، لە ڕوێکی تریشەوە جیاوازو جۆراو جۆرن، بۆیە دوبارەبوەوەکە هەمان بەدیهێنراوی پێشوە بەڵام لە دروستبونەوەدا جیاوازن، هەمو دوبارەبونەوەیەکیش هەر ئاوەهایە، کەواتە دوبارەبونەوە بەدیهێنان و بەدیهێنانەوە دەگرێتەوە)).[٢]

---

سلسلة الأحاديث الصحيحة : (٤/٢٣١)، ژمارە : (١٦٦٨).

[٢] مجموع فتاوی شیخ الإسلام: (١٧/٢٥٣)، لەوێدا شێخ بەدرێژی لەبارەی دواوە، گەر مەبەستت بێ بۆ ئەوێ بگەڕێوە.

# جێباسی سێیەم

## یەکەمین ئەو کەسەی کە گۆڕی بۆ یەکالا دەبێ

لە ڕۆژی ژیانەوەدا یەکەمین کەسێك زندو بکرێتەوەو گۆڕی بۆ یەکالا ببێ. موحەممەدی پێغەمبەرمانە ﷺ لە صەحیحی موسلیمدا ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((أنا سيد ولد آدم يوم القيامة وأول من ينشق عنه القبر وأول شافع ...وأول مشـــفع: لە ژیانەوەدا من گەورەی ئادەمیزادانم یەکەمین کەسم گۆڕم بۆ یەکالا دەبێ. یەکەمین تکاخوازم. هەروەها یەکەمین کەسم تکام پەسند بکرێ)).

لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ((موسڵمانێك و جولەکەیەك بوە شەڕە قسەیان. موسڵمانەکە گوتی: بەو خوایەی کە موحەممەدی لەسەر جیهاندا هەڵبژاردوە. جولەکەکەش گوتی: سوێند بەو خوایەی کە موسای لە جیهاندا هەڵبژاردوە. موسڵمانەکە لێی ڕاسا و شەقازللەیەکی لە بنگوێ دا. جولەکەکە سکاڵای بردە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەویش فەرموی: ((لا تخيروني على موسى، فإن الناس يصعقون فأكون أول من يفيق، فإذا موسى باطش بجانب العرش. فلا أدري أكان فيمن صعق فأفاق قبلي، أو كان ممن استثنى الله ﷻ: لە موسام بە باشتر دامەنێن چونکە خەڵك دەبورێنەوە من یەکەمین کەسم بەهۆش دێمەوە. ئەو کات موسا دەبینم توند خۆی بەدامێنی بارەگاوە گرتوە. جا نازانم بەر لە من واگا هاتۆتەوە یا خۆ لەوانە بوە کە خوا ئاوارتە(استثناء)ی کردون و نەبوراوەتەوە)).

هەروەها لە بێژانەوەیەکیدیدا دەڵێن : ((... فإنه ينفخ في الصور، فيصعـــق مـــن في السموات ومن في الأرض إلاّ من شاء الله، ثم ينفخ فيه أخرى فأكون أول من يبعث، فإذا موسى آخذ بالعرش. فلا أدري: أحوسب بصعقة الطور. أم بعث قبلي؟)).

صحيح مسلم: كتاب الفضائل، باب فضل نسب النبي - ﷺ -: (٤/١٧٨٢) ژمارە:٢٢٧٨.
جامع الأصول: (٨/ ٥١٣) ژمارە (٦٣٠٨)

## جیبابی چوارەم

### کۆکردنەوەی هەمو بەدیهێنراوەکان

خوای گەورە ڕۆژی سزاو پاداشتی بە ڕۆژی کۆکردنەوە ناو بردوە چونکە لەو ڕۆژەدا سەرجەم بەندەکانی کۆدەکاتەوە:

﴿ذَلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ وَذَلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ: لەم ڕۆژەدا هەمو خەڵك كۆ دەكرێنەوە. ئەم ڕۆژە لە لایەن هەمو خەڵكی كۆكراوە دەبینرێت.﴾هود:١٠٣.

لەم ڕۆژەدا تەواوی خەڵکان. پێشین و پاشین. کۆدەکرێنەوە:

﴿قُلْ إِنَّ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ، لَمَجْمُوعُونَ إِلَى مِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ: بلێ: خەڵکانی سەرەتاو کۆتا هەرهەمویان بۆ ژوانی ڕۆژێکی تەرخان کۆدەکرێنەوە﴾الواقعة:٤٩-٥٠

توانای خوا هەر هەمو شتێکی داگرتۆتەوەو هیچ شتێك ناتوانێ خۆی لێ هەڵبوێرێ. مرۆڤ بە هەرچی و چۆنێك و لە هەر شوێن و شێوەیەك مردبێ. خوا زندوی دەکاتەوەو لەگەڵ خەڵکان کۆی دەکاتەوە، جا لە ئاسمانێدا هەلا بەهەلا بوبێ. یان نغرۆی ژێر دەریا بێبنەکان بوبێ، یان پەلەوەرو باڵندەی کێویو درندە هەڵیانلوشی بێ، یان ماسیو نەهەنگ قوتیان دابێ، یان لە گۆڕدا ڕزابێ. هیچیان بۆ خوا ئەستەم نیەو خوا سەرجەمیان کۆ دەکاتەوە:

﴿أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: لە هەر کوێ بن خوا دەتانهێنێو کۆتان دەکاتەوە، چونکە خوا توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە﴾ البقرة: ١٤٨.

زانستە بێسنورەکەی خوا هەروەکو توانستە ڕەهایەکەی بە هەمو بەندەکان

ئاگادارەو هیچ کەسیان لە بیر ناکات و هیچ یەکێکیان پاز نادات و هیچ بەندەیەك بزر ناکات، بەڵکو هەموویانی یەك بە یەك هەڵژماردوە:

﴿إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ إِلاَّ آتِي الرَّحْمَـــانِ عَبْــدًا، لَقَــدْ أَحْصَــاهُمْ وعَدَّهُــمْ عَــدًّا، وَكُلُّــهُمْ آتِيــهِ يَــــوْمَ الْقِيَامَــــةِ فَــــرْدًا: هەموو ئەوانەی لە ئەرزو ئاسمانانداn بە ملکەچیو بە بەندایەتیەوە دەچنە لای پەروەردگاری بەخشندەیان، کە هەموویانی هەڵژماردوە. هەر هەموشیان لە ڕۆژی قیامەتدا بە تاك و تەنیایی دەچنەوە لای﴾مريم:٩٣-٩٥.

﴿وَحَشَرْنَاهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُــمْ أَحَــدًا: هەموویان کۆدەکەینەوەو هیچ کەسێکیان هەڵنابوێرین.﴾ الكهف: ٤٧.

بەپێی ئەم دەقە سەرتاپاگیرانەوە سەرجەم مرۆڤ و جنۆکەو فرشتەکان کۆ دەکرێنەوە، تێگەیشتنی ئەوانەش ڕێی تێدەچێ کە پێیان وایە ئاژەڵ و جرو جانەوەرانیش کۆدەکرینەوە. هەرچەندە زانایان بۆچونیان لەم بارەوە جیاوازە، ئیبنو تەیمیە ﷺ وای بۆ چوە کۆکردنەوەکە ئەوانیش دەگرێتەوەو دەڵێ: ((بە پێی بەڵگەکانی قورئان و سوننەت خوا هەمو جرِ و جانەوەر و ئاژەڵانیش کۆ دەکاتەوە. خوا دەفەرموێ:

﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَـــالُكُمْ مَا فَرَّطْنَـــا فِـــي الْكِتَـــابِ مِـــنْ شَـــيْءٍ ثُـــمَّ إِلَـــى رَبِّـــهِمْ يُحْشَـــرُونَ: گیانەوەرە زەمینیو باڵندە ئاسمانیەکان ئەوانیش وەکو ئێوە نەتەوە نەتەوەن، ئێمە هەمو شتێکمان لە تەختی پارێزراودا نوسیوە، پاشان هەر هەموویان بۆ لای خوا کۆ دەکرێنەوە﴾ الأنعام: ٣٨.

﴿وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ: کە جانەوەران کۆکرانەوە﴾ التكوير:٥.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِنْ دَابَّةٍ وَهُوَ عَلَى جَمْعِـهِمْ إِذَا يَشَـــاءُ قَدِيـــرٌ: یەکێك لە بەڵگەو نیشانەکانی خوایەتی خوا بەدیهێنانی ئەرزو

ئاسمانەکانە هەروەها ئەوەش نیشانەیە کە خوا جۆرەهای جۆر گیانەوەری تێدا بڵاوکردنەوە، هەر کاتێکیش خوا بیەوێ دەتوانێ کۆیان بکاتەوە﴾ الشوری: ٢٩.

وشەی (إذا) بۆ ئەو شتانە بەکاردێت کە بەبێ گومان بەکاردێن.[١]

قورتوبی بە پێچەوانەی ئەو زانایانەی کە دەڵێن جانەوەران کۆ ناکرێنەوە تاسەنگی ئەوە دەداتەوە کە لە ڕۆژی دواییدا کۆدەکرێنەوە چونکە دەقی تەواوی لەبارەوە هاتوە، دەڵێ: (خەڵکان لە کۆکردنەوەو تۆڵەدانەوەی جڕوجانەوەر و ئاژەڵان بۆچونیان جیاوازە. لە ئیبنوعەبباسیان گێڕاوەتەوە کە دەڵێ کۆکردنەوەی جڕو جانەوەر و ئاژەڵان بریتیە لە مردنیان. (ضحاك)یش وای وتوە. بەڵام لەگێڕانەوەیەکیتردا هەر لە ئیبنوعەبباسیان گێڕاوەتەوە کە گوتویەتی: جانەوەران زندو دەکرێنەوەو کۆ دەکرێنەوە.

ئەبو ذەر و ئەبو هورەیرە و عەمری کوڕی عاص و حەسەنی بەسرایی و کەسانی تریش وایان گوتوە. کە هەر ئەمەشیان ڕاست و دروستە. چونکە خوا دەفەرموێ ﴿وإذا الوحوش حشرت﴾، ﴿ثم إلى ربهم يحشرون﴾.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خوا لە ڕۆژی قیامەتدا سەرتاسەری بەدیهێنراوان کۆدەکاتەوە: جانەوەران، باڵندەکان، پێڕۆکەکان(الدواب)ی سەر زەمین، هەمو شتێك، دادی خوا هێندە پاکە تەنانەت ئاژەڵی بێ قۆچ تۆڵەی خۆی لە قۆچدارەکە وەردەگرێتەوە، پاشان خوا پێی دەڵێ: ببە خۆڵ. دەبێتە خۆڵ. ئەوەیە کەخوا دەفەرموێ:

﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَالَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا: بێبڕوا دەڵێ: خۆزگە دەبومە خۆڵ﴾النبأ: ٤٠ زۆر ئایەتی تریش.)[٢]

---

[١] مجموع فتاوى شيخ الإسلام : (٤/٢٤٨).

[٢] التذكرة: ٢٧٣.

# جیباسی پینجەم

## چۆنیەتی کۆکردنەوەی بەندەکان

لە ڕۆژی ژیانەوەدا مرۆڤ بە پێخواسی و بە ڕوت و قوتی و بە خەتەنە نەکراوی زندو دەکرێتەوە. لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا دەڵێ: ئیبنوعەبباس لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:

((إنكم محشورون حفاة عراة غرلاً: لە ڕۆژی ژینەوەدا بە پێخواسیو ڕوت و قوتیو خەتەنە نەکراوی کۆدەکرێنەوە)) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ: لە ڕۆژی ژینەوەدا وەك چۆن یەکەمجار بەدیمان هێنابون ئاوەها دوبارەتان دەکەینەوە، ئەوە بەڵێنێکە و لەسەرمانە بیهێنینە دی، ئێمە بکەری ئەم کارەین.﴾ الأنبياء:١٠٤.[1]

کە خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بو دەیفەرمو: ((خەڵك لەڕۆژی ژیانەوەدا بە پێخواسیو بەڕوتیو بە خەتەنە نەکراوی کۆدەکرێنەوە)) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر ژن و پیاوان پێکەوە بن ئەدی تەماشای یەکتر ناکەن؟ فەرموی:

((يا عائشة! الأمر أشد من أن ينظر بعضهم الى بعض: عائیشە خان! کار لەوەدانیە خەڵك بتوانێ تەماشای یەکتر بکەن چونکە ڕۆژێکی گەلێك سەختە)).[2]

بەڵام لەهەندێك فەرمودەدا هاتوە کە هەمو مرۆڤێك بەو جل و بەرگەی لەبەری بوە زندو دەکرێتەوە. ئەبو داودو ئیبنو حیببان و ئەلحاکم لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە کە لەسەرە مەرگدا بوە داوای کردوە بەرگێکی نوێی بۆ

---

[1] مشكاة المصابيح: (٣/٧٥)، ژمارە (٥٥٣٥).

[2] مشكاة المصابيح: (٣/٥٧) ژمارە (٥٥٣٦).

**بێنن، کە هێنایان لەبەری کردو گوتی: گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: ((إن الميت يبعث في ثيابه التي يموت فيها: مردو بەو جلکەوە زندو دەکرێتەوە کە لە دونیادا پێی مردوە))[1].**

**بەیهەقی ئەم فەرمودەیەی لە سێ ڕوەوە لەگەڵ فەرمودەکانی پێشتر سازاندوە:**

**یەکەم: جل و بەرگی مەرگیان لە دوای زندوبونەوەدا دەڕزێ. کە دەگەنە هەڵوەستگەی کۆبونەوە ڕوت دەبنەوە، پاشان جلی بەهەشتیان لەبەر دەکرێ.**

**دوەم: ئەگەر بەپێی پلە بەرزی بێ و یەکەمجار پێغەمبەران پاشان ڕاستگۆیان پاشان ئەوانی تر جل و بەرگیان لەبەر بکرێ، کەواتە هەمو مرۆڤێك بە گوێرەی حاڵی مردنی پۆشتە دەکرێ، پاشان کە چونە بەهەشت جل و بەرگی بەهەشت لەبەر دەکەن.**

**سێیەم: لێرەدا مەبەست لە جل و بەرگ کردەوەیە، واتە بەو کردەوانەوە زندو دەکرێتەوە کە لەسەریدا مردوە، چاکە بوبێ، یان خراپە. خوا دەفەرموێ:**

﴿وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ: **پۆشاکی پارێزگاری باشترە**﴾ الأعراف:٢٦،

﴿وثيابك فطهر: **پۆشاکت پاك ڕاگرە**﴾ المدثر:٤.

**بەیهەقی بۆ وەڵامی سێیەمی بەڵگەی بە فەرمودەکەی ئەعمەش هێناوەتەوە کە ئەبو سوفیان لە جابرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

**((يبعث كل عبدٍ على ما مات عليه: هەمو مرۆڤێك بە پێی ئەو کردەوانە زندو دەکرێتەوە کە لە سەری مردوە))[2]. ئەم فەرمودەیە موسلیم لە صحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە.[3]**

---

[1] حاكم دەڵێ: صحيح على شرط الشيخين: ذەهەبیش موافقەی کردوە. ئەلبانی دەڵێ: وەکو دەڵێن وایە. سلسلة الأحاديث الصحيحة (٤/٢٣٤) ژمارە (١٦٧١).

[2] النهاية لابن كثير: (١/٢٨٨).

[3] رواه مسلم: (٤/٢٢٠٦) ژمارە: (٢٨٧٨).

له فەرمودەکەدا وا نافامرێتەوە کە مرۆڤ بەو بەرگ و کفنەوە زندو بکرێتەوە کە پێوەی مردوە. بەڵکو بەحاڵی تێدا مردنی زندو دەکرێتەوە کە بە بڕواوە بوە یان بە بێبڕوایی، باوەڕی هەبوە یان گومان. هەروەها لەسەر ئەو کردەوانە زندو دەکرێتەوە کە لە سەری مردوە. ئەم فەرمودەیەش بەڵگەیە کە موسلیم لە صحیحەکەیدا دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:

((إذا أراد الله بقوم عذاباً أصاب العذاب مـــن كـــان فيـــهم ثم بعثـــوا علـــى أعمـــالهم: خوا گەر بیەوێ هۆزێك سزا بدات ئەوا هەموویان بەر سزاکە دەخات، باش و خراپیان، پاشان بە پێی ئەو کردەوانەو لەکاتیدا مردون زندو دەکرێنەوە))[1].

ئەگەر یەکێك ئیحرامی حەجی بەستبێ و بمرێ، ئەوا کە زیندو دەبێتەوە لەبیەیکە دەڵێ، لە صەحیحی بوخاریو موسلیم و موسنەدی پێشەوا ئەحمەد لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێن: جارێکیان پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بو ئیحرامی بەستبو، وشترەکەی هەڵکوتێك دەکات و کابرای لەسەرڕا بەر دەداتەوە، بڕبڕەی ملی دەشکێ و دەمرێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((اغسلوه بماء وسدر، وكفنوه في ثوبه، ولا تُمِسُّوه بطيب، ولا تخمروا رأسه، فإنه يبعث يـوم القيامة ملبياً: بە ئاو و بە مۆرد بیشۆن لە دو بەرگدا کفنی بکەن، بەڵام بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەریشی دامەپۆشن، چونکە لە ڕۆژی ژیانەوەدا خوا بە بەرگی ئیحرامەوە زندوی دەکاتەوەو وەك حاجیان لەبیەیکە دەکات))[2].

شەهیدیش لە ڕۆژی ژیانەوەدا کە زندو دەکرێتەوە خوێنی برینەکەی بەگوڕ وفڕ دێت: ڕەنگەکەی ڕەنگی ئاڵی خوێنە، بۆنەکەی بۆنی گوڵاوە.

بۆیە لەو کاتەی یەکێك دەگاتە ئاوزینگی سەرەمەرگ سوننەتە {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه، مُحَمَّد رَسُولَ الله}ی پێ بگوترێ تا بەڵکو لەسەر یەکخواناسی بمرێ و لە ڕۆژی قیامەتدا کە زیندو دەکرێتەوە ئەم وتە پیرۆزە بڵێتەوە.

---

[1] صحيح مسلم: (٢/٢٢٠٦) ژمارە (٢٨٧٩).

[2] مشكاة المصابيح: (١/٥٢٠) ژمارە: (١٦٣٧).

## جێباسی شەشەم

# جل وبەرگی بەندەکان لەڕۆژی ژینەوە

لە جێباسی پێشتردا ڕونمان کردەوە کە خەڵك لە ڕۆژی ژینەوەدا بە پێخواسیو بەڕوتیو بە خەتەنە نەکراوی کۆ دەکرێنەوە هەروەکو فەرمودە تەواوەکان لەو بارەوە بە ڕاشکاوی ڕایانگەیاندوە. پاشان بەندەکان پۆشتە دەکرێن و پیاو چاکەکان جل وبەرگی جوان و بە نرخیان لەبەر دەکرێ بەڵام بەدکاران کراسی قەترانیو زرێی ژەنگاویو ئەو جۆرە پۆشاکە ڕەزا قورس و درێوانەیان لەبەر دەکرێ.

پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ یەکەمین کەسی ئەو ڕۆژەیە کە پۆشتە بکرێ. لە صەحیحی بوخاریدا ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إن أول الخلائق يكسى يوم القيامة إبراهيم الخليل: یەکەمین بەدیهێنراو کە لە ڕۆژی ژیانەوەدا پۆشتە بکرێ ئیبراهیمی ئازیزی خوایە)) [1].

ئیبنو حەجەر دەڵێ: ((هەروەها بەیهەقیش لە ئیبنو عەبباسەوە فەرمودەیەکی لەم جۆرەی گێڕاوەتەوەو ئەمەشی زیادکردوە:

((و أول من يكسى من الجنة إبراهيم، يكسى حلة من الجنة، ويؤتى بكرسي فيطرح عن يمين العرش، ثم يؤتى بي فأكسي حلة من الجنة لا يقوم لها البشر: یەکەمین کەس کە لە بەهەشتدا پۆشتە بکرێ پێغەمبەر ئیبراهیمە ﷺ بەرگێکی زێڕینی لەبەر دەکرێ، پاشان کورسیەك دێنن لەلای ڕاستی بارەگای دادەنێن، پاشان من دێنن بەرگێکی زێڕینی وام لەبەر دەکەن کە هیچ مرۆڤێکی تر نایبێ)) [2].

---

[1] صحيح البخاري: كتاب الرقاق باب الحشر، فتح الباري (١١/٣٧٧) هەروەها لە (كتاب الأنبياء)یشدا گێڕاویە، سەرنجدە فتح الباري (٦/٣٨٧).

[2] فتح الباري: (١١/٣٨٤).

زانایـان دەڵێـن: پێشخسـتنی ئیـبراهیم بـە پۆشـتەکردن لـەڕۆژی قیامـەت لەبـەر ئەوەیە کە لە پێشین و پاشیناندا کەس نەبوە لە ئیبراهیم لەخواترس تر بوبێ، بۆیـە پۆشتە دەکرێ تا دڵی ئارام بێ.

ڕەنگـە لەبـەر ئـەوە بوبـێ -هـەروەکو لـە فەرمودەدا هـاتوە- چونکـە پێغەمبـەر ئیبراهیم ﷺ یەکەمین کەس بوە لە نوێژدا دەرپێی لەبەر کردوە تا پتر خۆی داپۆشێ و شـەرمگەی بـە جـێ نوێـژی نەکـەوێت، هـەروەها هـەرچی فـەرمانی پێکـراوە کردویـەتی، بۆیـە لـە پـای ئـەوەدا یەکـەمین کـەس دەبـێ لـەڕۆژی ژیانـەوەدا پۆشـتە بکرێ.

ڕەنگە ئەوانەی کە فڕێیان دایە ناو ئاگر، لەبەر چاوی خەڵك جل و بەرگیان لەبەر کردبێتـەوە، وەك چۆن ئەگـەر یـەکێکیان بکوشـتبا ڕوتیـان دەکـردەوە، لەبـەر ئـەوە پاداشتی بـەوە درایـەوە کـە لـەڕۆژی قیامەت یەکەم کەسە لەبەرچاوی هەموو خـەڵك پۆشتەبکرێ، ئەوەش باشترینیانە))[1].

[1] التذكرة:٢٠٩.

# بەندی چوارەم

# زەمینی کۆکردنەوە

زەمینی کۆکردنەوەی ڕۆژی قیامەت لەگەڵ ئەم زەویەی ئێستامان جیاوازە. خوا دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ: **لە ڕۆژی دواییدا ئاسمان و زەوی دەگۆڕێن و زەویو ئاسمانی تر دێنە ئارا، لەو ڕۆژیدا هەمویان بۆ خوای تاك و زەبونكەر لە گۆڕەكانیان دێنە دەرەوە**﴾ إبراهيم:٤٨.

**پێغەمبەر ﷺ سیفەتی ئەم زەمینە نوێیەی بۆ باس كردوین و لە فەرمودەیەكدا كە بوخاریو موسلیم لە سەهلی كوڕی سەعد دەیگێڕنەوە، دەفەرموێ:**

((يحشر الناس يوم القيامة على أرض بيضاء عفراء كقرصة النقي: **خەڵك لەڕۆژی ژیانەوەدا لەسەر زەمینێكی سپی مەیلەو سوری وەك نانی گەنمی پاك و بێ كەپەك كۆ دەكرێنەوە)) سەهل یان یەكێكی تر دەڵێت : ((ليس فيها مَعْلَمٌ لأحد))**[1].

**ئەلخەتابی دەڵێ: العفر: سپیەكی زۆر سپی نیە. عیاض دەڵێ: العفر: سپیەكی مەیلەو سورە. ئیبن فارس دەڵێ: العفر: سپیەكی تەواو سپیە.[2] المعلم: ئەو نیشانەیە كە خەڵك ڕێی هاتوچۆی پێ دەسنیشان دەكەن وەكو چیا و گاشە بەرد، یاخۆ ئەو نیشانانەن كە خەڵك بۆ ناسینەوەی ڕێ یان بۆ دابەشكردنی زەوی دایاندەنێن.**

---

[1] رواه البخاري في كتاب الرقاق. باب يقبض الله الأرض، فتح الباري: (٣٧٢/١١). ومسلم في كتاب صفات المنافقين، باب البعث والنشور: (٢١٥/٤)، ژمارە: ٢٧٩٠ ، والسياق للبخاري.

[2] فتح الباري: (٣٧٥/١١)

**جگە لەم فەرمودەیە چەندین وتەی تری یاوەران لە بوخاریو موسلیمدا لەم بارەوە هەیە بۆ وێنە عەبدی کوڕی حەمید و طەبەری لە تەفسیرەکانیان هەروەها بەیهەقیش لە (شعب الإيمان)دا لە ڕێگەی عەمری کوڕی مەیمون لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە گێڕاویەتیەوە کە لە بارەی ئەم ئایەتەدا** ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ﴾[1] **وتویەتی: زەویەکی ساف و سپی وەکو زیو فەراهەم[2] دێت کە دڵۆپە خوێنێکیشی لێ نەڕژاوە و گوناحێکیشی لەسەردا نەکراوە))[3].**

**هەروەها طەبەری و حاکم لە ڕێگەی عاصمی کوڕی حوبەیش تەخریجیان کردوە کە ئیبنو مەسعود وتویەتی: ((زەویەکی سپیە و دەڵێی قالبی زیوە)).**

**عەبدی کوڕی حەمید لە ڕێگەی ئەلحەکەمی کوڕی ئەبون گێڕاویەتیەوە کە عیکریمە وتویەتی: پێمان گەیشتوە ئەم زەویە واتە زەوی دنیا دەپێچرێتەوەو خەڵك لە وێوە بۆ لایەکی‌تر کۆدەکرێنەوە.**

**هەروەها لە فەرمودە درێژەکەی کەڕەنادا دەفەرموێ :**

((تبدل الأرض غير الأرض والسموات، فيبسطها ويسطحها، ويمدّها مدّ الأديم العكاظي، لا ترى فيها عوجاً ولا أمتا، ثم يزجر الله الخلق زجرة واحدة، فإذا هم في هذه الأرض المبدّلة، في مثل مواضعهم من الأولى، ماكان في بطنها كان في بطنها، وما كان على ظهرها كان على ظهرها: **ئەرزو ئاسمانی تر فەراهەم دێن، خوا گوشاد و تەختی دەکات هەروەها وەکو پێستی خۆشەکراو درێژی دەکاتەوە، هیچ چفت و چەوێڵ و کەندولەندێکی تێدا نابینرێ، پاشان خوا یەك دەنگ هەڵدەبڕێ ئیتر هەمو کەسێ یەکسەر لەو زەویە**

---

[1] رجاله رجال الصحيح وهو موقوف وأخرجه البيهقي من وجه آخر مرفوع وقال الموقوف أصح. [فتح الباري: (١١/٣٧٥) ].

[2] فەراهەم: مهيئة

[3] رجاله موثوقون. [ فتح الباري (١١/٣٧٥) ].

تازەیەدا لە شوێنی خۆیدا دەبێ ئەوەی لە ناخی زەویە لە ناخیدا دەبێ ئەوەی لەسەر پشتی زەویە لەسەر پشتیدا دەبێ)).[1]

هەندێ لە زانایان بۆچونیان وایە کە مەبەست لە گۆڕینی زەوی گۆڕینی سیفەتەکانیەتی. یەك لە بەڵگەکان ئەو فەرمودە مەوقوفەی سەر عەبدوڵلای کوڕی عەمرە کە دەڵێ:

((إذا كان يوم القيامة مدّت الأرض مدّ الأديم وحشر الخلائق: کە ڕۆژی قیامەت داهات زەوی وەکو پێست بەرین دەبێ)).

هەروەها ئەو فەرمودە مەرفوعەی جابر کە دەفەرموێ:

((تمدّ الأرض مدّ الأديم ثم لا يكون لابن آدم الاّ موضع قدميه: زەوی وەکو پێست بەرین دەبێ، پاشان ئادەمیزادەکان جگە لە شوێن پێی خۆیان هیچ شوێنی تریان نامێنێ)).[2]

هەروەها ئیبنو عەبباسیش لە تەفسیری ئایەتی: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ﴾دا دەڵێ: ((لێی زیادو کەم دەبێ و چیاو شاخ و زورگ و کەند و لەندو دارو درەختەکانی نامێنێ و وەکو پێستی خۆشە کراو بەرین و فرەوان دەبێ)).[3]

---

[1] فتح الباري: (١١/٣٧٥).

[2] رجاله ثقات الاّ انه اختلف على الزهري في صحابيه. [ فتح الباري: (١١/٣٧٦) ].

[3] فتح الباري: (١١/٣٧٦).

## ئەو كاتەی كە زەویو ئاسمانی تێدا دەگۆڕێ

پێغەمبەرﷺ پێی ڕاگەیاندوین كە ئەو وەختەی ئەرزو ئاسمانی تێدا دەگۆڕێ كاتی پەڕینەوەی خەڵكە بەسەر پردی دۆزەخدا یان كەمێك زوترە. لە صەحیحی موسلیمدا خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: لە بارەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ﴾ لە پێغەمبەرﷺم پرسی لەو كاتیدا خەڵك لە كوێندەر دەبن؟ فەرموی: ((لەسەر پردی دۆزەخدا دەبن)).[١]

هەمدیسان لە صەحیحی موسلیمدا ثەوبان رضي الله عنه دەڵێ: زانایەكی جولەكە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و لێی پرسی: كە زەویو ئاسمانەكان دەگۆڕێن خەڵك لە كوێ دەبن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((هم في ظلمة دون الجسر: خەڵك لەتاریكاییەكی خوارەوەی پردی دۆزەخدا دەبن)).[٢]

---

[١] صحيح مسلم، كتاب صفات المنافقين، باب البعث والنشور، (٢١٥٠/٤) ژمارە (٢٧٩١).

[٢] صحيح مسلم، كتاب الحيض، باب بيان صفة مني الرجل والمرأة، (٢٥٢/١) ژمارە (٣١٥).

# بەندی پێنجەم

# ئەوانەی بڕوایان بە زیندوبونەوە و بەڵگەکانی زیندوبونەوە نیە

## جێباسی یەکەم

## ئەوانەی بڕوایان بە زندوبونەوە نیە

**لە هەمو سەردەمێکدا خەڵکی وا هەر هەبوە کە بڕوایان بە زندوبونەوە نەبوبێ، یاخۆ بڕوایان پێ هەبوبێ بەڵام جیا لەو بڕوایەی کە پەیامبەران ڕایانگەیاندوە.**

**قورئـانی پـیرۆز باسـی بێـبڕوایی بێبـاوەڕانی کـردوە، هـەروەها سـەرکۆنە و هەڕەشەشی لێکردون:**

﴿وَإِنْ تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَئِذَا كُنَّا تُرَابًا أَئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ الأَغْلالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **گەر سەیرماوی لەوەی بڕوات پێ‌ناهێنن لەوەش سەیربمێنێ کە بڕوا بە زندوبونەوە ناهێنن و دەڵێن: ئەگەر ببین بەخۆڵ ئاخۆ سەرلەنوێ زندو بکرێینەوە؟! ئەوانە بێبڕواییان بە پەروەردگار کردوە، لە ڕۆژی ژیانەوەدا کۆتیان لەگەردن دەکرێ‌و بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێننەوە**﴾الرعد: ٥.

﴿وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ، وَلَوْ تَرَى إِذْ وُقِفُوا عَلَى رَبِّهِمْ قَالَ أَلَيْسَ هَذَا بِالْحَقِّ قَالُوا بَلَى وَرَبِّنَا قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ:

بێبڕواكان گوتیان: تەنها ژیانی دنیامان هەیەو پاشان دەمرین و دەبڕێتەوەو زندو ناكرێنەوە. ئای ئەگەر دەیانبینی كە لەبەر دەستی پەروەردگاریان ڕاوەستاون چەند زەبون و پەرێشانن. خوا پێیان دەڵێ: ئەدی ئەوە ڕاست نیە؟ دەڵێن: بەڵێ بەخوای ڕاستە، دەفەرموێ كەواتە بە هۆی بێبڕواییەكەتانەوە ئەشكەنجە بچێژن.﴾الأنعام:٢٩-٣٠.

﴿وَقَالُوا أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا وَرُفَاتًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا، قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيـدًا، أَوْ خَلْقًا مِمَّا يَكْبُرُ فِـي صُدُورِكُـمْ فَسَـيَقُولُونَ مَـنْ يُعِيدُنَـا قُـلْ الَّـذِي فَطَرَكُـمْ أَوَّلَ مَـرَّةٍ: بێبـاوەڕان گوتیـان: قـەت وانیـە، كـە بوینـە ئێسـك و پروسـك چـۆن سـەرلەنوێ بەدیدەهێنرێینەوە؟! پێیان بڵێ: نەك ببنە خۆڵ، ئەگەر ببنە بەردو ئاسنیش، یاخۆ ببنـە هـەر شـتێك كـە بەخـەیاڵتان دابێـت ئـەوا ئـەو خوایـە زندوتـان دەكاتـەوە كـە یەكەمجار ئێوەی بەدیهێناوە﴾ الأسراء: ٤٩-٥١ ئایەتیتر لەم بارەوە زۆرن.

ئیبنو تەیمیـەی شێخی ئیسلام (بـەر میـهری خـوا بـێ) چـەندین جـۆرە بێـبڕوایی ڕون كردۆتـەوە وەكـو بێـبڕوایی جولەكـەو گـاورو صابیئـەو فەیلەسـوف و دوڕوەكـان و دەڵـێ: (بێبـاوەڕانی جولەكـەو دیانـەكان ئینكـاری لـە خـواردن و خواردنـەوەو سـەرجێیی نێـو بەهەشت دەكەن، پێیان وایـە بەهەشـتیەكان بـەدەنگ و ئـاوازی خـۆش چێژمـەند دەبـن و گیانـە پـاك و باشـەكانیش لـە نێـو عـەیش و نۆشـی گیانـەكان بەختـەوەر دەبـن. لەگـەڵ ئەوەشدا بڕوایان بە كۆكردنەوەی گیان و جەستەو ئەشكەنجەو بەختەوەربونیان هەیە.

بەڵام بێبڕواكانی چینی صابیئەو فەلسەفەو شوێنكەوتوەكانیان پێیان وایـە تەنـها گیانەكان زندو دەكرێنـەوە و ئەشـكەنجەو بەختـەوەر بونیش تەنـها بـۆ گیانـە، چینـی بێبڕوا و هاوبەشپەرستانیش ئینكاری لـە تـەواوی زندوبونـەوە دەكەن، نەبڕوایان بە ژینەوەی گیان هەیە نە بە ژینـەوەی جەسـتە، خـوا لـەقورئاندا بـە تێروتەسـەلی باسـی ژینەوەی كردوەو بەرپەرچێكی پڕ بە پڕ و زۆر بەجێی داونەتەوە.

دوڕوەكانی ئـەم نەتەوەیـەش كـە بـڕوا بـە واژەكـان(الفـاظ)ی قورئـان و سـوننەتی ناسراو ناهێنن و وتەكانی قورئان جێگۆڕ دەكەن، دەڵێن ئەوانـەی قورئـان و فـەرمودە

باسی دەکەن تەنها چەند وێنەیەکن و بۆ ئەوە هێنراونەتەوە تا بزانین ژینەوەی روحانی چۆنە! وتەکانی ئەم دوڕوانە وەکو قەڕامیطە باطینیەکان دەرەنجامی وتەی ئاگر پەرست و صابیئەکانە. فەیلەسوفەکانیش وەکو صابیئەکانن کە بەناو لە خانەی ئیسلامدان. هەروەها چەندین چینی تریش کە هەمان وتە ناقۆڵاکانیان کاوێژ دەکەنەوە وەکو هەندێ نوسەرو دوڕو و نوژداریزان و کەلامناس و سۆفیەکانی وەکو شوێنکەوتوانی پەیامەکانی (برایانی سافپەروەری: إخوان الصفا) هەروەها زۆرانی تر، ئەم چینانە بە کۆدەنگی ئەهلی ئیمان بێبڕوان و کوشتنیان واجبە).[1]

لە جێگایەکی تردا دەڵێ: (فەیلەسوفە باطنیەکان ئەو بەڵێنانەی کە لە دوای مەرگ بە خەڵك دراوە وا لێکدەدەنەوە کە تەنها چەند وێنەو نمونەیەك بن تا خەڵك تێبگەن لە دوای مەرگدا ئەشکەنجەو بەختەوەری چۆن چۆنیە؟ نەك بۆ سەلماندنی چەند حەقیقەتێکی لێك جیاواز کە خۆشی پێ وەربگرێ و ئازاری پێ بچێژێ).[2]

ئەم بێباوەڕانە دیارە پێیان وانیە خواو پێغەمبەری خوا هەقیقەتیان فەرموبێ. ئیبنو تەیمیە ناوی لەم جۆرە فەیلەسوفانە ناوە (خەیاڵیەکان: أهل التخیل) و لە بارەیانەوە دەڵێ: ((خەیاڵیەکان بریتین لەو فەیلەسوف و کەلامناس و سۆفیانەی کە دەڵێن؛ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی بڕوابون بەخوا و بەڕۆژی قیامەتی ڕاگەیاندوە هەقیقەت نیە بەڵکو تەنها وەبەر خەیاڵ خستنە تاوەکو جەماوەر سودی لێوەرگرن، پێیان وانیە پێغەمبەر ﷺ هەقی ڕون کردبێتەوەو خەڵکی ڕێنوێن کردبێ‌و هەقیقەتی ڕۆشن کردبێ)).[3]

دەتوانین هەمو بەدرۆخەرەوانی زیندوبونەوە لە سێ چیندا کۆبکەینەوە:

**یەکەم/ خوانەناسەکان**: ئەوانەی هەر بڕوایان بە بونی پەروەردگار نیە، وەکو فەیلەسوفە ڕۆژگاریە سروشتیەکان و شوعیەکانی ئەم سەردەمە کە بڕوایان بە بونی

[1] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٤/٣١٣) بە دەستکاریەکی کەم.
[2] مجموع الفتاوى: (١٣/٢٣٨).
[3] مجموع الفتاوى: (٥/٣١).

بەدیهێنەر نیە و پێیان وانیە خوا بونەوەری پەیدا کردبێ، بۆیە نە بڕوایان بە بەدیهێنان هەیە نە بە بەدیهێنانەوە. لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا وا باشە یەکەم جار گفتوگۆ لەسەر بونی خوا و تاك وتەنیاییەکەی بکرێ ئەنجا ژینەوەو سەلماندنەکەی، ئەگینا بێهودەیە لەبەر ئەوەی بڕوابون بەژینەوە لقێکی بڕوابونە بە خوا.

دوەم/ ئەوانەی بڕوایان بەخوا هەیە بەڵام بڕوایان بە زندوبونەوە نیە، وەکو ئەو عارەبانەی خوا لە بارەیانەوە فەرمویەتی:

﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّـهُ: گەر لێیان بپرسی کێ ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێناوە، دەڵێن خوا﴾ لقمان: ٢٥.

هەر ئەوانیش بون دەیانگوت:

﴿أَئِذَا كُنَّا تُرَابًا وَآبَاؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ، لَقَدْ وُعِدْنَا هَذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِنْ قَبْـلُ إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ: ئەگەر ئێمەو باوباپیرانمان ببینە خۆڵ زندو دەکرێینەوە؟ پێشتریش بەڵێنی وایان بە ئێمەو باوباپیرانمان دابو، کەچی وانیەو قسەی پڕوپوچی پێشینانە﴾النمل:٦٧-٦٨.

ئەم جۆرە کەسانە بڕوایان بە خوا هەیە بەڵام پێیان ئەستەمەو لە توانای خوای ڕانابینن لە دوای مردندا زندویان بکاتەوە. خوای گەورە وێنەو نمونەکانی زندوبونەوەو بەڵگەیەکی زۆری بۆ ئەو جۆرە کەسانە هێناوەتەوە تا بۆیان بسەلمێ کە توانای خوا بە سەر هەمو شتێکدا دەشکێ‌و دەتوانێ زندویان بکاتەوە. جولەکەکانیش چینێکیان هەیە پێیان دەڵێن صادوقیەکان کە دەڵێن ئێمە تەنها بڕوا بە تەوراتەکەی موسا دێنین، بڕوایان بە زندوبونەوەو بەهەشت و دۆزەخ نیە.

سێیەم/ ئەوانەی بڕوایان بە زندوبونەوە هەیە بەڵام نەك بەو شێوەیەی پەیامە ئاسمانیەکان وتویانە.

## جێباسی دووەم

# بەڵگەکانی زندوبونەوە

**قورئان و سوننەت بۆ ژینەوە بەڵگەن. قورئانی پیرۆز لە سەرەتاوە تا کۆتایی پڕە لە باسی رەوش و چۆنیەتی ڕۆژی دوایی و چەندین هەواڵی ڕاست و وێنەو نمونەی پڕ پەندو ڕێنوێنی بۆ هێناوەتەوە، هەروەها لەمیانەی بەڵگەکانیدا هەبون و ڕودانی ئەم ڕۆژەی باس کردوەو بەرپەچی لاملانی داوەتەوەو بێبڕوایی‌و هەڵبەستەو تۆمانجەکانیانی[1] پوچاندۆتەوە.**

**هەڵبەت سروشتی بێگەردیش بەڵگەو رینوێنیە بۆئەم ڕۆژە، گومڕاکان کە دەڵێن عەقڵ ڕودانی ڕۆژێکی ئاوهای پێ ئەستەمە، ڕاست ناڵێن، چونکە عەقڵ بە ئەستەمی نازانێ و پێغەمبەرانیش قەت شتێکی وا ناهێنن لەگەڵ عەقڵدا ناساز بێت ئەگەرچی واق ورماویشی بکات. زانایانمان دەڵێن: (الشرائع تأتي بمحارات العقول لا بمحالات العقول) واتە: پەیامەکان شتی وا دەهێنن عەقڵ لەبەریدا حەیران ببێ بەڵام شتی وا ناهێنن عەقڵ پێی مەحاڵ بێ. ئیتر بفەرمون لەگەڵ بەڵگە سەلمێنەرەکانی زندوبونەوە کە سەرجەممان لە قورئانی پیرۆزمەوە هەڵێنجاوە.**

### یەکەم: هەواڵ پێدانی خوا بە هاتنەدی قیامەت:

**مەزنترین بەڵگە بۆ ئەم ڕۆژە هەواڵ پێدانی خوای بەرزو پیرۆزە، هەر کەسێك بڕوای بە خواو پێغەمبەر هەبێ‌و قورئان بەڕاست بزانێ ئەوا بڕوا بە ڕۆژی زندوبونەوەو سزاو پاداشت و بەهەشت و دۆزەخیش دێنێ چونکە خوا هەواڵی پێداوین.**

---

[1] تۆمانج: بوختان

خـوای بـەرزو پـیرۆز جۆرەهـا نەشـم و شـێوازی لـە ڕاگـەیاندنی ئـەم ڕۆژەدا بەکارهێناوە تا پتر لە دڵ بچەسپێ و تاو و کاریگەریەکەی لە ناخدا کاراتر بێ.

١. لـە هـەندێ جێگـەدا بـە ئـامرازی تـەوکیدی (إنّ) و (انّ) و (لام) ڕوداوەکـەی ڕادەگەیەنێ:

﴿إِنَّ السَّـاعَةَ آتِيَـةٌ أَكَـادُ أُخْفِيـهَا: وا کاتـی دیـارکراو دێـت بـەڵام مـن دەیشارمەوە﴾طه: ١٥.

﴿وَإِنَّ السَّاعَةَ لآتِيَةٌ فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ﴾ الحجر: ٨٥

﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لآتٍ: ئەوەی بەڵێنتان پێدەدرێ هەر دێت.﴾ الأنعام: ١٣٤.

﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ: ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ هەر ڕودەدات.﴾ المرسلات: ٧.

٢. لـە هـەندێ جێگـەی تـردا خـوا سـوێندی لـە سـەر دەخـوات و گومـانی تێـدا ناهێڵێتەوە:

﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيهِ: جگە لە خوا خواوەندی تر نیە، سوێند بێ لە ڕۆژی قیامەتدا کۆتان دەکاتەوە کە هیچ گومانێکی تێدا نیە﴾النساء: ٨٦.

هەروەها بۆ هاتنی ئەم ڕۆژە سوێند بە بەدیهێنراوەکانیشی دەخوات:

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا، فَالْحَامِلاَتِ وِقْرًا، فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا، فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا، إِنَّمَـا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ، وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِـعٌ: سـوێند بـەو بایانـەی گـەڵێ شـت بڵاو دەکەنـەوە. ئینجا بە بایانی هەڵگری باری قورس و گران. ئینجا بـەو کەشتیانەی بـە ئاسـانی لەسـەر ئاودا دەڕۆن، ئینجا بـەو فریشتانەی کـە کاروبـاران دابـەش دەکـەن؛ ئـەوەی بەڵێنتان پێدراوە ڕاستەو، ڕۆژی سزاو پاداشت هەر ڕودەدات.﴾ الذاريات: ١-٦.

﴿وَالطُّورِ، وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ، فِي رَقٍّ مَنْشُـورٍ، وَالْبَيْـتِ الْمَعْمُـورِ، وَالسَّـقْفِ الْمَرْفُوعِ، وَالْبَحْرِ الْمَسْـجُورِ، إِنَّ عَـذَابَ رَبِّـكَ لَوَاقِـعٌ، مَـا لَـهُ مِـنْ دَافِـعٍ: سوێند بە شاخی طور. بە نامەی نوسراو کە قورئانە، کە پێستی کراوەیە. بە خانەی ئاوەدان کـراوە کـە کەعبەیـە. بـە بـانی بڵندکـراو کـە ئاسمانـە. بـە دەریـای پـڕ: بـە ڕاسـتی سـزای

پەروەردگاری تۆ بۆ بێبڕوایان دێتە ئارا. هیچ لە مپەرێك نیە بیگێڕێتەوە﴾الطور:١-٨.

٣. لە هەندێ جێگەدا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات لە بەرپەرچی بێبڕواو سەرکەشاندا سوێند بۆ هاتنی ئەم ڕۆژە بخوات:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لاَ تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ: بێبڕوایان گوتیان ڕۆژی دوایی نایەتەدی، بلێ: بەڵێ بەخوای دێتەدی﴾ سبأ:٣.

﴿وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ: پێت دەڵێن: ئەم ڕۆژە ڕاستە؟ بلێ: ئەرێ بەو خوایە ڕاستە﴾ یونس:٥٣.

﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنْ لَنْ يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ: ((بێبڕوایان پێیان وایە زندو نابنەوە بلێ: بەڵێ، بەو خوایە زندو دەکرێنەوەو پاشان پێتان ڕادەگەینرێ چیتان کردوە﴾ التغابن:٧.

٤. لە جێگەی تردا سەرکۆنەو سەرزەنشتی بێبڕوایان دەکات:

﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ: ئەوانەی بڕوایان بە دیداری خوا نیە دۆڕاون و هیدایەت نادرێن.﴾ یونس:٤٥.

﴿أَلاَ إِنَّ الَّذِينَ يُمَارُونَ فِي السَّاعَةِ لَفِي ضَلاَلٍ بَعِيدٍ: ئاگادار بن ئەوانەی مشتومڕ لە هاتنی ڕۆژی دواییدا دەکەن لە گومڕاییەکی ناقۆڵاو دور دان.﴾ الشوری:١٨.

﴿بَلْ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الآخِرَةِ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِنْهَا بَلْ هُمْ مِنْهَا عَمُونَ: بەڵێ لە ڕۆژی دواییدا زانیاریان بە ڕودان و چیەتی ئەم ڕۆژە دەبێ کە ئەوکات دادیان نادات بەڵام لە دنیادا گومانیان هەیە، بەڵکو ئەوان لە ئاست بەڵگەو نیشانەو ئاماژەکانیدا کوێرن.﴾النمل:٦٦.

٥. هەندێ جار بە بڕوادارانـدا هەڵدەڵێ و دەفەرموێ:

﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُوا الأَلْبَابِ، رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ، رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لاَ رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ: دامەزراوان لە زانینـدا دەڵێن: بڕوامان بە هەمو ئایەتەکانی قورئان هێناوە کە

هەمویان لە لایەن خواوە دابەزیون، بەلاّم تەنها هۆشمەندان یادەوەر دەبن. پەروەردگارا! دوای ئەوەی ڕێنوێنیت کردوین دڵمان لە ڕاستەڕێ لامەدە و لە لای خۆتەوە میهرێکمان پێ ببەخشە تۆ بەخشەری. پەروەردگارا! تۆ بۆ ڕۆژێکی بێگومان خەڵك کۆدەکەیەوە، خوا بەڵێنی ناڕاست نیە﴾ آل عمران:٧-٩.

﴿الم، ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ، الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ، وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ، أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ: ئەلیف لام میم. ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدا نیە، ڕێنیشاندەری پارێزکارانە. ئەوانەی بڕوا بە پەنامەکی دێنن و نوێژ دەکەن و لەو بژێویەی پێشمان داون دەیبەخشن. هەروەها ئەوانەی بڕوا بەو پەیامە دێنن کە بۆت دابەزیوە، بەو نامانەش کە بەر لە تۆ دابەزیون، هەروەها بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە. ئەوانە لەسەر ڕێی ڕاستی پەروەردگارن و هەر ئەوانن ڕزگاربوان.﴾البقرة:١-٥.

﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ: چاکە ئەوە نیە ڕوتان لە ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا بکەن، بەڵکو چاکە: چاکەی کەسانێکە کە بڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی و فریشتە و پەرتوك و پێغەمبەران هێنابێ﴾ البقرة: ١٧٧.

٦. هەندێ جار ڕادەگەیەنێ بەڵێنێکی ڕاستەو هەواڵێکی سەلماوەو گومانی تێدا نیە، بۆ وێنە دەفەرموێ:

﴿ذَلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ وَذَلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ، وَمَا نُؤَخِّرُهُ إِلاَّ لأَجَلٍ مَعْدُودٍ: ئەم ڕۆژە سەرجەم خەڵکی تێدا کۆ دەکرێتەوە. ئەم ڕۆژە بینراوە، بۆ ئاکامێکی دیاریکراو هەڵیدەگرین.﴾هود: ١٠٣.

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لاَ يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلاَ مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ: خەڵکینە ! لە خوا بترسن، لەو ڕۆژە بترسن کە نە باوك بە کەڵکی کوڕی دێت و نە کوڕ دادی باوکی دەدات. بەڵێنی خوا ڕاستە﴾لقمان:٣٣.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ، قُلْ لَكُمْ مِيعَادُ يَوْمٍ لاَ تَسْتَأْخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلاَ تَسْتَقْدِمُونَ: **دەڵێن: کەنگێ ئەم بەڵێنە دێتە ئارا ئەگەر ڕاست دەکەن؟ بڵێ: ڕۆژێکی دیاریکراوی تەرخانتان هەیە کە نە ساتێك پێش دەخرێ و نە ساتێکیش پاش دەخرێ**﴾سبأ:٢٩-٣٠

﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلاَقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ: **لێیان گەڕێ با لە گومڕاییدا ڕۆبچن و یاری بکەن و بە دنیاوە خەریك بن، تا بەو ڕۆژەیان دەگەن کە بەڵێنیان پێدراوە**﴾ الزخرف: ٨٣.

﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ: **ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ ڕاستە، دێتەدی**﴾الذاريات: ٥

**٧. هەندێ جار نزیکبونەوەکەی ڕادەگەیەنێ:**

﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا، وَنَرَاهُ قَرِيبًا: **بێباوەڕان ڕۆژی دوایی بەدور دەزانن، ئێمەش بە نزیکی دەبینین.**﴾المعارج:٦-٧.

﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلاَ تَسْتَعْجِلُوهُ: **فەرمانی خوا -ڕۆژی دوایی- هات، پەلە مەکەن.**﴾النحل:١.

﴿اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ: **ئەوا وەختی تەرخان نزیك بۆوە، مانگیش لەت بو کە نیشانەیەکی ئەو ڕۆژەیە**﴾ القمر: ١.

**٨. لە هەندێ جێگەدا خوا ستایشی خۆی دەکات کە دەتوانێ بەدیهێنراوان دوبارە زندو بکاتەوە و سەرزەنشتی ئەو بەناو خوایانەش دەکات کە هاوبەشپەرستان دەیپەرستن چونکە ئەم توانایەیان نیە:**

﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً لاَ يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا وَلاَ يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلاَ حَيَاةً وَلاَ نُشُورًا: **بەناو خوای تر دەپەرستن کە ناتوانن هیچ شتێك بەدی بهێنن بەڵکو بەدی دەهێنرێن کە سودو زیان ومەرگ و ژیان و ژیانەوەیان بەدەست نیە**﴾ الفرقان:٥٣.

﴿أَمَّنْ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنْ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ءَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ: **ئایا ئەم بەناو خوایانە باشترن یان ئەو خوایەی کە**

بونەوەر بەدیدەهێنێت و لەدوای مردندا زندویان دەکاتەوەو لە ئەرزو ئاسماندا بژێویان پێدەبەخشێ؟ نەخێر هیچ خواوەندیتر لەگەڵ خوادا نیە. ئەگەر پێتان وایە خوایتر هەیە بەڵگە بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن.﴾ النمل:٦٤.

٩. لە جێگەی تردا باس لەوە دەفەرموێ کە ئەو بەدیهێنان و زندوکردنەوەیەی لە لای بەندەکان هێندە ئەستەمە، لەلای خوا هاسانە:

﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلاَ بَعْثُكُمْ إِلاَّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ: بەدیهێنان و زندوکردنەوەتان وەکو یەك تاقە کەس وایە﴾ لقمان:٢٨.

﴿أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ أَلَّنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ، بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ: مرۆڤ پێی وایە ئێسك و پروسكەكەی كۆناكەینەوە؟ بەڵێ ئێمە توانامان هەیە زندویان بکەینەوە، تەنانەت نەخشی سەرە پەنجەکانیشیان.﴾ القيامة: ٣-٤.

**دوەم: بەبەڵگە هێنانەوەی بەدیهێنراوەکان:**

خوای گەورە بەدیهێنانی بە بەڵگەی ژیانەوە هێناوەتەوە، ئێمە ڕۆژانە دەبینین کە ژیانی تازە بەدیدەهێنرێت؛ منداڵان دەبن و باڵندەکان لە هێلکەدا دەتروکێن و ئاژەڵ و جۆرو جانەوەران دەزێن و بێچو دەخەنەوە و ماسیەکان ڕوبارو دەریاکان پڕ لە ماسیلکە دەکەن.. مرۆڤ هەمو ئەوانە بە چاوی خۆی دەبینێ کەچی هێشتا نکوڵی و سەرسەختی لە زندوبونەوەدا دەکات !

ئەوانەی داوای بەڵگەی زندوبونەوە دەکەن، لەوە بێئاگان کە پەیدابون و بەدیهاتنیان بەو شێوەیە گەورەترین بەڵگەیە. ئەوەی بتوانێ بەدیان بهێنێ تواناشی هەیە زندویان بکاتەوە. خوا زۆر جاران بەڵگەی بەدیهێنانی بۆ زندوبونەوە هێناوەتەوە تا وەبیر ئەو بەندانە بهێنێتەوە کە ئەم ڕاستیەیان لەلا ئەستەمە:

﴿وَيَقُولُ الإِنسَانُ أَئِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا، أَوَلاَ يَذْكُرُ الإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْئًا: مرۆڤ دەڵێ ئەگەر مردم زندو دەکرێمەوە؟ ئەستەمە! ئەدی وەبیری نایێ لە پێشدا لە هیچەوە بەدیمان هێناوە﴾ مريم: ٦٦-٦٧

قورئانی پیرۆز له جێگەیەکی‌تردا بەدیهێنانی یەکەمین مرۆڤمان بە یاد دێنێتەوە، باوکمان ئادەم خوا لە خۆڵ دروستی کردوە. ئەو خوایەی بتوانێ مرۆڤێکی ڕێکوپێك لە خۆڵ دروست بکات تواناشی هەیە دوبارە زندوی بکاتەوە، هەروەها باسی بەدیهێنانی ئێمەی (نەوەی ئادەم)یش دەکات و دەفەرموێ:

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنْ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلاَ يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لاَ رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ:

خەڵکینە ! ئەگەر گومانتان لە زندوبونەوە هەیە، پێویستە ئەو گومانەتان نەمێنێ چونکە ئادەمی باوکی ئێوەمان لە سەرەتاوە لە گڵ بەدیهێناوە پاشان ئێوەمان لە دڵۆپە ئاوێك بەدیهێناوە، پاشان ئەم دڵۆپە ئاوەمان کردۆتە زەرو پاشان وەکو پشکە گۆشتێکی جوراوەمان لێکردوە کە جاریش هەیە شێوەکەی ڕێکە جار هەیە ناڕێکە. ئەمەش تاوەکو توانای خۆمتان بۆ ئاشکرا بکەم، ئیتر تا دەبێتە کۆرپەلە هەر لەناو منداڵداندا دەمێنێتەوە تا کاتی لە دایکبونی پاشان وەکو منداڵێك دەرتان دێنین، پاشان فراژو دەبن تا دەگەنە هەرەتی هێزو وزەتان، جا هی‌واتان هەیە بەر لەوەی بگاتە ئەم هەرەتە دەمرێ هی واشتان هەیە تا پیری‌و پەککەوتەیی دەیهێڵینەوەو بەجۆرێك دەخەرەفێ‌و چاك و خراپ جیاناکاتەوە.

بەڵگەیەکی تری زندوبونەوە ئەوەیە کە زەوی بە وشك و برینگی دەبینن وەك بڵێی ئاگری کوژاوەیە، بەڵام کاتێ باران دەبارێ دەست بە جولە دەکات و دەجمێ‌و بەهۆی ئاو و دانەوێڵەو ڕەگ و ڕیشاڵی ڕوەکەکانەوە زەویەکە کاڵ دەبێ‌و بە جۆرەها ڕوەکی ڕواو خۆی دەڕازێنێتەوە، هەمو ئەمانە ئاماژەن تا بزانن خوا ڕاستەو مردوان زندو دەکاتەوەو توانای بەسەر هەمو شتدا هەیە، تا بزانن ڕۆژی دوایی دێت وگومانی تێدا نیە، تا بزانن خوا مردوانی ناوگۆڕ زندو دەکاتەوە﴾ الحج: ٥-٧.

هەروەها خوا فەرمانی کردوە گەشت بەزەویدا بکەن و بیر لە بەدیهێنراوەکانی خوا بکەنەوە تا دەرکەوێ توانستی خوا بۆ زندوکردنەوە چۆنە:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ، قُلْ سِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: مەگەر نەیاندیوە خوا چۆن بەدیهێنان دەست پێدەکات و پاشان دوبارەی دەکاتەوە؟ ئەم کارە بۆ خوا زۆر هاسانە. بڵێ: بە زەویدا بگەڕێن و سەرنج بدەن خوا چۆن بەدیهێنانی دەست پێکردوە پاشان چۆن دوبارە بەدیدەهێنێتەوە، خوا توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە﴾ العنكبوت:١٩.

﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ الْمَثَلُ الأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ : هەر خوایە کە بەدیهێنراوان بۆ یەکەمجار بەدیدەهێنێ و پاشان دوبارەیان دەکاتەوە کە ئەوەشیان ئاسانترە، نمونەی هەرە بەرز بۆ خوایە لە ئەرزو ئاسمانەکاندا، خوا بە دەسەڵات و دانایە﴾ الروم: ٢٧.

**سێیەم: ئەو خوایەی توانای بەدیهێنانی شتی مەزن و گەورەی هەبێت توانای بۆ شتی بچوکتریش هەیە:**

هەمو ژیرێك دەزانێ ئەگەر یەکێك بتوانێ سەنگێکی قورس هەڵگرێ دەشتوانێ سەنگێکی سوك هەڵگرێ، ئەگەر پیاوێك پاڵەوانێکی چوارشانەی بەهێز لە ئەرزی بدات تواناشی هەیە فسفس پاڵەوانێکی لەڕو لاوازو گرگنیش ببەزێنێ، بەهەمان شێوە ئەو کەسەی بتوانێ باڵاخانەو تەلاران بینا بکات دەشتوانێ ژورو خانوێکی بچوك دروست بکات.

نمونەی هەرە بەرز بۆ خوایە. خوای باڵادەست بەدیهێنراوی وای بەدیهێناوە کە لە مرۆڤ گەلێك ئاڵۆزترو قورسترن. کەواتە ئەو کەسەی ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێناوە چۆن پێی دەگوترێ تۆ ناتوانی لەوان هاسانتر بەدیبهێنی!! خوا دەفەرموێ:

﴿وَقَالُوا أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا وَرُفَاتًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا، أَوَلَمْ يَـــرَوْا أَنَّ اللَّـــه الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلاً لاَ رَيْـــب فِيهِ فَـــأَبَى الظَّـــالِمُونَ إِلاَّ كُفُـــورًا: **بێباوەڕان گوتیان: کە مردین و بوینە ئێسك و پروسك، ئاخۆ سەرلەنوێ زندو دەکرێینەوە؟! مەگەر نازانن ئەو خوایەی بتوانێ ئاسمانەکان و زەوی بەدیبهێنێ، دەشتوانێ مرۆڤی لە ئەرزو ئاسمانان بە ئاسانێ بەدیبهێنێ؟ خوا ئاکامێکی بۆ داناون تێیدا بمرن بەڵام دیارە ستەمکاران تەنها بێباوەڕێتیان دەوێت.**﴾ الإسراء:٩٨-٩٩.

﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْض بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ بَلَـــى وَهُـــوَ الْخَـــلاَّقُ الْعَلِيـــمُ: **باشە ئەو خوایەی کە ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێناوە چۆن ناتوانێ مرۆڤ لەوان ئاسانتر بەدیبهێنێ؟! بەڵێ دەتوانێ، خوا خۆی بەدیهێنەرو زانایە**﴾یس:٨١.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِـــيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيـــرٌ: **مەگەر نەیاندیوە ئەو خوایەی کە ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێناوە و لە بەدیهێنانەکەش شەکەت و ماندو نەبوە؛ زۆر بە ئاسانیش دەتوانێ مردوەکان زندو بکاتەوە، بەڵێ پێی ئاسانە، خوا توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە**﴾ الأحقاف: ٣٣.

﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّـــاسِ: **هەڵبەت بەدیهێنانی ئەرزو ئاسمانەکان گەورەترو قورسترە وەك لە بەدیهێنای خەڵکی**﴾ غافر:٥٧.

**ئیبنو تەیمیە** (بەر میهری خوا بێ) **دوای هێنانەوەی ئەم ئایەتانە دەڵێ: هەڵبەت عەقڵی تەواو پێی بەڵگەنەویستە کە بەدیهێنانی ئەرزو ئاسمانان گەلێك قورستر وەك لە بەدیهێنانی ئادەمیزادان، هەڵبەت بەدیهێنانی هاسانەکە بەرتوانترە)).**[1]

**راڤەکاری بیروباوەڕی طەحاویە دەڵێ: خوا ڕایگەیاندوە کە ئەو زاتەی ئەرز ئاسمانەکانی بەو هەمو مەزنابیەوە بەدیهێناوە هەر ئەویشە کە ئێسکی رزیو پروسکان زندو دەکاتەوەو دەیگەڕێنێتەوە دۆخی جارانی)).**[2]

---

[1] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٣/٢٩٩).

[2] شرح العقيدة الطحاوية: ٤٦١.

**چوارەم: خوا توانای هەیە بەدیهێنراوان لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکیتر بگۆڕێ:**

بێباوەڕان هەر ئەوە دەبینن کە مرۆڤ دەمرێو لە خۆڵیشدا لەناو دەچێ، ئیتر وا دەزانن تازە ئەستەمە زندو ببنەوە: ﴿وَقَالُوا أَئِذَا ضَلَلْنَا فِي الأَرْضِ أَئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ: گوتیان جا ئەگەر لەزەویدا بوینە خۆڵ و بزر بوین ئاخۆ سەرلەنوێ زندو بینەوە!﴾السجدة: ١٠.

خوا لە زۆر ئایەتدا باس لەوە دەفەرموێ کە توانای بەسەر ئەوەدا هەیە بەدیهێنراوانی لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکیتر بگۆڕێت چونکە ئەم توانایە بەشێکە لەدەسەلاتی خواوەندێتیو پەروەردگارێتی خوا، بۆیە دەمرێنیو دەژیێنێ، زندو لە مردو و مردو لە زندو دەردێنێ:

﴿ إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنْ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنْ الْحَيِّ ذَلِكُمْ اللَّهُ فَأَنَّا تُؤْفَكُونَ، فَالِقُ الإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَنًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ: خوا دەنکۆڵەو ناوکان یەکالا دەکات و زندو لە مردو و مردو لە زندو دەردێنێ، ئەوەیە خوا، کەواتە ئێوە چۆن رو لەو خوایە وەردەگێڕن؟! شەو شەق دەکات و سپێدە وەدەر دەخات، شەوی کردوە بەمایەی حەسانەوەو خۆر و مانگیشی بۆ هەژمارکردنی شەو و رۆژو کات فەراهەم هێناوە. ئەم کارانە ئەندازەگیری خوای بالا دەست و زانایە﴾ الأنعام: ٩٥-٩٦.

سوبحانەڵلا لەو خوایەی کە لەو دەنکۆڵە رەق و وشك و مردوەدا روەکێکی گەورەو سەوزی لێ دەڕوێو بەروبوم و قەدو گەلا دەردەکات، پاشان ئەم روەکە زندوە دەنکۆڵەی مردو دەداتەوە، هەروەها لە باڵندەی زندودا هێلکەی مردو دەردێنێو لە هێلکەی مردودا باڵندەی دەنگ خۆش و بەجوڵەجوڵ دەردێنێ کە بە بۆشایی ئاسماندا دەفڕێ.

گۆڕانی دۆخی بەندەکان؛ لە مەرگەوە بۆ ژین، ئینجا مەرگ و پاشان ژینەوە، بەڵگەیەکی گەورەی توانستی خوای گەورەیە کە دڵەکان ناچار دەکات ملکەچی گەورەییو دەسەلاتی خوا بن: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾. البقرة: ٢٨

**هەرسێ بەڵگەکەی دوایی لەیەك جێگەی قورئاندا:**

**خوای گەورە لە جێگەیەکی قورئاندا هەرسێ بەڵگەی پێشوی پێکەوە گرێداوەو بەرپەرچی بێبڕوایانی پێ داوەتەوەو فەرمویەتی:**

﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ، الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنْ الشَّجَرِ الأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ، أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ بَلَى وَهُوَ الْخَلاَّقُ الْعَلِيمُ، إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ، فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ:

**ئەو بێبڕوایەی بەدیهێنانی خۆی لەبیر چۆتەوە ئێسکێکی ڕزیوی بەدەست گرتوەو دەڵێ: کێ ئەم ئێسکە ڕزیوە زندو دەکاتەوە؟ بڵێ ئەو خوایەی کە یەکەمجار بەدیهێناوە ئەو زندوی دەکاتەوە کە بە هەمو بەدیهێنراوێك ئاگادارو زانایە. ئەو خوایەی کە لە درەختی سەوزەوە ئاگری بۆ فەراهەم هێناون و ئێوە دەیکەنە سوتەنی. باشە ئەو زاتەی ئەو ئەرزو ئاسمانە مەزنەی بەدیهێناوە توانای نیە مرۆڤی مردو زندو بکاتەوە؟ بەڵێ دەتوانێ، چونکە خوا بەدیهێنەری زانایە. ئەگەر خوا مەبەستی شتێك بێت فەرمانی وایە پێی بڵێ ببە یەکسەر دەبێت. پاکی بۆ ئەو خوایەی کە دەسەڵاتی هەمو شتێکی بە دەستە و هەموشتان بۆ لای ئەو خوایە دەگەڕێنەوە﴾**یس:٧٨-٨٣.

**ئەو کەسەی نمونەکەی هەڵداوە خوانەناسێکی عارەبەکان بوە. پەرتوکەکانی فەرموده دەڵێن: ئەو خوانەناسە ئێسکێکی ڕزیوی گەندەڵ دەباتە لای پێغەمبەرﷺ و لە پێشیدا دەیپروێنێ‌و فوێکی لێدەکات و بە هەوایدا بڵاو دەکاتەوە، دەڵێ: موحەممەد! پێت وایە خوا ئەو پروسکە پەرش و بڵاوەیە زندو بکاتەوە؟! ئەنجا بەم بۆنەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێ:** ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ **خۆ ئەگەر ئەم خوانەناسە ژیرو هۆشمەند بوایە نەدەبو ئەم پرسیارە بکات، چونکە بون و بەدیهێنراویەکەی خودی خۆی وەڵامە بۆ زندوبونەوە، خوا لەهەمان ئایەتی پرسیارەکەدا ئەم واتایەی لە وتەی**

﴿وَنَسِيَ خَلْقَهُ﴾دا فەرموە، هەروەها لە ئایەتی دواتریش دەفەرموێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾.

١. (خوا وەدیهێنانی سەرەتای کردۆتە بەڵگەی دوبارەبونەوە، بەدیهێنانەکەی کردۆتە سەلمێنەری بەدیهێنانەوەکەی. چونکە هەمو هۆشمەندێك دەزانێ ئەوەی توانای بەسەر ئەمدا هەبێ توانای بەسەر ئەویشدا هەیە. خۆ ئەگەر لە ئاست هی دوەمدا دەسەوسان بێت ئەوا لە هی یەکەمدا هەر دەسەوەسانتر دەبێ.

بەدیهێنان وا دەخوازێ کە بەدیهێنەر توانست و زانستێکی تەواوی بە بەدیهێنراوەکەی هەبێ بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ خوا بە وردو درشت و هەمو چەندو چۆن و وێنە و کەرستەکانی بەدیهێنراوەکەی یەکەمجارو دوەمجار زانایە. جا ئەگەر خوایەك بەم جۆرە بێ و زانست و توانستی لەوپەڕیدا بێت چۆن لە زندوکردنەوەی ئێسکی رزیو دەسەوسانە؟!)[1].

٢. پاشان بیانو و سەلمێنەرێکی قسەبڕ و دیار دێنێتەوە کە وەڵامی پرسیاری خوانەناسێکی دی تێدایە کە دەڵێ: کاتێك ئێسك ڕزی دەبێ سروشتی دەگۆڕێ و سارد دەبێتەوەو وشك هەڵدێ، ژیانیش بە پێچەوانەوە دەبێ سروشتەکەی گەرم و تەڕ بێ تا ببێتە بەڵگەی زندوبونەوە. ئەنجا ئەم ئایەتە بەڵگەو وەڵامی ئەم پرسیارەی تێدایە کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ، الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾ لێرەدا خوا ئەوە ڕادەگەیەنێ کە ڕەگەزی ئاگری گەرم و وشکی لە داری سەوزی تەڕو سارد دەرهێناوە. کەواتە ئەو خوایەی هاودژ لە هاودژ دەردێنێ و کەرەستەو ڕەگەزو توخمەکانی بەدیهێنراوانی لێ گیرۆدە نابێ، هەر ئەو خوایەشە کە ئێسکی ڕزیوی هەڵپرواو دوبارە زندو دەکاتەوە.

٣. پاشان خوا بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە کە هەمو داناو هۆشمەندێك دەزانێ ئەگەر کەسێك بتوانێ کاری گەورە گەورە ئەنجام بدات دەشتوانی کاری بچوك و ئاسان ئەنجام بدات، ئەگەر یەکێك بتوانی بەردێکی گەورە باوێ دەشتوانێ بەردی

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية: ٤٦٠.

**بچوك باوێت بۆیە دەفەرموێ:** ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ بَلَى وَهُوَ الْخَلاَّقُ الْعَلِيمُ﴾ **دەفەرموێ ئەو خوایەی کە دەتوانێ ئەو ئەرزو ئاسمانە گەورەو پان و پۆڕە بەدیبهێنێ زۆریشی لە لادا ئاسانە ئێسکێکی رزیوی گەندەڵ زندو بکاتەوەو دۆخی جارانی پێبداتەوە.**[1]

**٤. پاشان خوای گەورە ئەوەی دوپات کردۆتەوە و بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە کە کاری خوا ئەوە نیە بە ئامرازو ئامێرو ماندوبون و شەکەتی ئەنجام بدرێ، بەڵکو ئەگەر خوا شتێکی بوێ تەنها بە وشەی (ببە) بەپێی ویست و مەبەستی خۆی دێتە ئارا:** ﴿إنما أمره إذا أراد شيئا أن يقول له كن فيكون﴾، **پاشان دەفەرموێ دەسەڵات و تەواوی پادشایی بۆ خوایە و هەرچی بیەوێ دەتوانێ بیکات:** ﴿فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾.[2]

**پێنجەم: زندو کردنەوەی هەندێ مردو لە دنیادا:**

**لە هەندێ ڕۆژگاری مێژودا خەڵك ژیانەوەی تەرمی خامۆش و ئێسکی ڕزیویان دیوە، بەڵکو دیتویانە شتی بێگیان ژیانی پیاداکراوە. خوا هەندێ لەو جۆرە موعجیزە سەراسیمەکارانەی پێڕاگەیاندوین.**

**یەك لەوانە گەلی پێغەمبەر موسا بو کە پێیان گوت:** ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَامُوسَى لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً: **بڕوات پێناهێنین تا بە ئاشکرا خوا دەبینین**﴾البقرة:٥٥. **خواش بەهەورە تریشقەیەك هەموانی کوشت پاشان زندوی کردنەوە** ﴿فَأَخَذَتْكُمْ الصَّاعِقَةُ وَأَنْتُمْ تَنظُرُونَ، ثُمَّ بَعَثْنَاكُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾البقرة:٥٥-٥٦.

**جارێکیان لە بەنو ئیسرائیلیەکاندا یەکێك کوژرا، هەمو هۆزەکان یەکتریان تۆمەتبار دەکرد. پێغەمبەرەکەیان فەرمانی پێکردن چێڵێك بکوژنەوە، ئەوانیش لە**

[1] شرح العقيدة الطحاوية: ٤٦٠.

[2] بگەڕێوە بۆ: شرح العقيدة الطحاوية: ٤٦١.

دوای هێن و منهێن و بگرەو بەردەیەکی زۆردا سەریان بڕی، پاشان پێغەمبەرەکەیان فەرمانی پێکردن کوژراوەکە لە بەشێکی چێڵەکەی هەڵسون، کە وایان کرد خوا کوژراوەکەی زندو کردەوەو، هەرهەموش تەماشایان دەکرد:

﴿فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾البقرة:٧٣

هەروەها خوا هەواڵی زندوکردنەوەی ئەوانەشی پێڕاگەیاندوین کە هەزاران کەس دەبون و لە ترسی مردنێ زێدی خۆیان بەجێ هێشتبو، خواش هەرهەموی مراندن و پاشان زندوی کردنەوە:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَشْكُرُونَ﴾البقرة:٢٤٣.

هەروەها باسی ئەو پیاوە دەکات کە بەلای گوندێکی وێراندا دەڕوات:

﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَلْ لَبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَى حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾:
یان وەکو ئەو کەسەی کە بەلای گوندێکی ڕوخاو و کە بانەکانی داتەپی بوز تێپەڕیو گوتی: دەبێ خوا چۆن ئەم شارە مردوە زندو بکاتەوە؟ ئەنجا خوا سەد ساڵان مراندی و پاشان زندوی کردەوەو پێی فەرمو: چەند دەبێ لێرە ماویەوە؟ گوتی ڕۆژێك یان دانە ڕۆژێك دەبێ. فەرموی: بەڵکو بۆ سەد ساڵان ماویەوە کەچی تەماشای خواردنەکەت بکە تێکنەچوە، تەماشای کەرەکەت بکە چۆن بوەتە ئێسك و پروسك، بۆیە ئاوەهامان لێکردی تا بتکەینە نیشانەیەك و خەڵك دەسەڵاتی خوای پێ بناسن. تەماشای ئێسکەکان بکە بزانە چۆن بەرزی دەکەینەوە و پاشان گۆشتی

بەسەردا دەهێنین ئەنجا کە ئەمانەی بۆ ڕون بۆوە گوتی: تێگەیشتم خوا خاوەنی دەسەڵاتە بەسەر هەمو شتێکدا﴾ البقرة: ٢٥٩.

ئیبراهیمی پێغەمبەریش لە خوا پاڕایەوە پێی نیشان بدات چۆن مردو زندو دەکاتەوە:

﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ: کە ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارا! پێم نیشان بدە چۆن مردوان زندو دەکەیەوە؟ فەرموی: بڕوا ناکەی؟ گوتی: بەڵێ بڕوام هەیە بەڵام دەمەوێ ببینم تا دڵنیا بم. فەرموی: چوار مەل بگرە و رامیان بکە بۆ لای خۆت، پاشان پارچە پارچەیان بکە و هەر پارچەی لەسەر شاخێك دابنێ، پاشان بانگیان بکە و دەبینی بە خێرایی بۆ لات دێنەوە، بزانە خوا زاناو دانایە﴾ البقرة: ٢٦٠.

عیسای پێغەمبەریش ﷺ لە قوڕدا شێوە باڵندەی ساز دەکرد پاشان فوێکی پێدا دەکرد و بە کاری خوا دەبوە باڵندە، هەروەها بە ئیزنی خوا مردوانی زندو دەکردەوە:

﴿وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُمْ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنْفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ: خوای گەورە عیسا دەکاتە پێغەمبەرو بۆ ئیسرائیلزادانی دەنێرێ، لە وەختی ڕەوانەکردنیدا بە گەلەکەی گوت: من لە لای پەروەردگارەوە نیشانەم بۆ هێناون، من لە قوڕدا شێوە باڵندەیەکتان بۆ دروست دەکەم پاشان فوی پێدا دەکەم و بە فەرمانی خوا دەبێتە باڵندە، هەروەها بە فەرمانی خوا کوێرو بەڵەکان چارە دەکەم و مردوان زندو دەکەمەوە﴾ آل عمران: ٤٩.

هەروەها خوا ئەشکەوتیەکان(اصحاب الكهف)ی بۆ ماوەی سێسەدو نۆ ساڵان خامۆش کرد، ئینجا پاش ئەو ڕۆژگارە درێژە هەڵسانەوە:

﴿ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَداً: **ئەنجا لەم خەوە قوڵەدا واگامان هێنانەوە تا بزانین کام چین ماوەی مانەوەیانی هەلژماردوە**﴾ الكهف: ١٢.

﴿وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ: **بەم جۆرە بەهۆشمان هێنانەوە تا لە یەکتری بپرسن، یەکێکیان گوتی: ئەو ماوەیە چەند دەبێ؟ گوتیان: ڕۆژێك یان دانە ڕۆژێك، پاشان گوتیان: بەس خوا دەزانێ چەند دەبێ**﴾ الكهف: ١٩.

﴿وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعاً: **سێسەدو نۆ ساڵان بە نوستویی لە ناو ئەشکەوتدا مانەوە**﴾ الكهف: ٢٥.

**یەکێك لە نیشانەو موعجیزەکانی موسای پێغەمبەر ﷺ دار گۆچانەکەی بو، کە هەڵیدەدا -بە فەرمانی خوا- دەبوە زلە مارێکی ترسناك**

﴿فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُبِينٌ﴾ الشعراء: ٣٢

**کاتێك جادوگەرەکان گۆچان و گوریسەکانی دەستیان هەڵدا و لەبەرچاواندا دەبونە مارو ماریلکە، مارەکەی موسا ﷺ هەموانی هەڵلوشی:**

﴿فَأَلْقَى مُوسَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾ الشعراء: ٤٥.

**شەشەم: نمونە هینانەوە بە زندو کردنەوەی زەوی:**

**خوای بەدیهێنەر دیمەنی زندوبونەوەو سەوزبونی زەمینی وشك و مردوی وەك بەڵگە بە نمونە هێناوەتەوە تا ئەوە بسەلمێ کە زندوکردنەوەی مردوان لە لای خوا ئاسانە:**

﴿فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَةِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: **تەماشای ئاسەواری بارانی میهری خوا بکە بزانە خوا چۆن زەوی مردو زندو دەکاتەوە، کەواتە خوا توانای هەیە لە ڕۆژی ژیانەوەدا مردوەکان زندو بکاتەوە، چونکە خوا توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە**﴾ الروم: ٥٠.

﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِــهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِــكَ النُّشُــورُ: **هەر خوا با هەڵدەكات پاشان بایەكان هەور بە جولە دەخەن و پاشان ئەم هەورانە دەبەنە سەر خاكێكی مردو، ئیتر باران دەبارێنین و زەویەكەی پیَ زندو دەكەینەوە، زندوكردنەوەش هەر بەم شێوەیە﴾** فاطر: ٩.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْــتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَى إِنَّـــهُ عَلَـــى كُــلِّ شَـــيْءٍ قَدِيــرٌ: **یەكێك لە نیشانەكانی دەسەڵاتی خوایە كە دەبینی زەوی وشك و مردوە بەڵام كە بارانی بۆ دەبارێنین بە جولە دەكەوێت و هەڵدەتۆقیَ و گیاو ڕوەكی تێدا دەڕویَ، جا بزانە ئەو خوایەی ئەم خاكە مردوەی ژیاندەوە هەر ئەویشە مردوان زندو دەكاتەوە، خوا توانای بەسەر هەمو شتێكدا هەیە﴾** فصلت :٣٩.

﴿وَالَّذِي نَزَّلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِ بَلْـــدَةً مَيْتًـــا كَذَلِــكَ تُخْرَجُــونَ: **خوا بە ئەندازەی پێویست باران دەبارێنیَ، كە بەو بارانە خاكی مردو زندو دەكاتەوەو لە ژیانەوەشدا ئاوەها زندوتان دەكەینەوە﴾** الزخرف: ١١.

**هەفتەم: دانایی خوا وا دەخوازیَ لە پیناو پاداشت و سزادا بەندەكان زندو بكاتەوە:**

**دانایی و دادگەری خوای گەورە وا دەخوازیَ كە بەندەكانی زندوبكاتەوە بۆ ئەوەی پاداشتی ئەو كردەوانەی ئەنجامیان داوە بداتەوە، جا خوای كاربەجیَ بەندەكانی بەدیهێناوەو پەیامبەرو پەرتوك و پەیامی بۆ ناردون تا بیپەرستن و فەرمان و ڕێوشوێنی ئەودا یاخی نەبن، جا هەیانە بەردەوام بوە لەسەر تاعەتی خواو گیان و سامانی خۆی لەو پێناوەدا بەخشیوە، و هەشە ڕاستەڕیَ نەبوەو ڕێی بردۆتە بەر یاخیبون و نافەرمانی، ئاخر چۆن دەكریَ ئەم دوانە وەكو یەك بن؟ چۆن دەبیَ چاكەكار پاداشتی چاكەكانیو خراپەكاریش سزای خراپەكانی وەرنەگرێتەوە؟!**

﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ، مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُــونَ، أَمْ لَكُــمْ كِتَــابٌ فِيــهِ تَدْرُسُونَ، إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا يَتَخَيَّرُونَ: **موسڵمان و بێبڕوای تاوانكار وەكو یەك هەژمار**

**بکـەین؟! ئـەوە چیتانـە چـۆن بڕیـاری وا دەدەن. یـاخۆ پـەڕتوکێکتان هەیـە لێـی خوێننەوەو بە ئارەزوی خۆتان شتی لێهەڵبژێرن.﴾** القلم: ٣٥-٣٨.

**بێبڕوایـان پێیان وایـە ئـەم گەردونـە بـە بێـهودەیی و لـە خـۆڕا پـەیدا بـوەو هیـچ جیاوازیەك لە نێوان سەرەنجامی بڕواداری چاکەکارو بێبڕوای خراپەکاردا نیە.**

﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ النَّارِ، أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّـارِ: **ئـەرزو ئاسمان و ئەوانەی لـە نێوانیاندا هەیە بـەبێ هـودەو بـەبێ مەبەسـتمان بەدی‌نـەهێناوە، ئـەوەش گومـانی بێباوەڕانـە، یـاخوە هـەر دادو بێدادیان بێ لـە نـاو ئـاگری دۆزەخ. یـاخۆ پێتـان وایـە بڕوادارانـی چاکـەکار وەکـو خراپـەکاران و وێرانکـەری زەوی هـەژمار بکـەین، یـاخۆ پێتـان وایـە پارێزگـاران وەکـو تاوانکاران حسێب بکەین؟!﴾** ص: ٢٧-٢٨.

# بەندی سێیەم

# ڕۆژی قیامەت لەلای پێغەمبەران و پەرتوکی ئاسمانیدا

## جێباسی یەکەم

## هەمو پێغەمبەرەکان هەواڵی ڕۆژی قیامەتیان ڕاگەیاندوە

بڕوابون بە قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ لە بنەڕەتەکانی بڕوادایە کە سەرجەم پێغەمبەران و شوێنکەوتوەکانیان زانیاریان لە بارەی هەبوەو بڕوایان پێهێناوە. قورئانیش کە تاکە پەرتوکی پارێزراو و نەگۆڕدراوە بەڵگەیەکی تەواوە لەو بارەیەی کە هەمو پێغەمبەران قیامەتیان بە خەڵك ناساندوەو موژدەی بەهەشتیان پێداون و لە دۆزەخیان ترساندون:

١. قورئان پێمان دەڵێ گشت بێبڕوا نەگبەتەکانی دۆزەخی دان بەوەدا دەنێن کە پێغەمبەران لە ڕۆژی دواییان ترساندون:

﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ، قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ فِي ضَلاَلٍ كَبِيرٍ، وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾:

هەر جارەی کە کۆمەڵێك دەخرێنە ناو دۆزەخ ئاگرەوانەکان پێیان دەڵێن: ئەدی پێغەمبەری هەڕەشەگارتان بۆ نەهات؟ دەڵێن: بەڵێ، پێغەمبەرمان بۆ هات و لەو ڕۆژەی ترساندین بەڵام ئێمە بڕوامان پێنەکردن و گوتمان ئێوە درۆ دەکەن و لە گومراییەکی ناقۆڵا دان. پاشان پەشیمان دەبنەوەو دەڵێن: بەداخەوە! خۆ ئەگەر

گوێمان شل بکردایە و تێگەیشتباین، ئەمڕۆ لە دۆزەخیەکان نەدەبوین.﴾الملك: ٨-١٠.

﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ: **بێبڕواکان بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن، تا دەگەنە لای، ئەوجا دەرگاکانی دەکرێنەوە، دۆزەخەوانەکان پێیان دەڵێن: ئەدی هەر لەخۆتان پێغەمبەرتان بۆ نەهات و ئایەتەکانی خوای بۆ نەخوێندنەوە؟ ئەدی لە دیداری ئەو ڕۆژەی نەترساندن؟ دەڵێن: بەڵێ، بەڵام وتەی سزای خوا بۆ کافران شایستە بو﴾** الزمر: ٧١.

**کەواتە بێباوەڕان کە بەرەو دۆزەخ دەبردرێن دان بەوەدا دەنێن کە پێغەمبەرانی هەڕەشەگاریان بۆ هاتوە بەڵام ئەوان بەدرۆیان زانیوەو بڕوایان پێنەکردون. خوا لەزۆر ئایەتی تردا ئەمەی ڕاگەیاندوە. هەروەها دانایی خوا وای خواستوە کە تا یەکێك ڕاگەیاندنی پێغەمبەرانی پێنەگات و بیانوی نەبڕێ سزای نادات:** ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً: **سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرمان بۆ نەناردبێ﴾**الإسراء:١٥.

﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلاَ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ: **پێغەمبەرانی موژدەگارو هەڕەشەگارمان ناردوە تا خەڵك بیانویان لە ئاست خوادا نەمێنێ﴾** النساء:١٦٥. **هەر بۆیەشە خوا پەیامی بۆ گشت نەتەوەکانی مرۆڤایەتی ناردوە:** ﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلاَّ خَلاَ فِيهَا نَذِيرٌ﴾ فاطر: ٢٤.

**٢. کاتێك کە ئادەمی لە بەهەشت دابەزاند زندوبونەوەی پێناساند:**

﴿قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ، قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ: **خوا فەرموی: دابەزن لە دونیادا دەبنە دوژمنی یەکتری و لە زەویشدا خۆشیو سەقامتان بۆ هەیە تا کاتێکی دیاریکراو. فەرموی: لەزەویدا دەژین و دەمرن و هەر لە زەویشدا دێنە دەرەوە﴾** الأعراف: ٢٤-٢٥. **ئیبلیس کە خوا خەشمی لێگرت و**

**لەمیهری خۆی بێبەشی کرد، داوای لە خوا کرد تا ڕۆژی زندوبونەوە مۆڵەتی بدات، خواش مۆڵەتی[1] دا:**

﴿قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ، قَالَ فَإِنَّكَ مِنْ الْمُنْظَرِينَ، إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾ ص: ٧٩-٨١.

**٣. نوحی یەکەمین پەیامبەریش هۆزەکەی لە ڕۆژی قیامەت ترساندوەو وێنەشی بۆ هێناونەوە:**

﴿وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنْ الأَرْضِ نَبَاتًا، ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا: **خوا ئێوەی لە زەویدا ڕواندوە. پاشان دەتانمرێنیّو بۆ زەوی دەگەڕێنەوە ئەنجا هەر لەزەویدا دەرتان دێنێتەوە**﴾ نوح: ١٧-١٨.

**٤. ئیبراهیمی ئازیزی باوکی پێغەمبەرانیش زۆر یادی ئەم ڕۆژەی کردوە، لە نزایەکدا دەڵێ:**

﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنْ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُمْ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ قَالَ وَمَنْ كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلاً ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ: **پەروەردگارا! ئەم هەرێمەی مەککە ئارام بکەو بەروبومی جۆراوجۆر بدە خەڵکەکەی، ئەوانەی کە بڕوایان بە خواو بەڕۆژی دوایی هێناوە. خوا فەرموی: بەڵام ئەوەی بێبڕوایی بکات ڕابوێریەکی کەمی دەدەمێ، پاشان ناچاری سزای ئاگرو سەرەنجامێکی بەدی دەکەم.**﴾ البقرة: ١٢٦.

**لە نزایەکیتردا دەڵێ:**

﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ: **پەروەردگارا! لەخۆم و دایك و باوکم و بڕوادارانیش خۆش بە، لەو ڕۆژەی لێپرسینەوە دێتە گۆڕێ**﴾إبراهيم: ٤١،

---

[1] ئیبلیس داوای لەخوا کرد تا ڕۆژی زندوبونەوە مۆڵەتی بدات، تاوەکو کارەسات و ناخۆشییەکانی ڕۆژی قیامەت نەبینیو نەمرێ، بەڵام خوا تا برەپابوونی ڕۆژی قیامەت مۆڵەتی دا. وەرگێڕ-

هەروەها لەگەڵ گەلەکەیدا دەدوێ و دەڵێ:

﴿وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ، وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْـــفِينِ، وَالَّـــذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ، وَالَّذِي أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِـــي خَطِيئَتِـــي يَـــوْمَ الدِّيـــنِ: ئەو خوایەی نان و ئاوم پێدەبەخشێ. ئەگەر نەخۆش بکەوم چارەم دەکات. ئەو خوایەی دەممرێنێو دەمژیێنێ. ئەو خوایەی تەماخوازم لە ڕۆژی سزاو پاداشتدا لە گوناحەکانم ببورێ﴾الشعراء: ٧٩-٨٢.

هەروەها پاشان لە خوا دەپارێتەوە تا بیباتە بەهەشت و لە ڕۆژی ژیانەوەدا زەبون و ریسوای نەکات:

﴿وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ، وَاغْفِرْ لأَبِي إِنَّهُ كَـــانَ مِـــنَ الضَّـــالِّينَ، وَلاَ تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ، يَوْمَ لاَ يَنْفَعُ مَالٌ وَلاَ بَنُونَ، إِلاَّ مَنْ أَتَـــى اللَّـــهَ بِقَلْـــبٍ سَـــلِيمٍ: خوایە بمکە میراتگری بەهەشتی پڕ بەخشش، لە بابیشم خۆش بە کە لە گومڕایان بو. لە ڕۆژی زندوبونەوەدا زەبون و ڕیسوام مەکە، لەو ڕۆژەی ماڵ و منداڵ سودی نیە، تەنها ئەو کەسانەی خاوەنی دڵی پاك و بێگەردن لە هاوبەشپەرستی تەنها ئەوان بەهرەمەندن.﴾ الشعراء: ٨٥-٨٩.

٥. هەروەها خوا کە لەگەڵ موسا ﷺ قسەی کردو فەرموی:

﴿إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمْ الصَّلاَةَ لِذِكْرِي، إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَـــةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَى، فَلاَ يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَنْ لاَ يُؤْمِـــنُ بِـــهَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَـتَرْدَى: من خوام و هیچ پەرستراوی تر نیە تەنها من نەبێ، نوێژ بکە تا یادم بکەیەوە. ڕۆژی دوایی دێت بەڵام من دەیشارمەوە تا هەمو کەسێك بە پێی کردەوەکانی خۆی سزاو پاداشت وەرگرێ. ئەتۆ بەهۆی بێبڕواکانەوە ئەوانەی وەدوای ئارەزوەکانیان کەوتون ڕو لەو ڕۆژە وەرمەگێڕە توشی هەلاکەت ببی﴾ طه:١٤-١٦.

هەروەها لە گفتوگۆکەی نێوان موساو فیرعەوندا هاتوە:

﴿مِنْـــهَا خَلَقْنَـــاكُمْ وَفِيـــهَا نُعِيدُكُـــمْ وَمِنْـــهَا نُخْرِجُكُـــمْ تَـــارَةً أُخْـــرَى :

ـه زەویـدا ئێوەمـان بەدیـهێناوەو بۆ زەویشـتـان دەگەڕێنینـەوە، ئـەوجا بـۆ جـارێكی تریش لە زەویدا دەرتان دێنینەوە﴾ طه: ٥٥.

٦. **پێغەمبەر هودیش ﷺ گەلەكەی خۆی لەو ڕۆژە ترساند كەچی ئەوان بڕوایان پێنەهێنا:**

﴿وَقَالَ الْمَلأ مِنْ قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاءِ الآخِـــرَةِ وَأَتْرَفْنَـــاهُمْ فِـــي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا مَا هَذَا إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْــرَبُونَ، وَلَئِنْ أَطَعْتُمْ بَشَرًا مِثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَخَاسِرُونَ، أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُـــمْ تُرَابًـــا وَعِظَامًا أَنَّكُمْ مُخْرَجُونَ، هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ، إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَـــا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ: **ڕیشسپیانی گەلەكەی كە بێبڕوا بون و دیداری ڕۆژی دواییـان بـەدرۆ دەزانـی –كـەچی لـە ژیـانی دنیـادا نـازونوزێكی زۆریشـمان دابونێ، ئەوجا– دەیانگوت (هود)یش وەكو ئێوە مرۆڤەو دەخواو دەخواتەوە. ئەگەر وەدوای مرۆڤێكی وەكو خۆتان بكەون ئەوا دەدۆڕێنن. بەڵێنتان دەداتێ ئەگەر بمرن و ببنە خۆڵ و ئێسك زندو دەبنـەوە؟! زۆر دورە! ئەو بەڵێنـە قـەت ڕاسـت نیـە، تەنها ژیانی دنیامان هەیە دەمرین و دەژین و زندو نابینەوە﴾** المؤمنون: ٣٣-٣٧.

٧. **شوعەیب ﷺ بەگەلەكەی گوت:**

﴿يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَارْجُوا الْيَوْمَ الآخِـــرَ وَلاَ تَعْثَـــوْا فِـــي الأَرْضِ مُفْسِـــدِينَ: **گـەلۆ! خوا بپەرستن و ڕۆژی دواییتـان مەبەسـت بـێ و لەسـەر زەویـدا خراپـەكاری مەنێنەوە﴾** العنكبوت: ٣٦.

٨. **یوسف ﷺ لە نزاكەیدا گوتویەتی:**

﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنْ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَـــادِيثِ فَـــاطِرَ السَّـــمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّ فِي الدُّنْيَا وَالآخِـــرَةِ تَوَفَّنِـــي مُسْـلِمًا وَأَلْحِقْنِـــي بِالصَّـــالِحِينَ: **پەروەردگارا! پاشایەتی و زانستی لێدانەوەی خەونانت پێداوم. بەدیهێنـەری ئەرزو ئاسمانـەكان! تـۆ لـە دنیـاو لـە ئاخیرەتدا پشـتیوانمی، بـە موسـڵمانی بممرێنـەو بمگەیەنە چاكەكاران.﴾** یوسف: ١٠١.

٩. هەروەها خوای بەرزو پیرۆز لە قورئاندا باسی هەندێ لە شوێنکەوتوانی پێغەمبەران دەکات کە ڕۆژی قیامەتیان ناسیوەو زانیویانە زندو دەکرێنەوە و موژدەی بەهەشت و هەڕەشەی دۆزەخیان ڕاگەیاندوە. ئەوەتانێ ذولقەرنەین کە گەیشتە پایانی ئەو زەویەی ڕۆژی لێ‌هەڵدێ هۆزێکی لەوێدا دیت، ئەنجا خوا پێی فەرمو:

﴿يَاذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَنْ تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا، قَالَ أَمَّا مَنْ ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُكْرًا، وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاءً الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا: ذولقەرنەین! یا ئەوەتە تاروماریان دەکەی، یانیش چاکەیان لە گەڵدا دەکەی و بۆ دینی خوا بانگیان دەکەی، ذولقەرنەین گوتی ئەوەی لەسەر هاوبەشپەرستی بمێنێتەوە ئەوا دەیکوژین و پاشانیش لەڕۆژی دواییدا بۆ لای خوا دەگەڕێتەوەو خواش سزایەکی سەختی دەدات. ئەو کەسەی بڕواش بێنی‌و کردەوەی چاك بکات ئەوا پاداشتی بەهەشتەو ئێمەش ڕەفتارێکی هاسانی لەگەڵدا دەکەین.﴾الكهف:٨٦-٨٨

بڕوادارەکەی خزمی فیرعەونیش زۆر چاك بڕوای بە زندوبونەوە هەبو، لەگەڵ بڕوای ئێمە هیچ جیاوازیەکی نەبو، زۆر بەوردی هۆزەکەی لەو ڕۆژە ترساندوەو پێی گوتون:

﴿وَيَاقَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ، يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُمْ مِنْ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ: گەلۆ! من لە ڕۆژی پڕبانگ و گاسکردنتان دەترسێم کە دەتانەوێ لە ئاگری دۆزەخ هەڵبێن بەلام جگە لە خوا پارێزەرتان نیە ئەو کەسەی خوا گومڕای بکات کەس نیە ڕێنوێنی بکات.﴾المؤمن:٣٢-٣٣.

﴿يَاقَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ، مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ، وَيَاقَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ: ئەی قەومەکەم! ژیانی دنیا ڕابواردنێکی کەم و بڕاوەیە بەلام ڕۆژی دوایی

ـەوارێکی هەمیشەیی گیرسانەوەیە، ئەوەی خراپە بکات تەنها سزای خراپەکەی ـدرێتەوە، هەرکەسێکی نێر بێ یان مێ بێ بڕوادار بێو چاکە بکات ئەوا دەچێتە ناو بەهەشت و لەوێدا بە بێئەندازە بژێوی‌دەدرێتێ. ئەی قەومەکەم! من بۆ بەهەشت بانگتان دەکەم بەڵام ئێوە بۆ ئاگر بانگم دەکەن.﴾ المؤمن: ٣٩-٤١.

﴿لاَ جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلاَ فِي الآخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَـــا ـى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ: هەڵبەت ئەوەی منی بۆ بانگ دەکەن نە ـەدنیاو نە لە ئاخیرەتدا بانگەوازێك نیە ڕاست و ڕەوای بۆ بسەلمێنێ، سەرەنجام و گەڕانەوەی هەرهەمومان بۆ لای خوایە، ئەوانەی دەسـبلاوی لـە گوناحـاندا دەکـەن خەڵکی دۆزەخن.﴾ المؤمن: ٤٣.

جادوگەرانی فیرعەون کە موعجیزە سەرسوڕهێنەرەکەی پێغەمبەر موسایان دیت یەکسەر بۆ سوژدە دانەوین و بونە بڕوادار، فیرعەونیش هەڕەشـەی سـزای تونـدو تیژی لێکردن، بەڵام ئەوان پشتیان بەخوا بەست و گوێیان بە هەڕەشەو گوڕەشەکان نەداو گوتیان :

﴿إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنْ السِّحْرِ وَاللَّهُ خَـيْرٌ ـوَأَبْقَى، إِنَّهُ مَنْ يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ لاَ يَمُوتُ فِيهَا وَلاَ يَحْيَا، وَمَـــنْ ـيَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُولَئِكَ لَهُمْ الدَّرَجَاتُ الْعُـــلاَ، جَنَّـــاتُ عَـــدْنٍ ـتَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْـــــهَارُ خَـــالِدِينَ فِيـــهَا وَذَلِـــكَ جَـــزَاءُ مَـــنْ تَزَكَّـــى: ئێمـە بڕوامـان بـە پـەروەردگارمان هێنـا تـا لـە گوناحـەکانمان خـۆش ببـێ و لـەو جـادوەش بمـانمبورێ کـە تـۆ بـە زۆر پێـت کردویـن، پاداشـتی لای خـوا چـاترو هەمیشـەترە. هەرکەسـێك بـە بێـبڕوایی بچێتـەوە لای خـوا دەچێتـە دۆزەخێکـی هەمیشـەیی کـە نـە تێیـدا دەژێ و نـە تێیـدا دەمـرێ. بـەڵام ئـەوەی بـەبڕواداری و چاکەکاری بگەڕێتەوە لای خوا ئەوا چەندین پلەی بەرز بەرزی لە بەهەشتدا هەیە و بـە هەمیشـەیی دەچێتـە نێـو بـاخ و باخـاتی بەهەشـتی عـەدن کـە چـەندین ڕوبـارو جۆگەلەی بەژێردا دەڕوات، ئەمەیە پاداشتی پاکان.﴾ طه : ٧٣-٧٦.

## جێباسی دووەم

## چاو راداشتنێك( نظرة ) بۆ ئەو دەقانەی کە لە پەرتوکی نامەوەراندا لەبارەی ڕۆژی دواییەوە دواون

هەڵبەت پەرتوکە ئاسمانیەکان گەلێ فەرمودەیان لەبارەی ڕۆژی دواییەوە فەرموەو خەڵکیان پێترساندوەو موژدەی بەهەشتی پان و پۆڕو فرەوانیان بە بڕواداران داوەو ترسی ئاگرو ناخۆشیەکانی ڕۆژی قیامەتیان راگەیاندوە بەلام هەمو ئەم پەرتوکانە دەستێوەردانێکی زۆریان لەگەڵدا کراوەو چەندین دەقیان تێدا لابردوە کە لە بارەی ڕۆژی دواییەوە دواوە.

١. لەو تەوراتەی گوایە هی موسایە تەنها یەك دەقی تێدایە کە بەڕاشکاوی باسی ڕۆژی قیامەت بکات، کە ئەویش لە تەوراتی سامریدا بە ڕاشکاوی رایدەگەیەنێ، بەلام لە تەوراتی عیبریدا دو واتا هەڵدەگرێ، لە سیفری تەثنیەی ئیشتیراع، ئیصحاحی سیودو، بڕگەی (٣٤-٣٥) لە تەوراتی سامریدا دەڵێ: ((ئەدی لەلای مندا تا ڕۆژی تۆڵەو پاداشت ئەو وەختەی خلیسك دەبەن کۆنەبۆتەوەو لە گەنجینەکانمدا مۆری لێنەدراوە؟!)).

لە تەوراتی عیبرانیشدا بەم جۆرەیە: ((ئەدی لەلای مندا پاشەکەوت نەکراوەو لە گەنجینەکانمدا مۆر نەکراوە کە تۆڵەو پاداشت بۆ منە لەو وەختەی خلیسك دەبەن)).

لە دەقە سامریەکەدا بڕیاردانەکە لەڕۆژی قیامەتدا دەبێ کە بە ڕۆژی تۆڵەو پاداشتی ناودێر کردوە، بەلام لە دەقە عیبرانیەکەدا ڕێی تێدەچێ دنیاو ئاخیرەتی پێمەبەست بێ، بۆیە صادوقیەکانی جولەکە بڕوایان بە زندوبونەوە نیە، چونکە تەنها بڕوایان بە تەوراتە عیبرانیەکە هەیەو دەڵێن هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە بۆ

زندوبونەوە.

هەروەها ئینجیل و سیفری پێغەمبەرەکانی تریش لە تەوراتدا چەند دەقێکیان تێدایەو بەڕاشکاوی باسی زندوبونەوە دەکەن.

٢. لە سیفری دانیالدا دەڵێ: ((زۆربەی مردوانی ژێر خۆڵ هەڵدەستنەوە، هەندێکیان بۆ ژینی نەمری، هەندێکیان بۆ شەرمەزاری، هەندێکیان بۆ زەبونیەکی هەمیشەیی)).[١]

٣. لە سیفری مەزامیردا باسی کۆکردنەوە بەرەو دۆزەخ دەکات و دەڵێ: ((وەکو مالآت بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن، مەرگ شوانیانە، راستاڵەکان هەر لە بەیانیەوەڕا ڕەشیان دەکەن، وێنەیان دەرزێ و هاویە نشینگەیانە)).[٢]

٤. لە ئینجیلی لۆقادا ئاماژە بۆ ئەشکەنجەی گۆڕ دەکات و دەڵێ: دەوڵەمەندەکە مرد و ئەسپەردە کرا، لە ناو هاویەدا چاوەکانی کردەوە بینی لەنێو ئەشکەنجە دایە))[٣].

هەڵبەت بێڕواو تاوانکارەکان لە ناو گۆڕدا ئەشکەنجە دەدرێن و شوێنی خۆیان لە ئاگردا دەبینن. هاویەش بریتیە لە ئاگر.

٥. لە ئینجیلی مەتتیدا دەڵێ: ((ئەگەر دەستت یان پێت گوناحی پێکردی بیبڕەو فڕێی بدە، لە ژیاندا گۆجە و شەلە بی باشترە نەك فڕێت دەنە ناو ئاگری هەمیشەییو دەست و پێت هەبێ))[٤].

ئینجیلی بەرنابا لە هەمویان پتر باسی بەهەشت و دۆزەخ و بەهەشتیەکانی کردوە، کە دەخۆن و دەخۆنەوەو میزو پیسایی ناکەن چونکە خواردن و

---

[١] ئیصحاحی (١٢) ی سیفری دانیال.

[٢] بڕگەی (٥) لە مەزموری پەنجاو پێنج.

[٣] بڕگەی (٢٢) ی ئیصحاحی شەشەم لە ئینجیلی لۆقا.

[٤] بڕگەی (٢٣) لە ئیصحاحی ٢٢ ی ئینجیلی مەتتی.

خواردنەوەیان پیسی تێدا نیە. بەڵام دیانەکان بڕوا بەو ئینجیلە ناکەن کە لەم دواییەدا وەدەر کەوتوە.

هەندێ لە جولەکەکان کە بڕوایان بە زندوبونەوە هەیە پێیان دەڵێن کۆمەڵی کەتەبە، بەڵام ئەوانیتر کەبڕوایان پێ‌نیە پێیان دەڵێن صادوقیەکان. ئینجیلی مەتتی باسی ئەم کۆمەڵە دەکات کە هاتونەتە لای عیساو لە بارەی زندوبونەوەدا مشتومڕیان لەگەڵدا کردوە، دەڵێ: ((لەو ڕۆژیدا صادوقیەکان هاتنە لای عیسا، ئەوانەی کە دەڵێن قیامەت و زندوبونەوە نیە)).[1]

هەروەها دەڵێ عیسا لە وەڵامی پرسیاری یەکێك لە قوتابیەکانی کە دەڵێ: ((ئایە جەستەشمان دەچێتە بەهەشت ؟)) وتویەتی: ((پەترۆس! ئاگادار بە نەبیە صەدوقی، چونکە صەدوقیەکان دەڵێن: جەستە هەڵناسنەوە، فریشتە نیە، هەر بۆیەشە جەستەو گیانیان لە چونە بەهەشت بێبەشە)).

دیانەکان پێیان وایە لە ڕۆژی قیامەتدا تەنها گیان بەختەوەریو ئەشکەنجە دەبینێ. هەروەها هەندێ لە فەلسەفەزان و کۆمەڵی باگنیەکانیش کە بەناو لە جوغزی ئیسلامدان هەمان بیروباوەڕی ئەوانیان هەیە.

---

[1] برگەی (٢٣) لە ئیصحاحی ٢٢ ی ئینجیلی مەتتی.

بەندی حەفتەم

# نارەحەتییەکانی ڕۆژی قیامەت

## جێباسی یەکەم

### بەڵگەکانی ناخۆشیەکانی ئەم ڕۆژە

کارەسات و ناخۆشیەکانی ئەو ڕۆژە هەند گەورەیە کە قەت لە پێشودا شتی ئاوەها ڕوینەداوە لەبەرئەوەی:

یەکەم: خوا ئەم ڕۆژەی بە مەزن وەسف کردوە، جا خوا کە بە مەزنی باسکردوە بۆ ئەوەیە تا هەر چۆنێ خەیاڵمان بۆی دەچێ پێمان گەورەتر بێ:

﴿أَلاَ يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ، لِيَوْمٍ عَظِيمٍ، يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِــرَبِّ الْعَــالَمِينَ: -یارە ئەم بێباوەڕانە پێیان وانیە بۆ ڕۆژێکی مەزندا زندو دەکرێنەوە، لە ڕۆژێکدا کە سەرجەم خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانییان ڕادەوەستن.﴾ المطففين: ٤-٦.

لە جێگەیەکیتردا بە قورس وەسفی دەکات و لە جێگەیەکیتریشدا بە دژوار:

﴿إِنَّ هَؤُلاَءِ يُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَاءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيــلاً: ئەم بێبڕوایانە دنیای کەمتەمەنیان خۆش دەوێت کەچی ڕۆژێکی قورس پشتگوێ دەخەن.﴾ الأنسان: ٢٧.

﴿فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ، عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ: ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی سەخت و دژوارە. بۆ کافران ئاسان نیە﴾ المدثر: ٩-١٠.

**دووەم: خەڵك لەو ڕۆژەدا دوچاری ترس و سامێكی بێئەندازە دەبن:**

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ، يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ: **خەڵكینە ! لە پەروەردگارتان بترسن، بومەلەرزەی ڕۆژی دوایی شتێكی گەلێك گەورەیە، لەو ڕۆژەدا دایك ئاگای لە منداڵەكەی بەر مەمكی نامێنێ و ئافرەتی زگپڕ زگەكەی دادەنێ، خەڵك وەكو سەرخۆشیان لێدێ كەچی سەرخۆشیش نین بەڵام ئەشكەنجەو سزای خوا توندوتیژە**﴾ الحج: ١-٢.

**لەبەر نارەحەتیە توندوتیژەكانی ئەم ڕۆژە ستەمكاران چاویان زەق و زۆپ و ئەبڵەق دەبێ نە دەیجولێنن نە دەینوقێنن. هەروەها لە ترسان دڵەكانیان خاڵی دەبێ‌و هیچ شتێكی پێ تێناگەن:**

﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ، مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ: **وا مەزانن خوا لە كرداری ستەمكاران بێئاگایە. نەخێر بەڵام بۆ ئەو ڕۆژەیان هەڵدەگرێ كە چاوی تێدا ئەبڵەق دەبێ. تەنگەتاون و سەریان بەرز ڕاگرتوە، پێڵوی چاوەكانیان وێك نایەتەوەو دڵیان خاڵییە**﴾ إبراهيم: ٤٢-٤٣.

**ستەمكاران دڵیان لەترسی ئەو ڕۆژەدا دێتە ناو گەرو نە دێتە دەرەوە نە لە جێگەی خۆیدا سەقام دەگرێ:**

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الآزِفَةِ إِذْ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ﴾ غافر: ١٨، **كاظمين: واتە بێدەنگ دەبن و قسە ناكەن.**

**لە جێگەیەكی‌تردا لە وەسفی چاو و دڵە ترساوەكانی ئەم ڕۆژەدا دەفەرموێ:**

﴿يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالأَبْصَارُ: **لە ڕۆژێك دەترسن كە دڵ تێیدا لە نێوان ترس و تەما دایە و چاویش تەماشای ئەملاو ئەولا دەكات.**﴾ النور: ٣٧.

﴿قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ، أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ: **زۆر دڵ لەو ڕۆژەدا دەلەرزێ و چاویان**

**سەر بەرەو ژێر دەبیٚ**﴾ النازعات: ٨-٩.

**تەنانەت منداڵی بێگوناحیش لەبەر توندو تیژی ناخۆشیەکانی ئەم ڕۆژە مـوی سەری سپی دەبێت:**

﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِنْ كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا، السَّمَاءُ مُنْفَطِرٌ بِهِ كَـانَ وَعْدُهُ مَفْعُولاً: **ئەگەر بێبڕوایی بکەن چۆن خۆتان دەپارێزن لە ڕۆژێك کە بە ترس و سامی خۆی منداڵان پیر دەکات. ئاسمـان لەبـەر سـەختی ئـەم ڕۆژەدا لـەت دەبیٚ. بەڵێنی خوا تێیەڕیوە**﴾المزمل:١٧-١٨.

**سێیەم: هـەمو جۆرە پەیوەندیـەکی نـەژادی و خزمایـەتیو برادەرایـەتیو خـێزانی هەڵدەوەشێتەوەو نامێنیٚ و هەر کەسێك بە دەردی خۆی خەریکەو دەستی ناپـەرژێ یارمەتی کەسانیتر بدات تەنانەت نزیکترین کەسیشی!**

﴿فَـإِذَا نُفِـخَ فِي الصُّـورِ فَـلاَ أَنسَـابَ بَيْنَـهُمْ يَوْمَئِـذٍ وَلاَ يَتَسَـاءلُونَ: **کە کەڕەنا فوی دوەمی پێدا کرا هیچ نـەژادو خزمایەتیـەك نامێنیٚ و کـەس لـە حاڵی کەس ناپرسیٚ و هەرکەس سەرقاڵی حاڵی خۆیەتی**﴾ المؤمنون: ١٠١.

﴿فَإِذَا جَاءتْ الصَّاخَّةُ، يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ، وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيـهِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيـهِ: **کە شـاخە و شریخەی ڕۆژی دوایی هـات. ئەو ڕۆژەی مـەردوم لەبەر خەفـەت و پێویستی خـۆی ناپەڕژێتـە سـەر کـەس تەنانـەت لـە براو دایك و باوك و خێزان و کوڕی خۆشی هەڵدێت.**﴾ عبس: ٣٣.

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لاَ يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلاَ مَوْلُودٌ هُـوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ: **خەڵکینە ! لە خوا بترسن و ترسـتان لـەو ڕۆژە هەبیٚ کە نە باوك بە کەڵکی کوڕی دێت و نە کوڕ دادی باوکی دەدات. بـەڵێنی خوا ڕاستە**﴾ لقمان: ٣٣.

﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا لاَ تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَـيْئًا وَلاَ يُقْبَـلُ مِنْـهَا شَـفَاعَةٌ وَلاَ يُؤْخَـذُ مِنْـهَا عَـدْلٌ وَلاَ هُـمْ يُنصَـرُونَ:

خۆتـان لـەو ڕۆژە بپـارێزن کـە هیـچ کەسـێك دادی کەسـیتر نـادات و تکـای بـۆ وەرناگیرێو قوربانیشی لێ قبولْ ناکرێ و یارمەتیش نادرێ﴾ البقرة: ٤٨.

چوارەم: بێبڕواکان ئامادەن کە هەر چیەکیان هەبێ لە پێناو ڕزگاربونیان بیبەخشن و بیکەنە قوربانی:

﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الأَرْضِ لاَفْتَدَتْ بِهِ: بێبڕوای ستەمکار ئەگەر هەندی هەمو زەوی سامان و دارایی هەبێ؛ لە پێناو ڕزگاربونیدا دەیبەخشێ﴾یونس: ٥٤.

نەك هەندی زەوی، بەڵکو ئەگەر چەند قاتیش زیاتری لە زەوی هەبێ؛ هەر دەیبەخشێ:

﴿وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لاَفْتَدَوْا بِهِ أُوْلَئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ: ئەو بێبڕوایانەی وەڵامی پێغەمبەریان نەداوەتەوەو نەبونەتە موسڵمان ئەگەر هەمو زەوی و چەند جاری زەویشیان هەبێ دەیکەنە قوربانی ڕزگار بونیان، بێبڕواکان لێپرسینەوەیەکی خراپیان لەگەڵدا دەکرێ﴾ الرعد: ١٧.

تەنانەت ئامادەیە ئەگەر بە ئەندازەی زەوی زێڕ و زەبەری هەبێ بیکاتە قوربانی خۆی، بەڵام ئەگەر هەشی بێ خوای گەورە هەر لێی وەرناگرێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِمْ مِلْءُ الأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوْ افْتَدَى بِهِ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ: ئەوانەی بێبڕواییان کردوەو بە بێبڕوایی مردون ئەگەر بەقەد زەویش زێڕیان هەبێو بیبەخشن لێیان قبولْ ناکرێ. ئەو جۆرە کەسانە سزای بە ئازاریان دەدرێتێو کەسیش نیە یارمەتیان بدات.﴾آل عمران: ٩١.

لە صەحیحی بوخاریدایە کە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:

((يجاء بالكافر يوم القيامة فيقال له: أرأيت لو كان لك ملء الأرض ذهباً أكنت تفتدي به؟ فيقول: نعم. فيقال له: قد كنت سألتك ماهو أيسر من ذلك: لە ڕۆژی قیامەتدا بێبڕوا دێنن وپێی دەڵێن: ئەگەر بە قەد زەوی زێڕو زەبەرت هەبوایە دەتکردە قوربانی بۆ ڕزگاربونت؟ دەڵێ: بەڵێ. پێی دەڵێن: ئێ دەنا لە دونیادا ئەوەندەت لێ داوا نەکرابو))[1].

بێبڕواکان هەند پەرێشان و بێهومێد و تەنگەتاو دەبن تەنانەت خۆزگە دەخوازن خۆشەویستترین کەس و خزمیشیان بخەنە ناو ئاگر تا تەنها خۆیان قوتار ببن:

﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ، وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ، وَمَنْ فِي الأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ، كَلاَ إِنَّهَا لَظَى: هەمو دۆست و ئازیزێك پیشانی یەکتری دەدرێن، بێبڕوا حەز دەکا لەپێناو ڕزگاربونی خۆیدا کوڕو ژن و برا و ئەو هۆزەی دالدەی داوە و تەنانەت هەمو خەڵکی سەر زەوی بکاتە قوربانی خۆی، بەڵام شتی وانابێ! ئاگری دۆزەخ جێگایەتی کە ئاگرێکی بە بڵێسەو کڵپەدارە﴾المعارج:١١-١٥:

**پێنجەم**: ئەم ڕۆژە تا بڵێی ڕۆژگارێکی درێژو درێژخایەنە:

﴿تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، فَاصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلاً، إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا، وَنَرَاهُ قَرِيبًا: فریشتەو جوبرائیل بۆ لای خوا بەرز دەبنەوە لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە. ئینجا خۆت ڕابگرە ئەی موحەممەد بە خۆڕاگرتنێکی جوان. ئەو بێبڕوایانە ئەم ڕۆژە بەدور دەبینن بەڵام ئێمە بەنزیکی دەبینین.﴾ المعارج: ٤-٧.

لە ڕەوتی ئایەتەکەدا بەڕون و ئاشکاری دەردەکەوێ کە مەبەست لەو ڕۆژەدا ڕۆژی قیامەتە. بە ئیسنادێکی صەحیح لە ئیبنو عەبباسەوە سەلمێنراوە کە مەبەست لەم ڕۆژە ڕۆژی قیامەتە، حەسەن و زەحاکیش وایان وتوە.[1]

---

[1] النهاية لابن كثير: (١/٣٢٣)

**لەبەر درێژی ئەم ڕۆژە خەڵك وا دەزانن لە دنیادا تەنها بۆ ماوەی چەند سەعاتێك ژیاون:**

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ سَاعَةً مِنَ النَّهَارِ: **لەو ڕۆژەدا کە زندویان دەکەینەوە وا دەزانن تەنها بۆ ماوەی سەعاتە ڕۆژێك ژیاون.**﴾يونس: ٤٥.

**ئیبنو کەثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ:** ((**خوا ڕۆژی دوایی‌و کۆبونەوە بەبیر خەڵکی دێنێتەوە:** ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ...﴾ **وەکو دەفەرموێ:**

﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا: **بێبڕواکان کە ئەم ڕۆژە دەبینن وا تێدەگەن کە لە دنیادا تەنها ئێوارەیەك یان چێشتەنگاوێك ژیاون.**﴾ النازعات: ٤٦.

﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَبِثْتُمْ إِلاَّ يَوْمًا: **ئێمە دەزانین چەند ژیاون، دەمڕاستترین و ژیرترینیان دەڵێ: تەنها ڕۆژێك ژیاون!**﴾طه: ١٠٤

﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ: **لە ڕۆژی قیامەتدا بێبڕوا تاوانکارەکان سوێند دەخۆن و دەڵێن تەنها یەك سەعاتە ڕۆژ ژیاون.**﴾الروم: ٥٥.

**ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە ژیانی دنیا لە چاو ژیانی دواییدا گەلێ کورت و کەمخایەنە. وەکو دەفەرموێ:**

﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ، قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلْ الْعَادِّينَ، قَالَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً لَوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ: **لێیان دەپرسێ: لە دنیادا چەند ساڵ ژیاون؟ دەڵێن: ڕۆژێك یان سەعاتە ڕۆژێك، لە ژمێرکارانیش بپرسە. پێیان دەڵێ: ئێوە لە دنیادا کەمێك ژیاون ئەگەر بزانن.**﴾المؤمنون: ١١٢.[1]

[1] تفسير ابن كثير (٣/٥٠٥).

## جێباسی دووەم

# چەند ئەدگارێکی نارەحەتیەکانی قیامەت

قورئـانی پـیرۆز لـە زۆر جێگـەدا باسـی نارەحـەتی و کارەسـات و دیمەنـە سامناکەکانی ئەو رۆژە دەکات کـە چاو لـە بـەریدا ئەبڵـەق دەبـێ و دڵ لـە ترسـان دەلەرزێ و ناخ پێی دەتاسێ.

یـەکێك لـە نارەحەتیـە سـامناك و ترسـێنەرەکان وێرانبـون و تـەفروتونابونی سەرتاسەری گەردونـە، کـە زەوی و چیاکـان و ئاسمـان و ئەستێرەو خـۆر و مـانگ دادەگرێتەوە.

خوای باڵادەست پێمان ڕادەگەیەنێ کاتێك کە زەوی دوچاری بومەلەرزە دەبێو دەهەژێتەوە، چیاکان هەپرون بە هەپرون دەبن و دەریاکان یەك پارچە دەبنە ئاگر و ئاسمان شەق و پەق دەبێ و خۆر دەپێچرێتەوەو دەکوژێتەوە و مانگ تاریك دەبێ و ئەستێرەکانیش تارو مار دەبن شیرازەی گەردون هەڵدەوەشێتەوە.

لـێرەدا بەیارمـەتی پـەروەردگار ئـەو دەقانـە دێنینـەوە کـە باسـی دیمـەن و ئەدگارەکانی کارەساتەکانی ئەو ڕۆژە دەکات:

## خوازگەی یەکەم

## لە چنگگرتنی زەوی و پێچرانەوەی ئاسمانەکان

**خوا لە ڕۆژی دواییدا زەوی لە چنگ دەگرێو ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاست دەپێچێتەوە وەکو دەفەموێ:**

﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ: **ئەو بێباوەڕانە شان و شکۆ و ڕێز و هێزی خوایان نەناسیوە، خوا لە ڕۆژی دواییدا هەمو زەوی لە چنگ دەگرێ و سەرجەم ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاست دەپێچێتەوە، خوای تاك و تەنیا لە ورتەورتی بێباوەڕان پاك و دورە کە هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن.**﴾ الزمر:٦٧.

**لە جێگەیەکی تردا باسی چۆنیەتی پێچانەوەکەمان بۆ دەفەرموێ:**

﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ: **لە ڕۆژی دواییدا ئاسمان وەکو پێچانەوەی پەڕەکانی پەرتوك دەپێچینەوە. پاشان سەرلەنوێ بەدیدەهێنینەوە، بەڵێنێکە و جێبەجێی دەکەین.**﴾الأنبياء: ١٠٤.

**ئیبنو کەثیر دەڵێ: (صەحیحەکەی ئەوەیە کە ئیبنو عەبباس دەڵێ (السجل) بریتیە لە پەرتوك، عەلی کوڕی ئەبو تەلحەش وای گوتوە، عەوفیش لەوی گێڕاوەتەوە، هەروەها موجاهیدو قەتادەو هی دیکەش وایان وتوە، ئیبنو جورەیجیش ئەمەی هەڵبژاردوە چونکە لە زماندا هەر ئەو واتایە ناسراوە، کەواتە واتای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: لەڕۆژی دواییدا ئاسمانەکان وەکو پێچانەوەی پەڕی نوسراوی پەرتوکان دەپێچینەوە).[1]**

---

[1] تفسير ابن كثير: (٤/٦٠٢).

گەلێ فەرمودەی صەحیحیش لەم بارەوە هاتوە:

* لە فەرمودەیەکی (متفق علیه)دا ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((يقبض الله الأرض يوم القيامة ويطوي السماء بيمينه، ثم يقول: أنا الملك أين ملوك الأرض: لەرۆژی قیامەتدا خوا زەوی لە چنگ دەگرێ و ئاسمانیش بە دەستی ڕاست دەپێچێتەوە، پاشان دەڵێ: من خاوەن و پاشام، کوا پاشایانی سەر زەوی؟))[1].

* لە صەحیحی موسلیمدا عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((يطوي الله السموات يوم القيامة، ثم يأخذهن بيده اليمنى، ثم يقول: أنا الملك، أين الجبارون؟ أين المتكبرون: خوا لە ڕۆژی دواییدا ئاسمانەکان دەپێچێتەوە پاشان بە دەستی ڕاست دەیانگرێ و پاشان دەفەرموێ: من پادشام، کوانێ زەبرداران؟ کوانێ زلفیزان؟ پاشان بە دەستی چەپەی زەوی دەپێچێتەوە - لە بێژانەوەیەکیتردا دەفەرموێ: پاشان بە دەستەکەی تری دەیانگرێ پاشان دەڵێ: من پادشام، کوانێ زەبرداران؟ کوانێ خۆ بەگەورە زانان؟))[2].

* بوخاری لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە: جارێکیان جولەکەیەك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ((موحەممەد! خوا ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەك و زەمینەکان لەسەر پەنجەیەکیترو شاخەکان لەسەر پەنجەیەکیترو دارو درەختەکان لەسەر پەنجەیەکیترو بەدیهێنراوان لەسەر پەنجەیەك، پاشان دەفەرموێ: من پاشام. پێغەمبەر - ﷺ بۆ پشتیوانی قسەی جولەکەکە پێکەنی تا ددانەکانی پێشەوەی وەدیار کەوت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

---

[1] مشكاة المصابيح: (٥٣/٣) ژمارە: ٥٥٢٢.

[2] مشكاة المصابيح: (٥٣/٣) ژمارە: ٥٥٢٣.

﴿وما قدروا اللهَ حَق قَدْرِهِ والأرض جَمِيعًا قَبْضَتهُ يَـوْمَ القِيَامَـةِ والسَّـماوات نطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ: ئەو بێباوەڕانە شان و شكۆ و ڕێز و مێزی خوایان نەناسیوە، خوا لە ڕۆژی دواییدا هەمو زەوی لە چنگ دەگرێ و سەرجەم ئاسمانەكانیش بە دەستی ڕاست دەپێچێتەوە، خوای تاك و تەنیا لە ڕتەورتی بێباوەڕان پاك و دورە كە هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن.﴾الزمر:٦٧.[1]

خوای گەورە دوای ئەوەی بونەوەران لەناو دەبات ئەنجا زەوی لە چنگ دەگرێ و ئاسمانەكان دەپێچێتەوە. قیلێكیش هەیە دەڵێ: بەدیهێنراوان دوای ئەوەی لەسەر زەمینێكی كاكی بەكاكی سپی وەك زیودا كۆ دەكرێنەوە كە قەت گوناحی لەسەردا نەكراوە، ئەو كات خوا وا دەفەرموێ. ئەبو جەعفەر دەڵێ زەویەكە وەكو مسە، دەڵێ: فەرمودەكە صەحیحەو لە ئیبنو مەسعودیان گێڕاوەتەوە، لەوانەش نیە بە قیاس و ڕاتاوێڵی[2] وەربگیرێ.

قورتوبی دەڵێ: (وتەی یەكەم تاسەنگترە(أظهر) چونكە مەبەست دەرخستنی پادشایەتی خوایە لەو كاتەی كە كەشوفشی زەبرداران نامێنێ و ئاسەواریان دەبڕێتەوە، ئەو كاتی كە پاشاو پاشایەتی نامێنێ و هەمو زەبردارو خۆ بە گەورە زانان بەخۆ بە موڵكیانەوە لەناو دەچن، نەژادو جاڕدانیان دەبڕێتەوە.. ئەم لێكدانەوەیە تاسەنگترە).[3]

---

[1] صحيح البخاري كتاب التوحيد، فتح الباري (١٣/ ٣٩٣).

[2] ڕاتاوێڵ: تأويل

[3] التذكرة: ١٧٢.

## خوازگەی دووەم

## راتەکانی زەوی (دك الأرض) و وردوخاش و تەختبونی شاخەکان

خوای بالآدەست پێمان رادەگەیەنێ کە ئەو زەویەی ئێمە لەسەرین و شاخ و چیا چەسپیوەکانی‌لەرۆژی قیامەت هەڵدەگیرێ لەو کاتەی، کە فو بە کەڕەنا دەکرێ یەك جار پێکدا دەدرێ. جا دەفەرموێ:

﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ، وَحُمِلَتْ الأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِـدَةً، فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتْ الْوَاقِعَةُ: کە کەڕەنا فوێکی پێدا کرا و زەویو شاخەکان هەڵگیران وبە جارێك پێکدادران؛ ئەو رۆژە قەومانی گەورە دەقەومێ﴾ الحاقة: ١٣-١٥.

﴿كَلاَّ إِذَا دُكَّتْ الأَرْضُ دَكًّا دَكًّا: نەخێر، کە زەوی رادەهەژێ و دەهەژێتەوە﴾الفجر: ٢١.

لەو کاتەدا شاخەکان وەك لمی وردیلەیان لێدێت، وەکو دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتْ الْجِبَالُ كَثِيبًـــا مَـــهِيلاً: لە رۆژی دواییدا زەوی و شاخەکان دێنە لەرزین و هەژانەوە، شاخەکان دەبنە گڵمتە لمێکی کەڵەکە بو کە ئەگەر هەندێکی لەبنارەکەیەوە لێ رادرێ ئەوانی سەرەوە سەربەرەو ژێر دادەڕمێن.﴾المزمل: ١٤.

لە ئایەتێکدا دەفەرموێ چیاکان وەکو خورییان لێدێت، یان لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ وەکو خوری شیکراوەیان لێدێت:

﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ: چیاکان لە رۆژی دواییدا وەکو خورییان لێدێت.﴾المعارج: ٨.

﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِـــهْنِ الْمَنفُـــوشِ: چیاکان لە رۆژی دواییدا وەکو خوری شیکراوەیان لێدێت﴾ القارعة: ٥.

پاشان خوای بالآدەست ئەم شاخانە لەشوێنی خۆی لا دەدات و تەختیان دەکات، بەڵکو تەواوی سەر ڕوی زەوی تەخت دەکات و هیچ دوند و لەند و هەرد و

**هەڵەتی لەسەردا نامێنێ. خوای گەورە لە قورئاندا ڕادان و لەخشاندنی شاخەکانی جارێك بە هەڵقەراندن و وەك تۆز بە حەوادا پەرشکردن وەسف کردوە، جارێکی تریش بە تەختکردن:**

﴿وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ: **کە چیاکان هەڵقەراندران و وەکو تۆز بە حەوادا پەرش کران.**﴾ التكوير: ٣.

﴿وَسُيِّرَتْ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا: **شاخەکان هەڵقەندران و لەشوێن و بناری خۆیان لادران و بون بە تراوکە**[1]﴾ النبأ: ٢٠.

﴿وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ : **کە شاخەکان وردوخاش کران.**﴾ المرسلات: ١٠.

**پاشان خوای گەورە باری زەوی دوای لادان و بەتۆز بونی چیاکان و تەخت کردنیان بۆ ئێمە ڕون کردۆتەوەو دەفەرموێ:**

﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ وَتَرَى الأَرْضَ بَارِزَةً﴾ الكهف: ٤٨.

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا، فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا، لاَ تَرَى فِيهَا عِوَجًا وَلاَ أَمْتًا: **بێبڕواکان بە تەوسەوە لە حاڵی شاخەکان دەپرسن ئاخۆ لە ڕۆژی دواییدا چیان لێدێت؟ پێیان بڵێ: خوای گەورە هەر هەمویان وردوخاش و تەخت دەکات ئیتر زەوی دەبێتە خاکێکی کاکی بە کاکی و نە کەندو نە لەندی لەسەردا نامێنێ**﴾ طه: ١٠٥-١٠٧.

---

[1] تراوکە: تراوێلکە، سراب

## خوازگەی سێیەم

# تەقینەوەو هەڵگیرسانی دەریاکان

**ئەو دەریا فرەوان و پان و پۆڕو قوڵانەی کە زۆرینەی زەوییان داگرتوە، کە جۆرەها گیانەوەرو دنیایەك حەشاماتیان لە هەناودا دەژیێ، کە کەشتی و گەمیە زەبەلاحەکانیان بەسەردا گوزەر دەکات.. لەو ڕۆژەدا سەرجەمیان هەڵدەشێوێن و دەتەقنەوە!. لەم سەردەمەدا زانیومانە کە تەقینەوەی گەردیلە چ کارەساتێکی ناوەتەوە و چ ناخۆشیەکی گەورەی هەڵایساندوە، ئەدی ئەگەر گەردیلەکانی ئاو بتەقنەوە کە لە گەردیلەکەیتر گەورەترن ئەوا هەر خوا بزانیێ! چ ڕوبدات !.. ئەگەر ئەم هەمو دەریاو ئۆقیانوسانە لێکرا هەڵبگیرسێن و بڵێسەو کڵپە بەرەو ئاسمانیێ هەڵبکەن! دەبێ چ دیمەنێکی سامناك بێنێتە ئاراوە؟**

**خوا دەفەرمویێ:**

﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ: **کە دەریاکان تەقینەوە**﴾ الأنفطار: ٣.

﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ: **کە دەریاکان هەڵگیرسان.**﴾ التكوير: ٧.

**تەفسیرزانەکانی پێشان واتای تەفجیری دەریاکانیان وا لێکداوەتەوە کە ڕۆخ و کەنارەکان شەق دەبن و لەمپەری نێوانیان نامێنیێ و تاڵ و سوێرەکان تێکەڵ دەبن تا سەرجەمیان دەبنە یەك دەریا.[1] بەڵام لێکدانەوەکەی ئێمە بۆ وشەی تەفجیر و تەسجیر لەواتای ڕاست نزیکترە، خواش زاناترە.**

---

[1] تفسير الآلوسي: (٣٠/٦٣).

## خوازگەی چوارەم

## جمین و شەقبونی ئاسمان

ئاسمانی شین و جوان کە دڵ شەیدا دەکات و سۆمای چاو زاخاو دەدات، ئەو دیمەنە دڵڕفێنە، ئەو ئاسمانە بەرگوشادە[1].. لە ڕۆژی دواییدا شیرازەکەی تێکدەچێت و وەکو شەپۆل جمە دەدات:

﴿يَوْمَ تَمُورُ السَّمَاءُ مَوْرًا﴾ الطور:٩.

پاشان لەبەر یەك هەڵدەوەشێتەوەو شەق و پەق و لەت و پەت دەبێ:

﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ﴾ الأنفطار: ١.

﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ، وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾ الأنشقاق: (١-٢).

پاشان کە شیرازەکەی تێکچو و شەق و پەق بو، بێهێزو لەرزۆك دەبێ، وەکو بالاخانەیەکی گەورەو پتەو و تۆکمە کە ئەگەر بومەلەرزە لێی بدات:

﴿وَانشَقَّتْ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾ الحاقة: ١٦.

هەروەها ڕەنگە شینە دڵڕفێنەکەشی نامێنێ و بە جۆرەها ڕەنگ دەگۆڕێ، جارێك دەبێتە سۆرێکی تۆخ، جارێك زەرد، جارێك کەسك (سەوز)، جارێك شین هەروەکو خوا دەفەرموێ:

﴿فَإِذَا انشَقَّتْ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ: کە ئاسمان شەق بو و سور هەڵگەڕا﴾الرحمن:٣٧.

لە ئیبنو عەبباسیان گێڕاوەتەوە وتویەتی: ئاسمان لەو ڕۆژەدا وەکو گوڵی فەرەسی لێدێت، کە بەغەوی دەڵێ: گوڵی فەرەس لە بەهاران زەرد دەبێ و لە زستانان سۆر دەبێ، کە هەواش زۆر سارد دەبێ ڕەنگی دەگۆڕێ. حەسەنی بەسرایی دەڵێ: وردة کالدهان واتە دەبێتە چەند ڕەنگێك.[2]

---

[1] بەرگوشاد: بەرفرەوان.

[2] تفسیر ابن كثير: (٦ / ٤٩٤).

## خوازگەی پێنجەم

# پێچانەوەی خۆر و تاریکبونی مانگ و پەرش و بڵاو بونی ئەستێرەکان

**ئەو خۆرە جوان و گڕدارەی کە گزنگەکانی هەمو بەیانیەك گزنگەکانی دەپەخشێنێ، کە زەوی ڕوناك و پڕ ڕەنگ دەکات و وزەو زیوە[1] بە مرۆڤ و دارو درەخت و جانەوەران دەبەخشێ.. ئەو خۆرە شۆخ و شەنگە! ، لەو ڕۆژەدا بەرەبەرە کۆدەکرێتەوەو دەپێچرێتەوەو ڕوناکیەکەشی هێدی هێدی کز دەبێ تا دەکوژێتەوە، خوا دەفەرموێ:**

﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ التكوير: ١، **تەکویر لە زمانی عەرەباندا بە واتای بەسەر یەك کۆکردنەوە دێت، (تکویر العمامة: پێچانەوەی مەندیل)یش هەر ئەم واتایەی پێمەبەستە.**

**مانگی درەخشان و تریفەداریش کە لە ڕۆژی یەکەمدا سەر دەردێنێ هێدی هێدی گەش دەبێتەوەو جوانی خۆی وەدەردەخات، تا دەگاتە ئەوپەڕی جوانی. ئەو مانگەی بۆتە هێمای شعرەکان و هاودەمی ڕێبوارە ماندوەکانە و شەکەتییان دەهەسێنێتەوە.. لەو ڕۆژەدا ئەو مانگە شۆخە ڕوناکی نامێنێ‌و تاریك دەبێ:**

﴿فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ، وَخَسَفَ الْقَمَرُ﴾ القيامة: ٧-٨.

**ئەستێرە بریسکەدارەکان کە شەوەزەنگی ئاسمانیان سمیوەو غوربەتی تاریکیان بە تروسکە ئەفسوناویەکان تاراندوە  ئەو ئەستێرە گەشانە! لەو ڕۆژەدا پەرش و بڵاو دەبن و هەڵدەوەرێن و دەکەونە خوارەوە:**

﴿وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ: **کە هەسارەکان پەرش و بڵاوبونەوە**﴾ الأنفطار:٢.

﴿وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ: **کە ئەستێرەکان هەڵوەرین و کەوتنەخوارەوە**﴾ التكوير: ٢.

---

[1] زیوە: جوڵەی بەهێز

## خوازگەی شەشەم

# تەفسیری قورتوبی بۆ ئەو ئایەتانەی کە لە بارەی ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەتەوە دەدوێن

قورتوبی دەڵێ: ((تیرمذی لە ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوەی حەزکا تەماشای ڕۆژی قیامەت بکات با ئەم سورەتانە بخوێنێ: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾التكوير:١، ﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ﴾الأنفطار:١، ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾الأنشقاق:١ وتویەتی: فەرمودەیەکی حەسەنە.[1]

ئەم سێ سورەتە پتر بەڕۆژی قیامەت تایبەتن چونکە باسی شەقبونی ئاسمان و پێچرانەوەو کوژانەوەی خۆرو هەڵوەرینی ئەستێرەکان و زۆر کارەسات و پەرژەنگیتر دەکات. هەروەها باسی دەرچونی بەدیهێنراوەکان لە گۆڕەکانیانەوە بۆ گرتوخانەکانیان یان کۆشك و تەلاریان دەکات و باسی وەرگرتنەوەی کارنامەکان و خوێندنەوەی پەڕتوکەکانیان بە دەستی ڕاست و چەپ دەکات، هەروەکو خوا دەفەرموێ:

﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾، ﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ﴾، ﴿وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاءُ بِالْغَمَامِ﴾ الفرقان:٢٥.
ئیتر ئاسمان لەق و لۆق و شەق و پەق دەبێ: ﴿وَفُتِحَتْ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَابًا﴾النبأ:١٩.
هەورە(الغمام)ەکە دەبێتە پەردەی نێوان ئەرزو ئاسمان، قیلێکیش دەڵێ: (بێ)یەکە بە واتای (عن) دێت، واتە ئاسمان لە هەورێکی سپیدا شەق دەبێ. وتوشیانە: شەقبونەکە لەبەر ئەوەیە چونکە تاو و تینی دۆزەخی دەگاتێ، ئەوەش لەو کاتەی ئاو نامێنێ و ئاگر وەدەر دەکەوێ، یەکەمجار ئاسمان سور هەڵدەگەڕێ ئەنجا بەو جۆرە شەق دەبێ کە خوا دەیەوێ ئەم جیهانە هەڵوەشێنێتەوەو نەیهێڵێ.

---

[1] حديث صحيح رواه الترمذي والحاكم وأحمد. تەماشای (صحيح الجامع) (٣/٣٠١) ژمارە٦١٩١ بکە.

هەیە دەڵێ: ئاسمان بە زۆر ڕەنگ دەگۆڕێ: زەرد دەبێ پاشان سور دەبێ پاشان زەرد دەبێتەوە، وەکو بەری زڕکە تاڵ(گوژاڵك)ی لێدێت کە لە بەهاراندا مەیلەو زەرد دەبێ، کە دنیاش زۆر گەرم دادێت مەیلەو سور دەبێ پاشان ڕەنگێکی خاکی وەردەگرێ. ئەلحولەیمی وای وتوە.

ئیبنو عەبباس ﷺ لە بارەی تەکویرەکەی ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾دا دەڵێ: واتە دەچێتە ناو عەرش، هەروەها وتویانە: واتە سافیەکەی نامێنێ، ئەلحەسەن و قەتادە وا دەڵێن. هەروەها لە ئیبنو عەبباس و موجاهیدیشیان هەر ئاوها گێڕاوەتەوە.

ئەبو عوبەیدە دەڵێ: ﴿كُوِّرَتْ﴾ وەکو پێچرانی مەندیل لول دەخواتەوەو پاشان نامێنێ. ڕوبەییعی کوڕی خەیثەم دەڵێ (كُوِّرَتْ) واتە فڕێ درا، کە دەڵێن (كَوَّرْتَه فَتَكَوَّرَت) واتە بەربۆوە. منیش دەڵێم تەکویر لە بنەڕەتدا کۆکردنەوەیە، لە پێچان و بەستنی مەندیلدا وەرگیراوە، خۆر دەپێچرێتەوە پاشان ڕوناکیەکەی نامێنێو دەکوژێتەوە پاشان توڕ دەدرێ. خواش زاناترە.

هەروەها کە دەفەرموێ ﴿وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ﴾: واتە پەرش و بڵاوبونەوە، وتویانە لە دەستی فریشتان بەردەبنەوە چونکە ئەوان دەمرن. لە خەبەردا هاتوە ئەم ئەستێرانە لە نێوانی ئەرزو ئاسماندا فریشتەکان بە زنجیر گرتویانە.

ئیبنو عەبباسﷺ دەڵێ: انكدرت واتە گۆڕا؛ بنەڕەتی (انكدرت)یش هەڵڕژانە، ئەنجا ئەستێرەکان بەردەبنەوە ناو دەریاکان و لەگەڵ واندا دەبنە ئاگر، ئەگەر ئاو نەما.

﴿وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ﴾ هەمان واتایە کە دەفەرموێ ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ﴾ واتە لە دۆخی بەردایەتیەوە دەگۆڕێو دەبێتە لم و وردە زیخی هەڵڕژاو و وەکو خوری لێدێت، دەبێتە تۆزی پەرش وبڵاو، دەبێتە تراویلکە(سراب) کە تراویلکە هەقیقەتی نیە. هەندێ وتویانە: شاخەکان دوای هەڵقەران و بەیەکدا کەوتنیان لەبەر گەرمی دۆزەخ وەکو خوریيان لێدێت، هەروەك چۆن ئاسمانەکان لەبەر گەرمی وەکو ڕونی قرچاوەیان لێدێت. ئەلحولەیمی وایگوتوە. ئەمەش چونکە ئاوی زەوی بەربەستی نێوان ئەرزو ئاسمانە، جا کە بەرز دەبێتەوە، گەرمی دۆزەخیش بە تینتر دەبێ ئیتر

ئەم کارەساتە دەنێتەوە. خواش زانا ترە.

﴿وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾ التكوير: ٤ واتە: خەڵکەکە لەبەر مشاوەشی فەرامۆشی دەکەن. (العشار) واتە وشتری ئاوس، تاکەکەی (عشر)ـە، کە بە وشتری ئاوسی دە مانگی دەڵێن تا دەزێ و لەدوای زانیش هەر وای پێدەڵێن. بۆیە لێرەدا تەنها (العشار)ی هێناوەتەوە چونکە خۆشەویسترین جۆرە وشترە لە لای عەرەبەکان، ئەم ئایەتە ڕایدەگەیەنێ کە لە ڕۆژی دواییدا فەرامۆش دەکرێ. واتاکەی بەم جۆرەیە: کاتێك لە گۆڕەکانیان زندو دەکرێنەوەو یەکتری دەبیننەوە، جروجانەوەرو گیانەوەرانیش بە زندوکراوەیی دەبینن، وشترەکانیشیان دەبینن بەڵام بە تەنگیانەوە ناچن و مشوریان ناخۆن. ڕەنگە ئەو واتایەش هەڵگرێ کە خوایگەورە خاوەندارێتی ماڵ و سامانی لەخەڵك لەکارخستوە و خاوەندارەکان کە ماڵ و سامانیان دەبینن ناتوانن وەچنگی بخەنەوە. هەیە وتویەتی العشار هەورە، ئیتر لە کاردەکەوێ و نابارێنێ، هەیە وتویەتی العشار خانوبەرەیە کە ئیتر کەس تێیدا نابێ، هەیە دەڵێ: زەوی و زاری کشتوکاڵییە کە ئیتر کشتوکاڵی تێدا ناکرێ. بەڵام وتەی یەکەم لە هەر هەمویان ناسراوترەو رای زۆربەی زانایانیش وایە.

﴿وإذا الوحوش حشرت﴾ التكوير: ٥: واتە کۆکراوە، حەشر واتە کۆکردنەوە، کە لە پێشتردا واتاکەی باسکراوە. ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ التكوير: ٦: واتە کە دەریاکان هەڵگیرسان و بونە ئاگر، ضەحاك وای لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە. قەتادەش دەڵێ: واتە ئاوەکەی ڕۆچۆ و نەما. حەسەن و ضەحاك دەڵێن واتە: هەڵچو. ئیبنو ئەبی زمنین دەڵێ: واتە پڕبو، هەمو دەریاکان تێکەڵ دەبن و دەبنە یەك دەریا ئەم وتەیە هەمان واتای وتەکەی حەسەنیشە. وتویانە کە خۆر دەپێچرێتەوە پاشان فڕێ دەدرێتە ناو دەریاکان، ئەوجا دەریاکان گەرم دەبن و دەبنە ئاگر. ئەلحولەیمی دەڵێ: ئەگەر وابێ ڕەنگە ئەوەی تەسجیری بە پڕبون راڤە کردبێ ئەوا ئاگرەکە زێتر دەبێ چونکە خۆر بە چەندین کەڕەت لە زەوی گەورەترە جا ئەگەر پێچراوەو فڕێ درایە نێو دەریا دەبێتە ئاگرو پڕاییەکەی پتر دەبێ.

﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ التكوير: ٧ حەسەن وا تەفسیر دەکات کە هەمو هاوڕێبازێك

دەگاتــەوە هاوڕێبازەکــەی: جولەکــە و جولەکــە، دیــان و دیــان، ئاگرپەرســت و ئاگرپەرست، ئەوانەی جگە لە خوا شتی تریان پەرستوە، دوڕو و دوڕو، بڕوادار و بڕوادار. عیکریمە دەڵێ: واتە نەفسەکان دەگەڕێنەوە نێو جەستە. هەروەها گوتیانە: واتە گومڕا بە گومڕاکەرە شەیتانەکەی یا مرۆڤەکەی دەگاتەوە. هەروەها وتویانە: بڕواداران دەگەنە لای پەرییەکان و بێبڕواکانیش بۆ لای شەیتانەکان.

﴿وَإِذَا الْمَوْءودَةُ سُئِلَتْ﴾ التكوير:٨ واتە کە کیژۆڵە زندە بەچاڵکراوەکانی سەردەمی نەفامێتی لێیان دەپرسرێتەوە. بێبڕواکانیش لەبەر دو هۆ کیژۆڵەکانیان زندەبەچاڵ کــردوە یەکــەم: دەیــانگوت فریشــتەکان کچــی خــوان، دوەم: لەبــەر ترســی بژێــوی و نەبونی.

پرسـیار لێکردنەکـەی زنـدە بـە چاڵکراوەکـان بـە مەبەسـتی سەرزەنشـتکردنی بکوژەکانە. وەك ئەوە وایە کە بە منداڵێك دەگوترێ: بۆ لێیدای؟ چت کردبو؟ حەسەن دەڵێ: خوا مەبەستی ئەوەیە بکوژەکە سەرکۆنە بکات چونکە هەر لە خت و خۆڕایی کیژۆڵـەی بەسـتەزمانیان ژێـر خـۆڵ کــردوە. هــەندێك بــەمجۆرەیان خوێندۆتــەوە : ((وَإِذَا الْمَوْءودَةُ سَأَلَتْ)): کیژۆڵەکە ئاوقـەدی بـاوکی دەبـێ و دەڵـێ: بـۆچ کوشـتمت؟ هــەندێك وتویانــە (سُئِلَتْ) واتــە لــە بارەیــەوە دەپرســرێ وەکــو چــۆن فەرمویــەتی : ﴿إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً﴾ الإسراء: ٣٤.

﴿وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾التكوير:١٠ واتە کە کارنامەکان بڵاوکرایەوە بۆ لێپرسینەوە، دوایێ باسی دێت. ﴿وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ﴾التكوير:١١ واتـە کـە ئاسمان پێچرایەوە هەروەکو خوا فەرمویەتی: ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾الأنبياء:١٠٤ واتە وەکو پێچرانـەوەی ڕوپــەڕەکانی پــەڕتوك. لـێرەدا (لام)ەکـە بـە واتـای (علـى) دێـت، دەڵێن: (كشطت السقف) واتە هەڵکەندرا، کەواتە واتاکەی پێچرانەوە بە هەڵکەندن دێت. خواش زاناترە. (كشط) و (قشط) هەمان شتن کە هەڵقەراندنە. وتویانە: سجل نوسـەرێکی پێغەمبـەر ﷺ بوە بـەڵام نـەزانراوە نوسـەری نـاو سـجل لـەناو یـاوەراندا هەبێ.

﴿وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ﴾ التكوير: ١٢ واته دۆزەخ هەڵکرا ﴿وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ﴾التكوير:١٣ كە بەهەشت لە بەهەشتیەکان نزیك خرایەوە. ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا أَحْضَرَتْ﴾التكوير:١٤ هەموو کەسێك دەزانێ چی کردوە. وەکو ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ وأَخَّرَتْ﴾.

یەك لەو شیعرانەی کە لەبارەی ناخۆشیەکانی ڕۆژی قیامەتدا وتراوە دەڵێ:[١]

| | |
|---|---|
| مثل لنفسك أيها المغرور | يوم القيامة والسماء تمور |
| إذا كورت شمس النهار وأدنيت | حتى على رأس العباد تسير |
| وإذا النجوم تساقطت وتناثرت | وتبدلت بعد الضياء كدور |
| وإذا البحار تفجرت من خوفها | ورأيتها مثل الجحيم تفور |
| وإذا الجبال تقلعت بأصولها | فرأيتها مثل السحاب تسير |
| وإذا العشار تعطلت وتخربت | خلت الديار فما بها معمور |
| وإذا الوحوش لدى القيامة احشرت | وتقول للأملاك أين تسير |
| وإذا تقاة المسلمين تزوجت | من حور عين زانهن شعور |
| وإذا الموؤدة سئلت عن شأنها | وبأي ذنب قتلها ميسور |
| وإذا الجليل طوى السماء بيمينه | طي السجلّ كتابه المنشور |
| وإذا الصحائف نشرت فتطايرت | وتهتكت للمؤمنين ستور |
| وإذا السماء تكشطت عن أهلها | ورأيت أفلاك السماء تدور |
| وإذا الجحيم تسعرت نيرانها | فلها على أهل الذنوب زفير |
| وإذا الجنان تزخرفت وتطيبت | لفتى على طول البلاء صبور |
| وإذا الجنين بأمه متعلق | يخشى القصاص وقلبه مذعور |
| هلا بلا ذنب يخاف جنينه | كيف المصر على الذنوب دهور |

[١] التذكرة: ٢١٤.

## خوازگەی هەفتەم

## ئەلموحاسبی دیمەنی ناخۆشیەکانی ڕۆژی قیامەت دەخاتە بەرچاو

حاریثلموحاسبی (بەر میهری خوا بێ) لە وەسفی کارەسات و پەشێوی ئەم ڕۆژەدا دەڵێ:

((کە بەدیهێنراوان هەر هەمو مردن و ئەرزو ئاسمان بوە چۆڵەوانیو کەسیان تێدا نەما و لە پاشی ئەو هەمو جولەو خرۆشانەدا خامۆش بون و سرەوتن، چرپەش نابیسترێ و هیچ کەسێك نابینرێ و تەنیاو تەنیا خوای بەرزو بالادەست دەمێنێ. پاشان لە ناکاوێك گوێت لە بانگی کۆبونەوە دەبێ، ئەتۆش سای بەدیهێنراوان بە زەبونی و ناگزوریەوە بەرەو پیری بانگەکە دەچی. بێنە بەر چاوت ئەو بانگە چتۆ تاو و داتروسکانێك[1] دەخاتە نێو گوێچکەو عەقڵتەوە، بە عەقڵت تێدەگەی کە تۆ بانگ دەکرێی بۆ بەردەم پاشای هەرەبەرز کە خوایە.. دڵت دادەخورپێ، سەرت سپی سپی دەبێ، چۆن وا نابێ؟ بانگ بانگی کۆبونەوەیە بۆ لای خوای مەزن و خاوەن مەزناتی. ئەتۆ کە لە ناو گۆڕ دای و گوێت لە قیژەو زایەڵەی ئەو بانگە دەبێ هەر دەزانی بانی گۆڕەکەت شەق دەبات و دێیتە دەرەوەو سەرتاپات لە خۆڵێ گەوزاوەو لەسەر پێ وەستاوی و چاوت بڕیوەتە جێ دەنگەکە، ئاپۆرەی بەدیهێنراوانیش یەکڕاست لەگەڵ تۆدا زندو بوینەوە و بە لەش و لاری خۆڵاویەوە قیت بوینەوە.

بێنە بەرچاوت کە ئەم هەمو خەڵکە یەکجێ قیت دەبنەوە چتۆ سام و ترس پەیدا دەکات، بیر لەو خەم و خەفەت و حەژمەتانە بکەوە کە توشی تۆی ناگزور و ڕوت و تەنیا دەبێ، سای خەڵك ڕوت و قوت و پێپەتیو بێدەنگ و ترساو و تاساو و کاسی، جگە لە ترپەی پێ چ نابیستی و بە ترس و لەرز و بەپەلەو خێراییەوە لەگەڵ خەڵك و

---

[1] داتروسکان: داخورپان، راجڤڵین

لەگەڵ حەشاماتی مرۆڤ و جنۆکەی ڕوت و قوتدا بەرەو جێدەنگیێ دەچن، هەڵبەت ستەمکارو خاوەن زەبرو زەنگەکان لە هەمو خەڵك زەبونتر و ڕیسواترن.

پاشان دڕندە و کێوییەکانی نێو شاخ و کێوان بە پێچەوانەی توندوتیژی دنیایان سەرشۆڕو سەرکز لە دواوەی ئەم خەڵك و ئاپۆڕەوە دەوەستن. ئەو شەیتان و ئەهریمەنە نەگریس و نەگبەتانەی بە درێژایی ڕۆژگار خەڵك و مەردومیان لە خشتە بردوەو لە خوایان هەڵگەڕاندۆتەوە، هەمویان بە سەرشۆڕیو شەرمەزاری کۆ دەبنەوە.

کاتێك کە جیهانیەکان؛ مرۆڤ و جنۆکەو شەیتان و دڕندەو کیوییەکان و مەڕو ماڵات و جرۆجانەوەرو مارو مێروان لە گۆڕەپانی لێپرسینەوە کۆکرانەوەو ڕیزیان گرت. ئیتر ئەستێرەکانی ئاسمان هەڵدەوەرێن و ڕۆژو مانگ دەکوژێنەوەو زەوی دەبێتە شەوەزەنگی تونەك و تاریکستان، تۆ بە چاوی خۆت ئەم کارەساتانە دەبینی، پاشان ئەم ئاسمانە توند و پوند و بەهێزە کە بەرینیەکەی پێنج سەد ساڵە ڕێیە شەق دەبات، ئاخۆ چ شریخەو خرچەیەکی هەبێ، پاشان فریشتەکان لە کەنارە شەقبوەکانی ئاسمان ئاپۆرە دەبەستن، چۆن لەو کارەساتە دەڕوانی کە ئاسمان شەق دەبات و خوا وەکو زیوی تواوەی لێدەکات، کە لە ترسی ئەم ڕۆژەدا زەرد هەڵدەگەڕێ، هەروەکو خوای مەزن و باڵادەست دەفەرموێ :

﴿فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ﴾ الرحمن: ٣٧

﴿يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاءُ كَالْمُهْلِ، وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ﴾المعارج:٨-٩.

پاشان ئەم فریشتە زەبەلاح و ترسناك و دەنگ گەورانە دادەبەزنە گۆڕەپان و دەست لەسەر سنگ چاوەنۆڕی فەرمانی خوان.

بیر لەو دابەزینە بکەوە ئەو هەمو فریشتە مەزن و زەبەلاحانە کە لە هەورێدا بێنە خوارەوە چ ترس و سامێك دەخاتە نێو دڵ، خەڵك دەپرسن خواتان لەگەڵە؟ لە ترسی وەی نەخۆ لە گەڵیان بێ ناوێرن وەڵام بدەنەوە بەڵام پاشان دەڵێن: پاکی بۆ پەروەردگار لە گەڵمان نیە بەڵام وا دێت، بیر لەوە بکەوە ئەو هەمو فریشتە

زەبەلاحانە باڵیـان کردبێتـەوەو سـەریان کزکردبـیٚو دەوری بەدیـهێنراوانیان دابـیٚ، چاوەڕێی فەرمانی خوابن! ئیتر تا ئاسمانی حەفتەم ئاوەهابیٚ.

کە خەڵکانی هەر حەفت ئەرزو ئاسمانان کۆکرانەوە تـاوی دەسـاڵی گـەرمای ڕۆژ خـەڵك دەگرێتـەوەو خـۆر بـەرزی کـەوانێك یـان دو کـەوان لەسـەر سـەریان نزیـك دەبێتـەوە، هیچ سێبەرێك نیە جگە لـە سێبەری بارەگـای خـوا، خـەڵکی ژێـر سـێبەر ئارام و هەسـاوەن و ئەوانی تریش لەبەر تـاوی گـەرمی ڕۆژیٚ خەریکـە بتوێنـەوە و وەڕس و بـێزار و پەشـێو و پەرێشـانن. پاشـان خـــەڵك قـەرەباڵغی دەکـەن و یـەکتر پاڵەستۆ دەدەن و لەبەر تینوێتـی خـەریك دەبیٚ بخنکێن و تەنگە نەفەس دەبن، بـە گوێرەی کردەوەکانیان لەنێو ئارەقەدا نقوم دەبن، هـی وا هەیـە تا گۆزینـگ و هـی وا هەیە هەتا ئەژنۆ و هی وا هەیە تا ناو قـەدو تـا بنا گویٚو گـەردەنی نغرۆ بوە، هەیە هێندەی نەماوە لە ئارەقە نقوم بیٚ.

ئیبنو عومەر ﷺ دەڵیٚ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا پیاو (یان بێبڕوا) هەیە تا بنا گوێی لەناو ئارەقەکەیدا نغرۆ بوە لەبەر درێژی ڕاوەستان)).

عەبدوڵلا ﷺ بە مـەرفوعی دەڵـیٚ: پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: ((بێـبڕوا لـە ڕۆژی قیامەتدا تا بنا گوێی دەچێتە ناو ئارەقەکەی چونکە ڕۆژگارێکی تا بڵێی درێژە (عەلی دەڵیٚ: لەبەر درێژی وەستانەکەی) تا دەگاتە ئەوپەڕی بێزاری و دەڵـیٚ: خوایـە ئەگـەر بۆ ئاگریش بیٚ بەس لەم ڕەوشەم ڕزگار بکە)).

ئەتۆش یەکێکی لەناو ئەم خەڵکـەدا، بێنـە بـەرچاوت لـەناو خـەم و ئارەقـەدا نقوم بوبی و لەبەر ئارەقەو ترس و بێزاری توشی چتۆ پەرێشـانی دەبی، بێنـە بـەر چاوت لەناو هەمو خەڵکان تۆ یەکێکیو چاوەڕێی بڕیاری دۆزەخ یان بەهەشت دەکەی، ئـەو هـەمو ئەسـتەم و شـڕو پەشـێویە تـا ڕۆژگـارێکی درێـژ بەردەوامـەو سـەرجەم خـەڵك بێدەنگ و ماتە.

قەتادە یان کەعب لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ دەڵیٚ: خەڵك ماوەی سیٚسەد ساڵان ڕادەوەستن، دەڵیٚ: گویٚم لێبو حەسەن دەیگوت: چۆن تێدەگـەی؟ کـە لـەو ڕۆژەدا خـەڵك پـەنجا هـەزار سـاڵ لەسـەر پـیٚ ڕادەوەستن

بێئەوەی پاروە نانێك یان فرە ئاوێکیشیان لە گەرودا بچتە خوارەوە. هەر ئەوەتە نیە لە تینوێتیان بخنکێن و لە برسان هەناویان بسوتیٚ. ئەنجا بەرەو ئاگری بڵێسەدار و هەڵم و هالاوی دۆزەخ راپێچیان دەکەن و ئاوی کولاویان پیٚدەخۆنەوە.

ئینجا لەو گۆڕەپانەدا کە تەواو تەواو پەشۆکاو دەبن و لە بەرگەیاندا نامێنیٚ هەندێك دەڵێن ئاخۆ کەس هەبیٚ تکامان بۆ بکات تا خوا لێپرسینەوەمان لە گەڵدا بکات تا یان بۆ دۆزەخ یان بۆ بەهەشت بچین؟ بەس دەمانەویٚ لەو ئەشکەنجەیە رزگار بین. ئەوجا دەچنە لای ئادەم و نوح و ئیبراهیم و موساو عیسا، هەر هەمویان دەڵێن: ناوێرین چونکە ئەمڕۆ خوا وەها تورە بوە کە قەت لەمەوپێش وەها تورە نەبوە. بۆیە کەس لەبەر خۆی ناتوانیٚ تکاخوازی بۆ خەڵك بکات. ئەوەیە کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا﴾.

بێنە بەرچاوت کە هەمو خەڵك هەمویان بە یەك دەنگ بڵیٚ: نەفسی نەفسی. تەنها ئەو وتەیەت گویٚ لیٚ دەبیٚو هیچیتر. ئای لەو رۆژە ترسناکە کە تۆ لە گەڵیان دەڵێیەوە نەفسی نەفسی، بەلاتەوە گرنگە کە لە سزاو ئازاری خوا رزگار ببی.. بێنە بەرچاوت ئەم هەمو پێغەمبەرە پلە بەرزو بەرێزانە ئیبراهیم، ئادەم، نوح، موسا، عیسا، ئەوان لەترسی تورەیی خوا بڵێن نەفسی نەفسی ئاخۆ تۆی بەستەزمان و پرگوناح رەوش و ترست چۆن بیٚ؟ ئیتر کە خەڵك لە تکاخوازی پێغەمبەرەکان دڵسارد دەبن دەچنە لای سەروەری پەیامبەران؛ موحەممەد ﷺ و داوای تکاخوازی لیٚ دەکەن، ئەویش وەلامیان دەداتەوە و پاشان دەچێتە لای پەروەردگارو ئیزنی لیٚ دەخوازیٚ و سوژدەیەك بۆ خوا دەبات و بە هەرچیەکی خوا مەبەستی بیٚ ستایشی خوا دەکات. ئەتۆو خەڵکیش هەر هەمو ئەو دیمەن و وتانە دەبینن و دەبیستن، ئەوجا خوا تکاکەی گیرا دەکات و بڕیاری لێپرسینەوە دەدات تا لە کردەوەی خەڵکان بپرسێتەوە.[1]

---

[1] كتاب التوهم والأهوال: لاپەرە:٥.

بەندی هەشتەم

# ڕەوشی خەڵک لە ڕۆژی قیامەتدا

هەڵبەت لەو ڕۆژەدا ڕەوش(حاڵ)ی خەڵك لەگەڵ یەكتری جیاوازە، ئێمە لێرەدا ڕەوشی سێ جۆرە كەس دەخەینە بەر چاوان: بێبڕوا، بڕواداری گوناحبار، بڕواداری چاكەكار.

## جێباسی یەکەم

## ڕەوشی بێبڕواكان

### خوازگەی یەكەم

### ریسوابون و پەشیمانبونەوەو نائومێدیان

هەر یەكێك لە ئایەت و فەرمودەكان رامێنیێ و بیریكاتەوە دەزانیێ كە بێباوەڕان لەو ڕۆژە گەورەیەدا چ ناخۆشی و كارەساتی گەورەیان دوچار دەبێ.. ئێمەش لەم جێباسەدا چەند دیمەنێكی ڕیسوابونی ئەو ستەمكارانە دەخەینە ڕو كە لە قورئانێدا باسكراون:

١. كە لە گۆڕەكانیان دەردەچن، خوا دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنْ الأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ، خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ:

ئـەو ڕۆژەی کـە بـە تـاو و تاڵوکـەوە لـە گۆڕەکانیـان دێنـە دەرەوە، دەڵێـی بـۆ لای بتـەکانیان هـەڕا دەکـەن. چـاونزم و زەبونـن. پێیـان دەگوتـرێ: ئـەوە ڕۆژەکەیـە کـە هەڕەشەتان پێ لێدەکرا﴾ معارج: ٤٣.

ئەم ئایەتـە دیمـەنی لـە گۆڕ دەرچونـی بێبڕواکـان دەخاتـە بـەرچاو کـە بـە تـاو و تاڵوکەوە بەرەو دەنگی قیامەتێ دەچن، وەك بڵێی چۆن لـە دنیادا بـەرەو ئامێزی بتـە پەرستراوەکانیان دەچون ئاوەهابن، بەڵام ئەمجارەیان وەکو دنیـا کەشـم و نەشـم و تەنتەنە ناکەن و شاد و ئاسودە نین، بەڵکو زەبون و ریسـوا و سەرشـۆڕ و چاونزم و شڕۆڵن.

٢. ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِي إِلَى شَيْءٍ نُكُرٍ، خُشَّعًا أَبْصَارُهُمْ يَخْرُجُونَ مِـنَ الاجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُنْتَشِرٌ، مُهْطِعِينَ إِلَى الدَّاعِي يَقُولُ الْكَافِرُونَ هَذَا يَوْمٌ عَسِـرٌ: ئـەی پێغەمبـەر! لێیـان گـەڕێ خـۆت خەفـەتخان مەکـە، بـۆ ئـەو ڕۆژە هـەڵیانگرە کـە ئیسـرافیلی بانگیـار بـۆ شـتێکی سـەخت و نـاخۆش بانگیـان دەکـات کـە ڕۆژی مەحشەرە. لەو ڕۆژەدا ڕیسوا و چاوشۆڕن وەك کللۆی پـەرش و بڵاو لـە گۆڕەکانیـان دێنە دەرەوە. خێرا بـە پیر بانگیارەکەوە دەچن و بێبڕوایان لەبەر خۆیانـەوە دەڵێن: بەخوا ڕۆژێکی سەختە!﴾ القمر: ٦ ٨.

ئەم ئایەتە وەکو ئایەتەکەی دی تابلۆی چۆنیەتی لە گۆڕ دەرچونیان دەکێشێ کە بـە چـاو شـۆڕیو زەبونیـەوە دەردەچـن و بـەرەو سـەرچاوەی بانگەکـە هـەڕا دەکـەن، هەروەها وێنەیەکی زندوی زندوبونەوەشمان بۆ ڕادەنوێنێ کە وەکو کللۆ (کوللـە) بـە پەلـەو خێراییو بە پەرش و بڵاویـەوە بـەرەو پـیری دەنگەکـە دەچـن. هـەروەها لـەم ئایەتـەدا ئیعـترافی بێبڕواکـانیش دەخاتـە ڕو کـە ڕۆژەکـەیان پێسـەخت و توشـە ﴿يَقُولُ الْكَافِرُونَ هَذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾ القمر: ٨.

---

بانگیار: المنادي

٣. له ئایەتێکیتردا باسی زاڵەو هەی هاواری بێبڕواکان دەکات، کە کەڕەنا فو دەکریو زندو دەبنەوەو دەڵێن: کێ زندوی کردینەوە؟!.

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُمْ مِنَ الاجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ، قَالُوا يَاوَيْلَنَـــا مَـــنْ بَعَثَنَا مِنْ مَرْقَدِنَا هَـذَا؟!: کە کەڕەنا فوی دوەمی پێدا دەکرێ بێبڕواکان بۆلای خوا بەتاڵوکــەوە لــە گــۆڕ دەردەچــن. دەڵێــن: هــەی هــاوار، کــێ لــە خــەوێدا زنــدوی کردینەوە؟!﴾یس: ٥١.

ئـەبو مەحکەملجسـری دانـاو حـەکیم خـەڵکی لـە دەوردا کۆبـبـۆوەو قسـەی بـۆ دەکردن، کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەگریاو دەیگوت: (بێبڕواکان لێیان تێکدەچێ چ کارەسات و پەرژەنکێکیان بەسەردا هاتوە. بەخوای ئەگەر وەکو دەڵێن لە خەوێدا بوبان قەت لەگەڵ یەکەم ساتی زندوبونەوەدا وەها نەدەتۆقین. لە پاشانیش توشی هـەر رەوشـێکی تـر بین لـە هـی پێشتر گەورەترەو پەسەلانیش[1] بە خۆ و بـەو هـەمو کارەسـاتەوە توشـیان دەبـێ. ئـەوان کـە لـە نـاو گـۆڕدا بـون سـزاو ئەشـکەنجەیان دەخوارد، بەڵام کە لەگەڵ زندوبونەوەدا هەی هاوارو زایەڵە دەکەن لەبەر ئەوەیە کە لە ناخۆشیەکەوە بۆ یەکێکیتری سەختتر دەگوازرێنەوە، بۆیە بە ژینی نێو گۆڕیان دەڵێن خەوتن، خواش دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَتْ الطَّامَّةُ الْكُـــبْرَى﴾، پاش ئەم وتانە هێند دەگریا تا ڕدێنی تەڕ دەبو)[1].

٤. لــە ئایــەتێکیتردا ئــەدگارێکیتری زندوبونــەوەی بێبڕواکــان ڕادەنوێنــێ، لــەم دیمەنەدا چاوی بێبڕواکان لە مۆلەق و ئەبڵەقی ماوەتەوەو دڵیان هۆشی تێدا نەماوە:

﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُــمْ لِيَــوْمٍ تَشْــخَصُ فِيــهِ الاَبْصَارُ، مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لاَ يَرْتَـــدُّ إِلَيْــهِمْ طَرْفُــهُمْ وَأَفْئِدَتُــهُمْ هَــوَاءٌ: وا مـەزانن خـوا لـە کـرداری سـتەمکاران بێئاگایـە. نـەخێر، بـەڵام بـۆ ئـەو ڕۆژەیـان هـەڵدەگرێ کە چاویـان ئەبڵـەق دەبـێ. تەنگە تاون، سـەریان بـەرز ڕاگرتـوە، پێڵـوی

---

[1] پەسەلان: قیامەت

چاوەکانیان وێك نایەتەوەو دڵیان خاڵیە﴾ إبراهيم: ٤٢-٤٣.

مامۆستا سەید قوتب (بەر میهری خوا بێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا دەڵێ[1]: ((پێغەمبەرﷺ خوا بە بێئاگا نازانێ، بەڵام لە ڕواڵەتی ئایەتەکەدا وا دەردەکەوێ مەبەستەکە ئاراستەی ئەو کەسانە بێت کە دەبینن ستەمکاران لە نێو نازونوز و عەیش و نۆش و ڕابواردنی دنیادا کەیف سازن و هەڕەشەو گوڕەشەی پەروەردگاریشیان گوێ لێدەبێ کەچی لە دنیادا هیچیان بەسەر نایێ. ئەم جۆرە نەشم و شێوازەی کە ئایەتەکە دەریبڕیوە ئەو ئاکامە وەدەر دەخات کە بێباوەڕان تێیدا توشی سزا دەبن کە دوایین سزایە و هیچ خاترانەو ڕزگاربونێکی تێدا نیە، لە ڕۆژێکدا سزایان دەدات کە دۆش دادەمێنن و چاوەکانیان لە ترسان لە مۆلەقەدا دەمێننەوە بە جۆرێك نەتوانن بیاننوقێنن!

پاشان وێنەی دیمەنێکی سەختی کارەساتەکە دەکێشێ... دیمەنێك کە هەر هەمویان بە پەلەپەل و تاڵوکەن، تەماشای هیچ شتێك ناکەن و ئاوڕ لە هیچ نادەنەوەو ملیان ڕەپ بوەو سەریان قیت ڕاوەستاوەو ناتوانن بیجوڵێنن. تا چاویان بڕ بکا هەر دیمەنی سامناك و ترسێنەر دەبینن و تەنانەت پێڵوی چاوەکانیان وێك نایەتەوە. دڵیان لە ترسان خاڵی دەبێ و هەر شتێکی ئەزبەریان بوەو زانیویانە تێیدا نامێنێو هیچیان بە بیر نایەتەوە، دڵێکی بۆش..! بەڵێ، خوا بۆ سزای ڕۆژێکی ئاوایان هەڵدەگرێ، کە ئەو هەمو دیمەن و تاڵی و ترس و جەنجاڵیە دەبینن. بەم چوار بڕگەیە تابلۆیەکی تاسێنەر دەنەخشێنێ وەکو باڵندەیەك کە دەکەوێتە بەر چڕنۆك و ڕنەی باشوکەیەك:

﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ، مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ﴾ابراهيم:٤٢

ئەو بە پەلەپەل و تاڵوکە و تەنگاویە بەو بچمە چاو مۆلەق و مل ڕەپبونە ناچاریە، لەگەڵ دڵی بێهۆش و خاڵی.. هەموی ئاماژە بەو کارەساتە سەختە دەکەن

[1] (النهاية)ی ئینو کەثیر: (١/٢٧٤).

**که چاویان تێدا بەزەقی دادەمێنێ))[1].**

**٥. قورئانی پیرۆز ئەو ترس و سامە دێنێتە بەرچاو کە ناخ و دەرونی بێبڕواکان دادەگرێتەوەو دەفەرموێ:** ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الآزِفَةِ إِذْ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلاَ شَفِيعٍ يُطَاعُ: **لە ڕۆژی نزیك بیانترسێنە کە لەبەر ترسی ئەو ڕۆژە دڵ دێتە ناو گەرو، خەم و پەژارە دایاندەگرێ، لەو ڕۆژەدا ستەمکاران دۆستی ئازیزو تکاخوازێکیان نیە فەرمانبەری بۆ بکرێ﴾** غافر: ١٨.

**((ئازیفە... نزیك و خێرا... ڕۆژی قیامەتە، واژەی ئایەتەکە وا دێنێتە بەرچاو وەك بڵێی ئەم ڕۆژە هەڵخزێ، هەناسەکانیش شپرزەو هێنکە بڕبون، وەك بڵێی دڵە تەنگاوەکان فشار بخەنە سەر گەرو. بە هۆی هەناسەبڕاوی و ئێش و ئازار و ترس و سامەکەیانەوە پەژارەمەندن و پەژارەو داخ و خەفەت بینە قاقای گرتون و سنگی گران کردون و لەم ڕەوشە خەمئامێزەدا خۆشەویستێك نادۆزنەوە دڵیان بداتەوەو بەزەییان لەگەڵدا بنوێنێ، تکا خوازێك ناوەدۆزن قسەی لێ وەرگیرێ))[2].**

**٦. ئەو تاوانبارو یاخییانەی لە خوا هەڵگەڕاونەتەوە وفیزبەرزییان لە پەرستن و فەرمانبەری خوا کردوە؛ لە ڕۆژی دواییدا بە کۆت و زنجیرکراوی و بە بەرگی قەترانی بۆن ناخۆش و سوتۆکەوە[3] بۆ لای خوا ڕاپێچ دەکرێن، ئاگر هورورژم دەکاتە سەر دەموچاویان.. ئای لەو بەدبەختیە!**

﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الارْضُ غَيْرَ الارْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ، وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِينَ فِي الاصْفَادِ، سَرَابِيلُهُمْ مِنْ قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمْ النَّارُ: **لە ڕۆژی دواییدا ئەرزو ئاسمانەکان دەگۆڕێن و خوا ئەرزو ئاسمانێکیتر دادەنێ و هەمویان بۆ خوای تاك و خاوەن هێز وەدەر دەکەون. لەو ڕۆژەدا کۆت و زنجیر لە تاوانکاران دەئاڵێنن، کراس و پۆشاکیان لە قەترانەو ئاگر ڕو و ڕوخساریان دادەپۆشێ﴾** إبراهيم: ٤٨-٥٠.

---

[1] في ظلال القرآن: ((٤/٢١١١)).

[2] في ظلال القرآن: (٦/٣٠٧٤).

[3] سوتۆك: سريع الاشتعال

طەبەری (بەر میهری خوا بێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا دەڵێ: (بێبڕوایانی تاوانکار لەو ڕۆژەدا کە ئەرزو ئاسمانەکانی تێدا دەگۆڕێ دەست و پێیان بە گەردنیانەوە کۆت کراوە).[1]

سەرابیل: ئەو بەرگ و کراسەیە کە لەبەری دەکەن. قەتران: ئەو مادەیە کە گڕویی وشتری پێ چەور دەکرێ. وتراویشە: قەتران واتە مس.

٧. لەو ڕۆژەدا خۆر هێند لەسەر سەری بەندەکان نزیك دەبێتەوە تەنها یەك میلی دەمێنێ بەسەریانەوە بنوسێ! خۆ ئەگەر مرۆڤ بە جۆرێکی‌تر بەدی‌نەهێنرابا کە قەت نەمرێ ئەوا دەتوایەوەو دەبوە هەڵم و لەناو دەچو.

لەو ڕۆژەدا مرۆڤ ئارەقەیەکی زۆر دەکات تا زەوی تەڕو تێر دەکات، ئینجا بەسەر زەویدا بەرز دەبێتەوەو بە پێی کردەوەکانیان لە نێویدا نغرۆ دەبن.

لە صەحیحی موسلیم دایە کە میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بو دەیفەرمو: ((تدنى الشمس يوم القيامة من الخلق، حتى تكون منهم كمقدار ميل: لە ڕۆژی قیامەتدا خۆر هێند لە خەڵك نزیك دەبێتەوە تا بەقەد یەك میل لەسەر سەریانەوە دەبێ)).

سولەیمی کوڕی عامر دەڵێ: دە بەو خوایە نازانم مەبەستی لەو میلە چیە؟ نازانم میلێکی ماوەی زەوییە[2] یان میلی چاو پێ ڕشتنە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((فيكون الناس على قدر أعمالهم في العرق فمنهم من يكون الى كعبيه ومنهم من يكون الى ركبتيه ومنهم من يكون الى حقويه ومنهم من يلجمه العراق إلجاماً: ئەوجا خەڵك بە ئەندازەی کردەوە خراپەکانیان لە ناو ئارەقەدا دەبن، هەیانە تا گۆزینگانی و هەیانە تا ئەژنۆ و هەیانە تا ناوقەدیان دێت، هەشیانە ئارەقە جلەوی دەکات)).

---

[1] تفسير ابن جرير الطبري: (١٣/٢٥٤).

[2] یەکێکە لە پیاوانی ئیسنادی فەرمودەکەو ئەو لە میقدادی گێراوەتەوە-وەرگێر.

[3] یەك میل دەکاتە (١٦٠٩,٣٤) مەتر-وەرگێر.

مقداد دەڵێ: پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بۆ دەمی کرد[1].

لە هەردو صەحیحی بوخاری و موسلیمدایە کە ئیبنو عومەر‌ لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە کە لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ((يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ)) فەرموی: ((يقوم احدهم في رشحه الى انصاف أذنيه: لەو رۆژەدا هی وا هەیە تا ناوەراستی گوێیەکانی لەناو ئارەقەدا نقوم دەبێ))[2].

هەمدیسان لە صەحیحەکانی بوخاری و موسلیمدا ئەبو هورەیرە‌ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((يعرق الناس يوم القيامة حتى يذهب عرقهم في الأرض سبعين ذراعاً ويلجمهم حتى يبلغ اذانهم: لە رۆژی ژیانەوەدا خەلك ئارەقەیەکی هەند زۆر دەکەن کە حەفتا گەز دەچێتە ژێر زەوی و پاشانیش تا بناگوێیان لغاو دەبن))[3].

٨. کە بێبڕواو هاوبەشپەرستەکان سزاو سوکایەتی خۆیان و هاورێبازەکانیان دەبینن حەژمەت و خەفەتێکی وا دایاندەگرێ کە قەت بە قسە نایەتە باسکردن، تەنانەت خوای بالادەست لەبەر زۆری ئاخ و داخی ئەم رۆژە ناوی ناوە رۆژی ئاخ هەڵکێشان:

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الامْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ: هەرەشەی رۆژی ئاخ هەڵکێشانیان لێ بکە کە کار لە کار تەواو بوە و ئەوانیش لە نێو بێئاگاییدان و بڕوایان نەهێناوە﴾مريم:٣٩.

لەوە زۆر پەشیمانن کە پەیرەویان لە رێبازی پێغەمبەرﷺ نەکردوە و هەر دو دەستی خۆیان دەگەزن:

﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَالَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً، يَاوَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاَنًا خَلِيلاً، لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنْ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلإِنسَانِ خَذُولاً:

---

[1] صحيح مسلم-كتاب الجنة-باب في صفة القيامة: (٤/٢١٩٦) ژمارە (٢٨٦٤).

[2] رواه البخاري في كتاب الرقاق: فتح الباري (١١/٣٩٢) ورواه مسلم في كتاب الجنة (٤/٢٨٦٢) ژمارە ٢٨٦٢.

[3] هەمان سەرچاوەکانی پێشو، واژەکەش هی بوخارییە.

**لەو رۆژەدا ستەمكار هەردو دەستی خۆی دەگەزێ و دەڵێ: خۆزگە هاوڕێبازی پێغەمبەر بام. ئاخ! .. خۆزگە فلانم نەكردبایە ئازیزی خۆم، خۆ ئەو بو منی لە خشتە برد و لە قورئانی گومڕا كردم، بەڕاستی شەیتان هەر زەبون و ڕیسواكەری مرۆڤ بوە﴾** الفرقان:٢٧-٢٨.

**٩. لەو ڕۆژەدا بێبڕواكان دڵنیا دەبن كە تازە گوناح و تاوانەكانیان لێخۆشبون و ڕەشبونەوەی بۆنیە بۆیە دڵسارد و بێهومێد دەبن.**

﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُـــونَ: **كە ڕۆژی قیامەت دێتە ئارا بێبڕوایانی تاوانكار لە میهری خوا دڵسارد و بێهومێد دەبن** ﴾[1].

**١٠. بێبڕواكان خۆزگە بە فەوتان و خۆڵ دەخوازن:**

﴿يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِيـــنَ كَفَـــرُوا وَعَصَـــوُا الرَّسُـــولَ لَـــوْ تُسَـــوَّى بِـــهِمُ الارْضُ: **لەو ڕۆژەدا بێبڕواكان ئەوانەی لە پێغەمبەر یاخی بون پڕ بە دڵ حەزدەكەن زەویان بەسەردا تەخت بێ﴾**[2].

﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَالَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا: **بێبڕوا دەڵێ خۆزگە دەبومە خۆڵ﴾**[3].

**كەسانێك ترۆپكی ئاوات و هومێدیان بون بەخۆڵ بێ!.. ئاخۆ دەبێ لە چ ڕەوشێكدا بن؟!**

---

[1] الروم:١٢.

[2] النساء: ٤١.

[3] النبأ: ٤٠.

## خوازگەی دوەم

# پوچەڵبونەوەی چاکەکانیان

بێبڕواکان دو جۆرە کردەوەیان هەیە، جۆری یەکەمیان ئەو خراپەو تاوان و ستەمانەیە کە ئەنجامیان داوە و چاوەڕێی پاداشت و خەڵاتی لێ ناکەن، خوا ئەم جۆرە کردەوانەی بە تاریکی لەسەر تاریکی چواندوە:

﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ: کردەوەی بێبڕواکان وەکو تاریکاییەکانی نێو دەریایەکی بێبنە کە شەپۆڵ لە ژور شەپۆڵ دایپۆشیوە و لە ژور ئەوانیشدا کۆمەڵە هەورێك هەیە، تاریکی لەسەر تاریکییە، کە ئەگەر دەستی لە نێو دەریا دەرێنێ زۆر بە ئەستەم دوای لێ وردبونەوە ئەوجا دەیبینێ، ئەو کەسەی خوا روناکی پێ نەدابێ هەرگیز روناکی نیە﴾. النور: ٤٠

جۆری دوەمیان: کردەوە چاکەکانیانە کە هومێدی خێردانەوەیەکی لێدەکەن، وەکو بەخشین و بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی و خێرکردن، خوا لە قورئانێدا وێنەی بۆ ئەم جۆرە کردەوانە هێناوەتەوە و بە تراویلکە(سراب)ی چواندوە کە تێنو لە دورەوەڕا وا دەزانێ ئاوی دۆزیوەتەوە! بە پەرۆشەوە هەڵپەی بۆ دەکات و هەڵکوت هەڵکوتیەتی تا بیگاتێ و تێنوێتی پێ بشکێنێ کەچی هیچ نادۆزێتەوە.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِنْدَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ: کردەوەی بێبڕواکان وەکو تراویلکە وایە کە تێنو لە دورەوەڕا وا دەزانێ ئاوە، کەچی کە دەگاتە لای هیچ ئاوێك نادۆزێتەوە، کردەوەی ئەوانیش وەکو تراویلکە وایە کە دەمرێ دادیان نادات، خوا لێپرسینەوەی خێرایە﴾النور:٣٩.

لە شوێنێکی تردا بە بایەکی زۆر ساردو توشی چواندوە کە لە کشتوکاڵ و بەروبوم و میوە دەدات و وێرانی دەکات:

﴿مَثَلُ مَا يُنْفِقُونَ فِي هَذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ وَلَكِنْ أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ: ماڵبەخشینی بێباوەڕان لە دنیادا وەکو بایەکی زۆر سارد وایە کە توشی کشتوکاڵی کەسانێکی ستەمکار دەبێ و هەمو کشتوکاڵەکە بفەوتێنێ، خوا ستەم لە بێباوەڕان ناکات کە ماڵبەخشینەکەیان پوچەڵ دەکات بەڵکو ئەوان خۆیان بەهۆی بێبڕواییەکەیانەوە ستەمیان لە خۆیان کردوە﴾آل عمران: ١١٧.

لە شوێنێکی تردا کردەوەکانیان بە خۆڵەمێشێك دەچوێنێ کە رەشەبایەکی توندوتیژی لێ هەڵکاو پەرش و بڵاوی بکاتەوە، جا چۆن دەتوانێ کۆیان بکاتەوە؟!:

﴿مَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ لاَ يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَى شَيْءٍ ذَلِكَ هُوَ الضَّلاَلُ الْبَعِيدُ: کردەوەی بێبڕواکان وەکو ئەو خۆڵەمێشە وایە کە لە رۆژێکی وەشەندا رەشەبایەکی توندوتیژی لێبدات و هەرهەموی پەرش و بڵاو بکاتەوە، تەنانەت نەتوانن تۆزقاڵێکیشی لێ کۆبکەنەوە، هەڵبەت ئەمەیە گومڕایی بێ سنور﴾ إبراهيم: ١٨.

هەر بۆیەشە خوا کردەوەی بێبڕواکان وەکو تەپ و تۆز و گەرد و تۆزکاڵی ناو تیرۆژ پەرش و بڵاو دەکاتەوە:

﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا﴾الفرقان:٢٣.

ئەو جۆرە بێباوەڕانە کە لە رۆژی قیامەتدا دەبینن کردەوەکانیان بۆتە بڵقی سەر ئاو و دادیان نادات هێدمە(مفاجأة) دەیانگرێ، جو و دیانەکانی دوای پێغەمبەرمانﷺ لەوانەن، هی وایان هەیە درێغی ناکات و هەر چاکەیەکی پێ بکرێ دەیکات، نوێژو رۆژو و پەرستنکاریەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن و وا دەزانن لەلای

خـواى بـەرزو بالادەسـت پاداشـت وەردەگرنــەوە، هـەروەها ئەوانــەی هاتونەتـە نـاو ئیسلام و جگـە لـە خوایـان پەرستوەو هاوبەشیان بـۆ خـوا پـەیدا کـردوە، ئـەوانیش لەوانەن کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ:

﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأخْسَرِينَ أَعْمَالاً، الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا، أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا، ذَلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا: بڵێ: پێتان بڵێم کێ لە هەمو کەس پتر کردەوەی بە فیرۆ چوە و دۆڕاوترە؟ ئەوانەی کە کردوکۆشیان لە دنیادا بە گومڕا چوەو وا دەزانن کردەوەی باش دەکەن، ئەوانەی بێبڕواییان بە دیدار و ئایەتەکانی خوا کردوە، کردەوەکانیان دەپوکێتەوە و لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ نرخێکیان نادەینێ، بۆیە دەچنە ناو دۆزەخ چونکە بێبڕواییان کردوە و ئایەت و پێغەمبەرانی منیان بە گاڵتە وەرگرتوە﴾الكهف:١٠٣-١٠٦.

موصعەب لە سەعدی کوڕی ئەبووەقاصی باوکی پرسی: ﴿بالأخْسَرِينَ أَعْمَالاً﴾ کێن؟ ئـەویش گوتـی: جولەکـەو گاورەکـانن جولەکـەکان بڕوایـان بـە موحەممـەدﷺ نـەهێنا، گاورەکـانیش کوفریـان بـە بەهەشـت کـردوەو دەڵێـن خـواردن و خواردنـەوەی تێدا نیە.

جولەکـەو دیانـەکان خۆیـان پـێ ڕاسـتە و پێیـان وایـە دینداریەکـەیان تـەواو و بێخەوشە، تەنانەت خۆشیان ماندو دەکەن و لە پێناو دینەکەیان ماڵیش دەبەخشن و قوربانیش دەدەن، کـەچی لـە ڕاسـتیدا لەسـەر ڕێوشـوێنێکی گومـڕاو سـەرگەردانیدان چونکە بڕوایان بە دواهەمین پێغەمبەر و قورئان نەهێناوە بەڵکو بڕوایان بە زۆر شتی تریش نەهێناوە کە کاتی خۆی بۆیـان دابەزیوە، هـەروەها بڕوایـان بـە شـتە گۆڕاو و

---

صحيح البخاري، كتاب التفسير، سورەتی ژمارە (١٨) فتح الباري: (٨/٤٢٥).

دەستێوەردراوەکانی دینەکەیان هێناوە.. بۆیە لە ریزی دۆڕاوەکانن.

کردەوە باش و چاکەکانی بێبڕوایان لەبەر ئەوەی بە پێی بنەرەت و بنچینەیەکی راست و دروست ئەنجام نەدراوە بۆیە لە رۆژی سزاو پاداشتدا دادیان نادات و بە هەدەر دەچێ:

﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾آل عمران:٨٥.

بنچینەو بنەڕەتیش بریتیە لە دینی ئیسلام، کەواتە هەر کەسێك موسڵمان و یەکخواپەرست نەبێ ئەوا کردەوەکانی وەرناگیرێ و رەتکراوەیە و ناخرێتە تای بەهەشتیان، موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەگێرێتەوە کە خاتو عائیشە پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیبنو جەدعانی بێباوەڕ لەسەردەمی نەفامیدا سەردانی خزمانی دەکردو نانی هەژارانی دەدا، ئایا ئەم کردەوانە بە هاواریەوە دێن؟ فەرموی: نەخێر چونکە قەت لە ژیاندا نەیگوتوە: پەروەردگار! لە رۆژی ژیانەوەدا لێم خۆش ببە[1].

---

[1] صحيح مسم: كتاب الإيمان، باب أهون أهل الدنيا عذاباً، (١/١٩٦) ژمارە (٢١٤).

## خوازگەی سێیەم

# مشتومڕ و دوژمنایەتی دۆزەخیەکان

بێبڕواکان کە سزاو ئەشکەنجەو هەراو هەنگامەو پەرژەنگ و کارەساتی دژواری ڕۆژی ژینەوە دەبینن، هەر ئەوەیان بۆ دەکرێ سەرکۆنەی خۆیان و هاوڕێ و هاوبیرەکانیان بکەن. تەنانەت سەرزەنشتی ئازیزترین برادەری خۆشیان دەکەن، بگرە دۆستایەتی بەرژەوەندیان لێ دەبێتە ژەقنەموت و دوژمنایەتی، خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ:

﴿الاخِلاَّءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلاَّ الْمُتَّقِينَ: هەڤاڵ و ئازیزان لە ڕۆژی دواییدا دەبنە دوژمنی یەکتری تەنها بڕواداره پارێزگارەکان نەبن﴾ الزخرف: ٦٧.

لەو ڕۆژەدا دۆزەخیەکان یەکتری دەڕقێنن(دەبوغزێنن) و مشتومڕ لەگەڵ یەکدیدا دەکەن؛ پەرستکار و پەرستراو، پەیڕەوکار و پەیڕەو کراو، زاڵ و زەبون، مرۆڤ و هاودەمە جنۆکەکەی، هەمو لەگەڵ یەکتریدا بەیداخی دوژمنایەتی هەڵدەکەن و لە ڕوی یەکتر هەڵدەگەڕێنەوە، بڕوا بفەرمون بێبڕواکان لەگەڵ ئەندامەکانی خۆشیان مشتومڕ دەکەن:

### ١- مشتومڕی نێوان پەرستکار و پەرستراوەکان:

خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿وَبُرِّزَتْ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ، وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ، مِنْ دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنْصُرُونَكُمْ أَوْ يَنْتَصِرُونَ، فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ، وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ، قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ، تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ، إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ، وَمَا أَضَلَّنَا إِلاَّ الْمُجْرِمُونَ: دۆزەخ بۆ ناخواپەرستان وەدەرکەوت، پێیان دەڵێن: کوا ئەو پەرستراوانەی جگە لە خوا دەتانپەرستن؟ ئایا دەتوانن یاریدەتان بدەن. یاوەخۆ دەتوانن یارمەتی خۆیان

**بدەن؟ ئینجا پەرستکار و بتە پەرستراوەکان لەسەر رو فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخ. هەروەها هەمو سەربازانی ئیبلیسیش. پەرستکارەکان مشتومڕ لەگەڵ پەرستراوەکان دەکەن و دەڵێن: بەو خوایە، لە گومڕاییەکی رون و ئاقوڵادا بوین کە ئێوەمان لەگەڵ خوا کردە هاوبەش، بەڵام تاوانکارەکان ئێمەیان بە گومڕا برد﴾**الشعراء:٩١-٩٩.

**هەڵبەت ستەمێکی هەرە گەورەیە کە بەناو خوایەك لەگەڵ خوادا بپەرسترێ هەروەکو لوقمان کە ئامۆژگاری کوڕەکەی کردوەو گوتویەتی:**

﴿يَابُنَيَّ لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾لقمان: ١٣.

**بەڵام ئەو پیاوچاك و چاکەکارانەی بێئەوەی بزانن خەڵك پەرستویانن، هەروەها فریشتەو مرۆڤە چاکەکان کە بەبێ رەزامەندی خۆیان پەرستراون، پاکانەی خۆیان دەردەبڕن و تۆمانج و درۆی پەرستکارەکان سپی دەکەنەوە، چونکە فریشتەکان داوایان نەکردوە بپەرسترێن، بەڵکو جنۆکە ئەم داوایەیان لە مرۆڤ کردوە تا بیانخەنە ناو گەرداوی، گومڕایی کەواتە ئەم گومڕایانە جنۆکەیان پەرستوە نەك فریشتە:**

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلاَئِكَةِ أَهَؤُلاَءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ، قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنْتَ وَلِيُّنَا مِنْ دُونِهِمْ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ:
**خوا لە رۆژی زندوبونەوەدا سەرجەمیان کۆ دەکاتەوە پاشان بە فریشتەکان دەڵێ: ئەم هاوبەشپەرستانە ئێوەیان پەرستوە، دەڵێن: خوایە! پاکی بۆ تۆ، تۆ پەرستراو و خوای هەر هەمومانی، ئێمەیان نەپەرستوە بەڵکو جنۆکەیان پەرستوە و زۆربەیان بڕوایان بە وان هەبوە﴾**سبأ: ٤٠-٤١.

**هەروەها لە رۆژی قیامەتدا عیسای کوڕی مەریەمیش خۆی لەوانە هاوێر و بێبەری دەکات کە لەگەڵ خوادا پەرستویانە و کردویانەتە خوا:**

﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَاعِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّي إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، مَا قُلْتُ لَهُمْ

إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنْ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ: **خوا بە عیسای کوڕی مەریەم دەڵێ: ئەتۆ بە خەڵکت گوتوە من و دایکم لەگەڵ خوا بە خوا دابنێن و بمانپەرستن، عیسا دەڵێ: پاکی بۆ تۆ! بۆم نەبوە قسەیەکی ناڕەواو ناشایەن بوێژم، خوایە خۆت دەزانی چم گوتوەو تۆ بە ناخی من شارەزای بەڵام من بە ناخی تۆ زانیاریم نیە، خوایە تۆ پەنامەکیزانی، تەنها ئەوەم پێ گوتون کە تۆ فەرمانت پێ کردوم، پێم گوتون: ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەیە﴾** المائدة: ١١٦-١١٧.

**ئەمە هەڵوێستی گشت پەرستراوەکانە کە رازی نیە بکرێت بە خواوەند و خۆی بێبەری دەکات لە پەرستکارەکانیو بانگەوازەکەیان بەدرۆدەخاتەوەو، دان بە بەندایەتی خۆی بۆ خوای پەروەردگاری دەنێ:**

﴿وَإِذَا رَأَى الَّذِينَ أَشْرَكُوا شُرَكَاءَهُمْ قَالُوا رَبَّنَا هَؤُلاَءِ شُرَكَاؤُنَا الَّذِينَ كُنَّا نَدْعُو مِنْ دُونِكَ فَأَلْقَوْا إِلَيْهِمْ الْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَاذِبُونَ، وَأَلْقَوْا إِلَى اللَّهِ يَوْمَئِذٍ السَّلَمَ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ: **لە رۆژی زندوبونەوەدا کە پەرستکارەکان پەرستراوەکانی خۆیان دەبیننەوە دەیانەوێ تاوانی هاوبەشپەرستیەکەیان بخەنە ئەستۆی ئەوان و دەڵێن خوایە ئەوانە بون کە لەگەڵ تۆدا پەرستومانن، خواش پەرستراوەکان بەقسە دێنیو دەڵێن: نەخێر تاوان تاوانی خۆتانە، درۆیە ئیمە نەمانگوتوە بمانپەرستن. هەمویان بۆ خوا ملکەچ دەبن، پەرستکاران پەرستراوەکانیان لێ گوم دەبێو نایانکرێ یارمەتیان دەن﴾** النحل: ٨٦-٨٧.

**لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ:** ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنْتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ وَقَالَ شُرَكَاؤُهُمْ مَا كُنْتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ، فَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِنْ كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ، هُنَالِكَ تَبْلُو كُلُّ نَفْسٍ مَا أَسْلَفَتْ وَرُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلاَهُمْ الْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ: **لە رۆژی قیامەتدا هەمو پەرستراو و پەرستکارەکان کۆ دەکرێنەوەو پێیان دەڵێین بوەستن لە جێی خۆتان مەبزون، ئینجا لێکیان جیا دەکەینەوە، پەرستراوەکان بە پەرستکارەکان دەڵێن: ئێوە ئێمەتان نەدەپەرست بەڵکو جنۆکەو شەیتانتان پەرستوە، چونکە هیچ**

ئاگامان لەو پەرستنە نەبوە، خواش بەسە ببێتە گەواهیدەری نێوانمان، لەوێدا هەمو کەسێك گرفتاری کردەوەکانی خۆی دەبێ و دەزانێ چی کردوەو چی نەکردوە، هەمو بۆ خوا دەگەڕێنەوە، بت و پەرستراوەکانیش دادی نەدان ﴾ یونس:٢٨-٣٠.

**٢) مشتومڕی نێوان شوێنکەوتوان و بیرمەندە گومڕاکان:**

ڕکەبەرایەتی شوێنکەوتوان کە لەگەڵ ڕێبەرو سەرکردە گومڕایەکان دەیکەن کە هزرو ڕێبازو ڕێبیری[١] دژ بە ئیسلامیان داناوە، خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ:

﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ، وَقَالُوا يَاوَيْلَنَا هَذَا يَوْمُ الدِّينِ، هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ، احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، مِنْ دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ، وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ، مَا لَكُمْ لاَ تَنَاصَرُونَ، بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ، وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ، قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنْ الْيَمِينِ، قَالُوا بَلْ لَمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ، وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ، فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ، فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ، فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ، إِنَّا كَذَلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ، إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ:

**زندوبونەوەتان تەنها یەك قیژەیە کە فوی دوەمە و دەسبەجێ قیت دەبنەوەو چاوەڕێی فەرمانی خوا دەکەن، بێبڕواکان دەڵێن هەی هاوار، تونا‌وتون بین، خۆ ئەوە ڕۆژی سزاو پاداشتە! پێیان دەڵێن: بەڵێ، ئەوە ڕۆژەکەیە کە بڕواتان پێ نەدەهێنا، خوا فەرمان بە فریشتەکان دەکات: هاوبەشپەرست و هاوچونەکانیان لەگەڵ هەمو ئەو شتانەی دەیانپەرستن کۆ بکەنەوەو ڕێی دۆزەخیان پێ نیشان دەن و ڕاپێچیان بکەن، ئێستا ڕایانگرن تا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێ، پێیان دەگوترێ: ها، ئەوە بۆچی لەسەر یەك ناکەنەوە؟، چۆن دەتوانن! هەمو لە ژێر دەسەڵاتی خوادان، ئەوجا ڕو دەکەنە یەکتری و سەرکۆنە و گلەیی گازاندە دەست پێ دەکات، فریواوەکان بە**

---

[١] ڕێبیر: مبدأ

فریودەرانیان دەڵێن: خەتای ئێوە بو، ئەنگۆ هەمو جارێ دەهاتن و ئاین و رەواتان لەبەر چاو ناشرین دەکردین، تا لە خشتەتان بردین، فریودەرەکانیش وەلامیان دەدەنەوەو دەڵێن: نەخێر هەرگیز وا نیە بەڵکو خۆتان بڕوادار نەبون ئەگینا ئێمە نەماندەتوانی زۆرتان لێ بکەین، ئێوە خۆتان لە نێو گومڕایی و یاخیکاریدا بون، بە مجۆرە بو تا وتەی خوامان لێ وەدی هات کە فەرمانی دابو دۆزەخ پڕ بێبڕوا بکات، ئێمە هەرچەندە خورتیمان لێ نەکردن بەلام ئێمە بۆ گومڕایی بانگمان کردن ئێوەش وەلامتان داینەوەو ئەنجام سەرجەممان گومڕا بوین. لەو رۆژەدا هەر دو لایان (فریواو فریودەران) دەخرێنە ناو ئەشکەنجە، ئێمە ئەوها لە تاوانکاران دەکەین، لە دنیادا کە پێیان دەگوترا بەرفەرمانی لا اله الا الله بن لوتیان بەرز دەکرد!﴾الصافات:١٩-٣٥

ئەم ئایەتە سەرکۆنەو لە ڕو وەرگەڕانەوەو گلەوگازاندەی دۆزەخیەکانی خستە ڕو کە لە گۆڕەپانی زندوبونەوەدا فریواو و هەواداران بە سەرکردە یاخی و گومڕاکەرەکانیان دەڵێن: ئەنگۆ بون تەفرەتان داین و نارەواو ناڕاستیتان بۆ ئارایش داین تا چارەنوسمان بەو نەگبەتیە گەیشت:

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ: رێبەری بێبڕواکان یاخییەکانن کە خەڵك لە ڕوناکی ئیسلام بۆ تاریکی نەفامی دەردێنن.﴾البقرة:٢٥٧

بەلام سەرکردەو سالارو بیرمەندەکان وەلامیان دەدەنەوەو دەڵێن: نەخێر بەخۆتان ئۆبالی کردەوەکانتان هەڵدەگرن، چونکە بە ویست و خواهیشی خۆتانەوە بێبڕواییتان هەڵبژارد، چ زۆرێکمان لێ نەکردون، لوتبەرزیو تەنتەنە و یاخیبونتان بو بەو رۆژەی گەیاندن.

**٣) مشتومڕی بێدەسالاتان لەگەڵ سەرۆك و میرو سەرەك هۆز و فەرماندەکان:**

ئەوانەی کەڵەگایی دەکەن و زەبون و بێدەسەلاتان دەچەوسێننەوە، بێدەسەلاتانیش پشتیوانیان دەکەن و بەماڵ و گیان لەسەر ناحەقیان یارمەتیان دەدەن، خوای گەورەش باسی کردون و فەرمویەتی:

﴿وبَرَزوا للهِ جَمِيعًا فقال الضُّعَفاء للذينَ استكبَرُوا إنا كنا لكمْ تبَعًا فهَل أنتمْ مُغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ: **هەر هەموویان لە گۆڕدا دەردەخرێن و زندو دەکرێنەوە، زەبونەکان بە لوتبەرزەکان دەڵێن: لە دنیادا شوێنکەوتەتان بوین، باشە ئەمڕۆ دەتوانن سزای خوامان لە کۆڵ بکەنەوە؟ دەڵێن: کێ دەتوانێ، ئەگەر خوا ڕێنوێنی بکربایین ئێمەش ڕێنوێنمان دەکردن، چارەنوسمان ئاگری دۆزەخە، ئارام بگرین یا نەگرین بێهودەیە و دەرەتانی ڕزگاربونمان نیە﴾** ابراهیم: ٢١.

**دەبا بزانین سەید قوتبی بانگبەرو تەفسیرزان** (خوا پاداشتی بداتەوەو لە میهری خۆی خەنی بکا) **چۆن ئەو ئایەتە پیرۆزانە راڤە دەکات و، با لە کتێبی (في الظلال) لەگەڵیدا بژین... ﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ یاخیکارە بێبڕواکان و، شوێنکەوتە زەبون و ریسواکانیان. هەروەها شەیتانیش... ئەوجا بڕوادارو چاکەکارانیش... (گشتیان) ئاوەلا دەبن، خۆ بۆ خوا هەر ئاوەلان، بەلام ئەوکاتە بە تەواوی دەزانن و چاك هەست دەکەن ئاوەلان وهیچ پەردەیەك دایاننا پۆشێ، هیچ کەسێك نایانشارێتەوەو نایانپارێزێ دەرکەوتن. گۆڕەپان ئاپۆرەی بەست و پەردە هەڵدرانەوەو گفتوگۆ دەستی پێکرد: (زەبونەکان بە لوتبەرزەکان دەڵێن: لە دنیادا شوێنکەوتەتان بوین، باشە ئەمڕۆ دەتوانن بەشێك سزای خوامان لە کۆڵ کەنەوە؟)، زەبونەکان ئەو کەسانەن کە لە تەنانەترین تایبەتیەکان کە خوا بە مرۆڤی بەخشیوە، دابەزیون، لە ئازادی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنی بیروباوەڕو ڕێژین(الأتجاه)ی خۆیان دابەزیون و ریشی خۆیان لە دەست سەرسەخت و سەربزێوان ناوە، لە دینی خوا لامل و بۆ یاخیکارانیش ملکەچ بونە.**

**بێدەسەلاتی پاساو نیە، بەڵکو تاوانە، چونکە خوا نایەوێ کەس زەبون بێ، خوا خەڵك بۆ سەربەرزیو شکۆمەندی بانگ دەکات و پێیان دەڵێ عیززەت لە خواوە وەرگرن، عیززەتی ڕەها بۆ خوایە. خوا نایەوێ هیچ کەس بە خۆشی خۆشدارەکی و بە زۆری زۆردارەکی لە ئازادی خۆی دابەزێ کە ڕێز لێنانێکی خوایە بۆ مرۆڤ. هێزی ئەنبوژەنی (ماددی) هەرچی و چۆنێك بێت لە باریدا نیە مرۆڤ لە ئازادی**

داماڵی‌و ڕیزلێنانی مرۆڤایەتی لێ قەتیس بکات، بەڵام بەو مەرجەی خۆی مکوڕ بێت. دەسەڵاتی هێز ئەوپەڕی دەتوانێ جەستە یەخسیر بکات و ئازارو ئەشکەنجەی بدات و کۆت و زنجیرو زیندانی بکات. بەڵام لەگەڵ ویژدان و ڕوح و عەقڵدا هیچی پێناکرێ، چونکە هیچ کەسێك لە دەسەڵاتیدا نیە ئەوانە یەخسیرو زەبون بکات مەگەر خۆی بیەوێت قەتیس و ڕیسوا بێت!.

کێ دەتوانێ بیروباوەڕو هزرو ئاکاری ئەو زەبونانە یەخسیر بکات و بیانکاتە شوێنکەوتەی یاخی و سەرسەختان؟ کێ دەتوانێ ڕوی دینداری ئەو زەبونانە وەرسوڕێنی‌و بۆ ناخوایانی کەمەندکێش بکات؟ لە کاتێکدا هەر خوا بەدیهێنەر و بژێوگارو سەرپەرشتیانە هەڵبەت هیچ کەس ناتوانێ تەنها ناخی زەبونی خۆیان نەبێ. کە زەبونن لەبەر ئەوە نیە دەسەڵاتی هێزی ئەنبوژەنی(مادی)یان لە یاخیکاران کەمتر بێ. یان لەبەر ئەوە بێ پیاو و سامان و پایەو پلەیان لە وان نزمتر بێ.. نەخێر، ئەو شتانە چەند دیاردەیەکی دەرەکین و نابنە مایەی بێدەسەڵاتی زەبونان. بەڵکو بۆیە زەبونن چونکە ڕچەی زەبونێتیان ئاخنیوەتە ناخی ڕوح و دڵ و کانگای شکۆو شانازییان کە تەنانەترین تایبەتمەندێتی مرۆڤە!.

زەبونەکان گەلێ زۆرن و یاخیکارانیش گەلێ کەمن، ئاخر کێ هەیە ئەم هەمو زۆرە بۆ ئەم کەمۆکەیە دانەوێنی؟ چ هەیە یەخسیریان بکات؟ دیارە هەر زەبونێتی ڕوح و بێهیممەتی‌و شکۆلاوازی و دابەزینێکی ناوەکیە وا دەکات زەبونەکان لەو ڕێز لێنانە خواییە دابەزن کە بە مرۆڤی بەخشیوە!.

یاخیکاران قەت ناتوانن جەماوەر یەخسیری ژێر دەسەڵاتی خۆیان بکەن ئەگەر ئارەزوی جەماوەرەکەی لە گەڵدا نەبێ. ئەگەر جەماوەر ئیرادەی هەبێ هەمو کاتێك دەتوانێ لە دژیان هەڵسێتەوە، بەڵام دیارە تەنها ئەم ئیرادەیان نەقوستانە!.

ڕیسوایی لەو دەرونە ڕیسوایانەوە سەر هەڵدەدا کە بەرچنگی(قابلیة) ڕیسوا بونن.. تەنها لەو بەرچنگیەشە کە یاخیکاران متمانەی لەسەر دەکەن!! ڕیسواکان لە شانۆی ڕۆژی دواییدا هەر بە پێی ڕابردوی پڕ ڕیسوایی شوێنکەوتەییان لە زاڵ و فیزبەرزەکان دەپرسن:

﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِـنْ شَـيْءٍ؟﴾إبراهيم: ٢١. شوێنتان كەوتین تا سەرەنجاممان بەو ڕۆژە ڕەش و چارەنوسە پڕ ناسۆرە گەیشت؟!

یان ڕەنگە سزای خوایان بینیبێ و مەبەستیان بێ لۆمەو گلەیی لە لوتبەرزان بكەن كە بەم سەرەنجامەیان گەیاندون و بونە مایەی وەبەركەوتنیان بۆ سزاو ئازاری خوا؟ جا ڕوكار(سیاق)ی ئایەتەكە باسی وتەكانیان دەكات كە ڕیسوایی پێوە دیارە!

زاڵەكانیش وەڵامی ئەم پرسیارەیان دەوەنەوەو دەڵێن:

﴿قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَـا مِنْ مَحِيصٍ﴾إبراهيم: ٢١، وەڵامەكە وا پێدەچێ خۆ هەڵبواردن و هەراسانی تێدا بێ: ﴿قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ﴾... گازاندەی چمان لێدەكەن؟ ئەدی وا هەمومان لە ڕێی هەمان سەرەنجامدا نین؟ ئێمە ڕێنوێن نەبوین تا ڕێنوێنتان بكەین دەنا چۆن گومڕا دەبوین و ئێوەمان گومڕا دەكرد؟! ئەگەر ڕێنوێن باین ڕێنوێنیمان دەكردن. لێرەدا ڕێنوێنی و گومڕایی بۆ دەسەڵاتی خوا دەگەڕێننەوەو ئێستا ئیعتراف بە دەسەڵاتی خوا دەكەن كەچی پێشتر لالوتییان لێدەكرد و بینەو بەردەیەكی وایان بە زەبونەكان دەكرد قەت حیسابی دەسەڵاتی خوایان نەدەكرد، دەیانەوێ گومڕا كردن و گومڕاكاری بدەنەوە پاڵ خوا تا پەرێزی خۆیان پاك نیشان بدەن، بەڵام خوا قەت فەرمان بە گومڕایی ناكات وەكو دەفەرموێ:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ: خوا فەرمان بەكاری بەد ناكات﴾ الأعراف: ٢٨.

پاشان بەنهێنییەوە بە زەبونەكان دەڵێن تازە كار لە كار ترازاوەو بڕیاری خوا بڕاوەتەوە. ئارام گرتن و نەگرتن بێهودەیە. بێئارامیو خۆڕانەگرتن لەبەر ئەشكەنجەو سزا نابێتە مایەی گەڕانەوەو ژیوانی گومڕایان و گرتنەبەری ڕێی ڕێنوێنی، ئارامگرتنیش ناگاتە ئەوەی میهری خوایان پێبگات.. كات بەسەرچوە و هەمو شتێك بڕاوەتەوە، ئیتر دەرەتان و بواری ڕزگاربون نەماوە:

﴿سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ﴾ كار لە كار تەواو و مشتومڕ بڕایەوەو گفت و گۆ نەما..

لەم شانۆیەدا شتێکی سەیر دەبینین. شەیتان دەبینین.. شەیتانی گاڵدەر و گومڕاکار.. لەو ساتەدا دەبینین بەرگی چەواشەکاری کاهینان بەڵکو بەرگی شەیتان دەپۆشێ و قسەی شەیتانانە لە گەڵ زەبون و فیزبەرزەکان دەکات کە ڕەنگە لە ئەشکەنجەکە بە ئازارتربێ:

﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِي عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلاَّ أَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلاَ تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِي مِنْ قَبْلُ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: کە کار لە کار تەواو، شەیتان دەڵێ: خوا بەڵێنی ڕاستی پێدابون منیش بەڵێنی درۆم پێدان و بە درۆ دەرچوم. بەلاّم من دەسەلاّتی خورتیکاریم بەسەر ئێوەدا نەبو ئەوە نەبێ بانگم کردن و ئێوەش وەلاّمتان دامەوە، بۆیە گازاندەم لێ مەکەن بەڵکو گازاندە لە خۆتان بکەن. ئیستاش بە هانام بێن، من پاکانە لە هەمو هاوبەشپەرستیەکانتان دەکەم کە لە دنیادا کردوتانە، ئەمڕۆ ستەمکاران ئەشکەنجەیەکی پڕ لە ژان و ئازاریان دەدرێتێ﴾ ابراهيم: ٢٢.

وەڵلاهی خوایە! شەیتان هەر شەیتانە! لێرەدا کەسێتیە ڕاستەقینەکەی کتومت وەکو خۆی دەردەکەوێ هەروەکو چۆن کەسێتی زەبون و لوتبەرزەکان لە گفتوگۆکەدا دەرکەوت.

ئەوە ئەو شەیتانەیە کە خوتخوتە(وسوسة) دەخاتە دڵ، خەڵکی بەسەرپێچیکردن تەفرە داوەو بێبڕوایی ڕازاندۆتەوەو بەربەست و لەمپەری خستۆتە پێش خەڵکی تا بەدەم بانگەوازیەوە نەیەن.. خۆ ئەوە خۆیەتی ئەو قسانە دەکات و تەشەری زامئامێزیان تێدەگرێ، بە جۆرێك ئەوانیش ناتوانن وەلاّمی بدەنەوە –چونکە کار لە کار ترازاوە- ئەوە خۆ شەیتانە وا قسە دەکات، بەلاّم دوای ئەوەی تیر لە کەوان دەرچوە:

﴿إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾.

پاشان لە پای ئەوەدا کە شوێنی کەوتون و وەلاّمیان داوەتەوە قسەی وایان پێ

دەڵێ کە وەك خەنجەر وایە لە جەرگیان بدات. خۆ شەیتان هیچ زۆرکاریو دەسەڵاتی چاری ناچاری بەسەردا نەبون، ئەوە نەبێ کە لە کەسێتی خۆیان دەرچون و دوژمنایەتی کۆنی خۆیان و شەیتانیان لەبیر چو بوەوە، بۆیە وەڵامی بانگەوازی ناڕەوایان دابوەوەو بانگەوازی ڕەواشیان فەرامۆش کرد:

﴿وَمَا كَانَ لِي عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلاَّ أَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي﴾.

پاشان گازاندەیان لێدەکات و داوایان لێدەکا گازاندە لە خۆیان بکەن، گازاندەیان لە پای ئەوەدا لێدەکات کە بەگوێیان کردوە!

﴿فَلاَ تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ﴾.

پاشان دەستیان لێدەشواتەوەو پشتیان بەردەدا، کەچی هەر ئەویش بو لە پێشدا بەڵێن و مەڵێنی دەدانێ و هانی دەدان و دەیگوت بێمنەت بن هیچ کەسێك نیە پێتان بڵێ لە پشت چاوتان دو ئەبرۆیە، بەڵام هەنوکە ئەگەر هاواری وەبەر ببەن بە هانایانەوە ناچێت، هەروەك چۆن ئەگەر ئەو هانایان وەبەر ببات وەدەنگیەوە ناچن:

﴿مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ﴾

هیچ سەروساخت و هەرەوەزیشمان لە نێواندا نیە! پاشان بێسوچی خۆی لە هاوبەشپەرستکاریەکانیان دەردەبڕیو خۆی لێیان بێبەری دەکات:

﴿إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِي مِنْ قَبْلُ﴾

پاشان وتارە شەیتانیەکەی بە وتەیەکی جەرگبڕ کۆتایی پێ دێنیو دەڵێ:

﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾.

ئاخ لەو شەیتانە نەگریسە! ئای لە خۆیان بێکەسی! بە دنە و فریوەی شەیتان تەفرەیان خواردوە و! گوێڕایەڵی بون، بانگی کردون تا لالوتیو سەرسەختی لەمەڕ پێغەمبەران بنوێنن و ئەوانیش بە دەنگیەوە چون.[1]

---

[1] في ظلال القرآن: (٤/٢٠٩٥).

هـەروەها خـوا لــە شـوێنێكی تریشـدا باسـی مشـتومڕو گفتوگـۆی زەبـون و لوتبەرزەكان دەكات و دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُـــونَ عَنَّا نَصِيبًا مِنْ النَّارِ، قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُـــلٌّ فِيـــهَا إِنَّ اللَّـــهَ قَـدْ حَكَـمَ بَيْـنَ الْعِبَــادِ:

لە ناو ئاگری دۆزەخدا دەبێتە مشتومڕو دەمەقاڵێیان، زەبونەكان بـە لوتبـەرزەكان دەڵێن: ئێمە وا لـە دنیادا شوێنكەوتەی ئێوە بوین! ئایا دەتوانـن هـەندێكمان لـەو ئاگرە لە كۆڵ بكەنەوە؟ لوتبەرزەكان دەڵێن: كـێ دەتوانـێ ئێمەش وەكو ئێوە وا لە ناو ئاگر داین، خوا بڕیاری لە نێوان بەندەكانی داوە و بڕاوەتەوە﴾المؤمن: ٤٧-٤٨.

ئـەم ئایەتانــە لــە دوای گێڕانــەوەو باسوخواســی فیرعــەون هــاتون كــە چــۆن زەبروزەنگ و ستەمی پیادەكردوەو منداڵی ساوای كوشتوە. چۆن هەوڵی داوە موسا بكوژێ، چۆن بڕوادارەكە لە گەڵ فیرعەوندا ئاخافتوەو بیانو و هەنجەتەكانی پوچەڵ كردۆتەوە. گەل چۆن خۆی داوەتە دەست تا فیرعەون بە كەیفی خۆی منداڵ بكوژێ‌و خەڵك داپڵۆسێنێ‌و دەربەدەریان بكات. ئەوجا ئەوانەی یارمەتی‌و هاوكاری فیرعەون و تاوانكارەكانیان داوە لـە ڕۆژی دواییدا دەزانن چتۆ تاوان و ستەمیان كردوە، بـە سەركردەكانی فیرعەون ئاسا دەڵێن:

﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِنْ النَّارِ﴾ ؟

بەڵام ئاغاكانیان بە خۆیان هیچیان لە دەست نیە، ناتوانن شتێك بۆ خۆیـان بكـەن بۆیە دەڵێن:

﴿إِنَّا كُلٌّ فِيهَا إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ﴾

بەڵێ، ئەمەیە وەڵامی قسە فریوەدەرەكەی دنیایان كە دەڵێن: تۆ وەرە لەگەڵم بە گوناحت لەسەر من، ئەگەر گوناحتان هەبێ! هەڵبەت گوناحی ئەوانیشیان بۆ سەربار دەبێ بەڵام گوناحی شوێنكەوتوان لە كەم نابێتەوە:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُمْ بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُمْ مِنْ شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ، وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالاً مَعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ: **بێبڕواكان به بڕواداران دەڵێن وەرن به دوامان بكەون خەمی گوناحتان نەبێ ئێمە بۆتانی هەڵدەگرین، بەڵام درۆ دەكەن چونكە ناتوانن هیچ گوناحێكیان بۆ هەڵگرن. بەڵكو بێنەوەی گوناحی وان له كەم ببێتەوەو جگە له گوناح و تاوانی خۆیان تاوان و گوناحی ئەوانیشیان بۆ دەبێتە سەربار. لەڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەیەكی توندوتیژیان لە بابەت درۆ و دەلەسە و تۆمانجەكان لەگەڵدا دەكرێ﴾** العنكبوت:١٢-١٣.

**هەروەها لە شوێنێكی تریشدا باسی مشتومڕی زەبونەكان دەكات كە بە لوتبەرزەكان دەڵێن:**

﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ الظَّالِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِنْدَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ الْقَوْلَ يَقُولُ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لَوْلاَ أَنْتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ، قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا أَنَحْنُ صَدَدْنَاكُمْ عَنْ الْهُدَى بَعْدَ إِذْ جَاءَكُمْ بَلْ كُنتُمْ مُجْرِمِينَ، وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَنْ نَكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُ أَنْدَادًا وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوْا الْعَذَابَ وَجَعَلْنَا الأَغْلاَلَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ يُجْزَوْنَ إِلاَّ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: **ئەگەر ستەمكاران ببینی كە لەلای خوادا بۆ لێپرسینەوە ڕاگیراون، چۆن گازاندەو تۆمەتبارانی یەكتر دەكەن! زەبونەكان بە لوتبەرزەكان دەڵێن: ئەگەر لەبەر ئێوە نەبوایە ئێمەش دەبوینە بڕوادار، لوتبەرزەكان وەڵامیان دەدەنەوەو دەڵێن: ئەم بەزمە خۆشە! ئێمە نەمانهێشت ڕێنوێن بن؟! نەخێر بەڵكو بە خۆتان بێبڕوا و تاوانكار بون، زەبونەكان دەڵێن: نەء، بەڵكو فڕوفێڵ و فریودان و چەواشەكاری ڕۆژو شەوتان بو وای لێكردین، كە فەرمانتان پێدەكردین و هانتان دەداین بێبڕوا بین بە خوا و هاوەڵی بۆ بڕیار بدەین، ئینجا هەردو لایان كە ئەشكەنجەو سزای خوا دەبینن داخ و خەفەتان دەخەنە دڵ و ئێمەش كۆتیان لەگەردن دەئاڵێنین، تاوانكاران سزای كردەوەكانیان وەردەگرنەوە﴾**سبأ:٣١-٣٣.

شوێنکەوتە و زەبونە بێنمودەکان دەمڕاست و گەورەکانیان تۆمەتبار دەکەن و پێیان دەڵێن: ئێوە هۆی بێبڕواییمان بون، ئەگەر ئێوە نەبان بۆخۆمان لەگەڵ بڕواداران دەبوین، بەڵام ئەوان بەرپەرچی ئەم تۆمەتە دەدەنەوەو دەڵێن: ئێوە بە خۆتان تاوانکار بون، ئێمە چمان کردوە؟ تەنها بانگمان کردون و ئێوەش وەڵامتان داوەتەوە، خۆ دەسەڵاتی زۆرکاریمان بەسەرتاندا نەبوە، گەلی زەبون و گومڕاش دەڵێ: نەخێر، نەخشەکێشان و خەڵەتاندنی شەو و ڕۆژتان بو لە ڕاستەرێی لادان و گومڕای کردین، پلانگێران و بەکارهێنانی ئامرازی جۆراوجۆری جیاوازی ڕۆژگاران بو ناڕەوای کردە ڕەوا و ڕەوای کردە ناڕەوا و ئێمەی لەخشتە برد، ئەو هەمو گومان و تانەوتەشەرەی کە گەورەو سەرکردەکان بڵاویان دەکردەوە بونە هۆی گومڕابون و بێبڕوایی و هاوبەشپەرستیمان. بەڵام هەردو لایان تاوانبارن و ئەو قسانەش پاساویان ناداتەوە.

هەروەها لەکاتی چونە دۆزەخیشدا دەکەونە مشتومڕ، خوا دەفەرموێ:

﴿هَذَا وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ، جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ، هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ، وَآخَرُ مِنْ شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ، هَذَا فَوْجٌ مُقْتَحِمٌ مَعَكُمْ لاَ مَرْحَبًا بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُوا النَّارِ، قَالُوا بَلْ أَنْتُمْ لاَ مَرْحَبًا بِكُمْ أَنْتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا فَبِئْسَ الْقَرَارُ، قَالُوا رَبَّنَا مَنْ قَدَّمَ لَنَا هَذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي النَّارِ، وَقَالُوا مَا لَنَا لاَ نَرَى رِجَالاً كُنَّا نَعُدُّهُمْ مِنَ الأَشْرَارِ، أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الأَبْصَارُ، إِنَّ ذَلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ:

یاخیکاران هەوارگەیەکی خراپ و پڕ ناسۆریان دوچار دەبێ، کە دۆزەخەو دەچنە ناوی، بەڕاستی دۆزەخ شوێنێکی ناخۆشە، لە دۆزەخدا ئاوی کوڵاو و خێزاوی سوتاوان و چەندین خواردنەوەی ئاوا خراپ دەخۆنەوە، کە زاڵ و سەرسەختەکان دەبردرێنە ناو دۆزەخ ئاگرەوانەکان پێیان دەڵێن: ئەو کۆمەڵە خەڵکەش کە زەبونەکانن لەگەڵتان دێنە ژورەوە، ئەوانیش دەڵێن: یاخوە بەخێر نێن، ئەوانیش وەڵامیان دەدەنەوە: ئێوە بەخێر نێن، ئێوە بونە هۆی ئەوەی بێینە دۆزەخ، بەڕاستی دۆزەخ سەقامگەیەکی ناخۆشە، زەبونەکان دەڵێن: پەروەردگار! دوقات سزای ئەو کەسانە بدە کە بونە هۆی چونە دۆزەخمان، ئینجا دەڵێن: ئەدی کوانێ بۆ ئەو پیاوانە لە دۆزەخدا نابینین کە پێمان وابو

بەدکارن و لە دنیادا گاڵتەمان پێ دەکردن؟! بەڵام ئەمڕۆ چاویان پێیان ناکەوێ چونکە ئەوان وا لە بەهەشتێدان، ئەم مشتومڕو گفتوگۆیە گومانی تێدانیە دۆزەخیەکان لە ڕۆژی دواییدا دەبێ وابڵێن.﴾ص: (٥٥-٦٤).

بەڵێ. ئەوانەی کە لە دنیادا بەو هەمو گەرم و گوڕی و پێشوازیە پڕ ڕێزەوە یەکتریان بەخێر دێنا! ئەمڕۆ دەڵێن:

﴿لاَ مَرْحَبًا بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُوا النَّارِ، قَالُوا بَلْ أَنْتُمْ لاَ مَرْحَبًا بِكُمْ﴾

هەر کۆمەڵە و حەز دەکات ئەوانیتر زێتر ئەشکەنجە و سزا بچێژن، ئەم دیمانەیە گومانی تێدا نیەو دۆزەخیەکان ئەو مشتومڕە بەرپا دەکەن.

## ٤) مشتومڕی نێوان بێبڕواو هاودەمەکەی:

مشتومڕ لە نێوان بێبڕواو هاودەمە شەیتانەکەشی ڕودەدات، خوا دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ قَرِينُهُ هَذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ، أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ، مَنَّاعٍ لِلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُرِيبٍ، الَّذِي جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ، قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَكِنْ كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ، قَالَ لاَ تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُمْ بِالْوَعِيدِ، مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَا أَنَا بِظَلاَّمٍ لِلْعَبِيدِ:

فریشتەی هاودەم و دیدەوان دەڵێ: پەروەردگار! هەرچی کارو کردەوەی ئەم ئادەمیەیە هەموی ئەوەتانێ لەلای منە و تۆمارم کردوە، ئینجا خوا دەفەرموێ: هەمو بێباوەڕێکی سەرکەش و لامل فڕێ دەنە ناو دۆزەخ کە هەمیشە قەدەغەی لە خێر و چاکە کردوە و مافی خەڵکی پێشێل کردوەو گومانی هەبوە و خەڵکیشی بە گومان دەخست و هاوەڵی بۆ خوا بڕیار دەدا، بیبەن فڕێی بدەنە نێو دۆزەخ، هاودەمە شەیتانەکەشی پاکانە دەکات و دەڵێت: پەروەردگار! خۆ من لە خشتەم نەبردوەو من توشی یاخیکاریم نەکردوە بەڵکو بۆ خۆی تاوانبار بو و لە نێو گومڕایی بێ بندا نغرۆ ببو. خوا دەفەرموێ: لەلای مندا مشتومڕ مەکەن بڕیاری من هەڵناوەشێتەوە و پێشتر هەڕەشەم لێکردبون، من ستەمکار نیم و ستەم لە هیچ کەسێکیش ناکەم.﴾ق:(٢٣-٢٩).

٥) مشتومڕی نێوان مرۆڤ و جەستەی خۆی:

مرۆڤ ئەو کاتە دەگاتە لوتکەی رقەبەرایەتی کە لەگەڵ جەستەی خۆی دەکەوێتە مشتومڕ:

﴿وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ، حَتَّى إِذَا مَا جَاءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ، وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ: لەو رۆژەدا دوژمنانی خوا بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن و کۆدەکرێنەوە، هەر هەموویان لە یەکەمیانەوە تا دواهەمینیان دەبرێنە دۆزەخ، تا ئەو کاتەی بۆ لای ئاگرەکە دێن، گوێ و چاو و پێستیان گشتی گەواهی لە دژ دەدەن و کردەوەکان یەك یەك ئاشکرا دەکەن، بە پێست و ئەندامەکانیان دەڵێن: بۆ گەواهیتان دا؟ دەڵێن: بە دەست خۆمان نەبو ئەو خوایە بە قسەی هێناین کە دەتوانێ هەمو شتێك بە قسە بێنێ. هەر خواش یەکەمجار بەدیهێناون و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە، ئێوە کە گوناحتان دەکرد خۆتان لە گوێ و چاو و پێست نەدەشاردەوە و پەرواتان نەبو گەواهیتان لە دژ بدەن بەڵام خۆتان لە خەڵك دەشاردەوە و گومانتان وابو خواش وەکو خەڵك لە کردەوەتان بێئاگایە. ئەوەبو گومانی بەدتان تا توشی ئەو کارەساتەی کردن و هاتنە ریزی دۆڕاوەکان.﴾فصلت: (١٩-٢٣).

بێبڕواکان کە ئەشکەنجەی سەخت و کارەساتی پڕ ناسۆر دەبینن، پەنا دەبەنە بەر درۆو نەسەلماندن و دەڵێن ئێمە چاکەکار و پیاو چاك بوین و گەواهی فریشتە و پێغەمبەران و پیاوچاکانیش ناسەلمێنن، ئەوجا خوای بە توانا دەمیان دەبەستێ و دەست و پێیان بە قسە دێنێ: هەی تونا و تون بن خۆ ئێمە لەبەر ئێوە ئەو هەمو مشتومڕە دەکەین.

موسلیم و تیرمذی و مەردەوێ و بەیهەقی تەخریجیان کردوە، کە ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە و دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((يلقى العبد ربه، فيقول الله: ألم أكرمك وأسودك وأزوجك، وأسخر لـــك الخيـــل والإبل، وأذرك ترأس وتربع فيقول: بلى أي رب، فيقول: أفظننت أنك ملاقي؟ فيقـــول: لا، فيقال: إني أنساك كما نسيتني، ثم يلقى الثاني، فيقول له مثل ذلك، ثم يلقى الثـــالث فيقول له مثل ذلك، فيقول: آمنت بك وبكتـــابك وبرســولك، وصليـــت وصمـــت وتصدقت، ويثنى بخير ما استطاع، فيقول: ألا نبعث شاهدنا عليك، فيفكر في نفسه مـــن الذي يشهد علي؟ فيختم على فيه، ويقال لفخذه انطقي، فتنطق فخذه وفمـــه وعظامـــه بعمله ماكان، وذلك ليعذر من نفسه، وذلك المنافق، وذلـــك الـــذي يســـخط عليـــه:

بەندە دەچێتە دیداری خوا تا لێپرسینەوەی لە گەڵدا بکات و خوا پێی‌دەڵێ: ئەدی ڕێزم لێ نەنای و ماڵ و سامان و ژن و خێزانم پێ نەبەخشی؟ ئەسپ و ماین و وشترم بۆ ڕام نەکردی؟ نەمکردیە سەرۆك؟ بە سەرکردە نەمهێشتیەوە؟ نەمکردیە خاوەنی زەوی و زارو خانو؟ لە بەخششەکانی من بەهرەمەند نەبوی؟ دەڵێ: بەڵێ. خوا دەفەرموێ: پێت وابو پێم دەگەی؟ دەڵێ: نەخێر، خواش پێی دەڵێ: کەواتە چۆن منت لەبیر چوەوەو منت نەدەناسیو نەتپەرستوم، منیش تۆ لە بیر خۆم دەبەمەوە. پاشان هەمان پرسیار لە دوەم کەس و سێیەم کەسیش دەکات، هی سێیەم دەڵێ: پەروەردگارم! بڕوام بە تۆو بە پەرتوك و پەیامبەرانت هەبو، نوێژو ڕۆژو و زەکاتم جێبەجێ کردوە، چەندی پێی بکرێ بە خۆیدا هەڵدەڵێ. خوا پێی دەفەرموێ: دە لێرەبە ئێستا گەواهیدەری خۆمت بەسەردا ڕادەبورم، ئەویش لە دڵی خۆیدا دەڵێ: دەبێ کێ گەواهیم لە دژی بدات؟ ئەوجا مۆر لە دەمی دەدرێو دەمبەستی دەکات، فەرمان بە ڕان و گۆشت و ئێسقانی دەکرێ قسە بکەن. ئەوانیش هەرچی کردویەتی ئاشکرای دەکەن، بۆیە ئەندامەکانی خۆی گەواهی لەسەر دەدەن تا هیچ پاساو و بەهانەی نەمێنێ، ئەو کەسە دوڕویێکە، خوا خەشمی لێدەگرێ))[1].

ئەم گفتوگۆیەی نێوان بەندە و ئەندامەکانی لەشی گەلێك جێی سەیرمان و سەرسامبونە، تەنانەت پێغەمبەرﷺ پێکەنیوە، لە فەرمودەیەکی موسلیمدا ئەنەسی

---

[1] رواه مسلم في صحيحه: (٤/٢٢٨٠) ژمارە: ٢٩٦٩.

کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە لای پێغەمبەر ﷺ دابوین پێکەنی و فەرموی: ((دەزانن لەبەر چ پێدەکەنم؟ گوتیان: خواو پێغەمبەر زاناترن. فەرموی: گفتوگۆی بەندەم پێ سەیر بو کە لەگەڵ خوادا قسە دەکات و دەڵێ: پەروەردگار! ئەدی بەڵێنت پێنەداوم ستەمم لێنەکەی؟ دەفەرموێ: بەڵێ، دەڵێ: دەنا جگە لە خۆم بە کەسیتر ڕازی نیم گەواهیم لەسەر بدا. دەفەرموێ: گەواهیدانی خۆت و فریشتە نوسەرەکانت بەسە. ئینجا مۆری لە دەم دەدرێ و فەرمان بە ئەندامەکانی دەکرێ قسە بکەن. ئەوانیش هەمو کردەوەکان باس دەکەن، کە لە قسەکەیان دەبنەوە پێیان دەڵێ: یاخوە قەت خێرو خۆشی لە خۆتان نەبینن خۆمن لە دنیادا بۆ ئێوە تێدەکۆشام!)).

## ٦) مشتومڕی نێوان گیان و جەستە:

ئیبنو کەثیر دەڵێ: ((ئیبنو موندە لە پەرتوکی (الروح)دا لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: خەڵك لە ڕۆژی زندوبونەوەدا مشتومڕ دەکەن تەنانەت گیان و جەستەش. گیان بە جەستە دەڵێ: تۆ وات کرد، جەستە دەڵێ: نەخێر تۆ فەرمانت کردو تۆ جڵەوت شۆڕ کرد.

خواش فریشتەیەك دەنێرێ و ناوبژییان لە نێواندا دەکات و پێیان دەڵێ: ئێوە وەکو چاو ساغێکی ئیفلیج و کوێرێك وان، ئیفلیجەکە بە کوێرەکە دەڵێ: من وا لێرێهێدا بەری درەختان دەبینم بەلام نایگەمێ بۆیە دەڵێ: هەڵمگرە تا بیچنم، ئەویش هەڵیگرێ و لێی بکاتەوە، ئایە کامیان تاوانبارە؟ دەڵێن: هەردوکیان. فریشتەکەش پێیان دەڵێ: کەواتە خۆتان بڕیارتان دا. واتە جەستە وەك سواری وایە بۆ گیان گیانیش سوارەکەیە)).[1]

## ٧) هەروەها خۆیان و یەکتریش دەرقێنن:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِنْ مَقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ﴾: بێبڕواکان کە ڕقی خۆیان بەدیار دەخەن فریشتەکان پێیان

---

[1] تفسير ابن كثير: (٦/٩٢).

دەڵێن: بزانن کە ڕق و تووڕەیی و خەشمی خواتان گەلێك لە هی خۆتان گەورەترە چونکە ئێوە کە بۆ بڕوا هێنان بانگ دەکران بێبڕواییتان دەکرد﴾ المؤمن: ١٠.

هەروەها ڕقی خۆیان بەرامبەر هەمو برادەرو هاوڕێباز و ئازیزە بێبڕواکانیان هەڵدەڕژن و داوا دەکەن ئەشکەنجەی زیاتریان بدرێتێ:

﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَالَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَ، وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَ، رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا: لە ناو ئاگری دۆزەخدا ڕویان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکرێ ئەوکات دەڵێن: خۆزیا گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ببواین. هەروەها دەڵێن خوایە ئێمە گوێڕایەڵی گەورەو سەرسەختەکانمان بوین ئەوان فریویان داین و ڕێی ڕاستیان لێ بزر کردین، پەروەردگارا! دو قات سزایان بدە و نەفرەتێکی گەورەیان لێبکە﴾الأحزاب:٦٦-٦٨.

لە گومڕاکەرو فریودەرەکانیان هێند تووڕەو داخ لە دڵن بۆیە لە خوا دەپاڕێنەوە تا بیانخاتە ژێر پێیان:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الأَسْفَلِينَ: بێبڕواکان دەڵێن: پەروەردگارا! ئەو مرۆڤ و جنۆکانەمان پێ نیشان بدە کە گومڕایان کردین تا بیانخەینە ژێر پێ و ڕیسواو سەر شۆڕ بن.﴾فصلت: ٢٩.

کە دەخرێنە ناو ئاگریش دەنگی نەفرەتکارییان لێ بەرز دەبێتەوە هەریەکەو حەز دەکات ئەوەی تر سزاو ئازاری زۆرتری بەرکەوێت:

﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّى إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لأولاَهُمْ رَبَّنَا هَؤُلاَءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِنَ النَّارِ: هەرجارەی نەتەوەیەك دەخرێتە ناو دۆزەخ نەفرەت لە نەتەوەی پێشە خۆی دەکات تا هەر هەمویان لە ناو ئاگردا کۆ دەبنەوە ئینجا پاشینەکان بە پێشینەکان (ئەوانەی زوتر خراونەتە دۆزەخ) دەڵێن: پەروەردگارا!! ئەوانە بون کە گومڕایان کردین، خوایە دوقات سزایان بدە﴾ الأعراف: ٣٨.

## جیَباسی دووەم

# ڕەوشی بڕوادارانی گوناحبار

بڕوادار هەیە گوناح دەکات و بەهۆی گوناحەکانیەوە دوچاری سەختی و ناخۆشی و زەحمەتی زۆرو دژوار دەبێ. ئێمەش لەم جێباسەدا باسی ڕەوشی هەندێ لەو گوناحبارانە دەکەین ئاخۆ بزانین بە چ کارەساتێکەوە گرفتار دەبن.

## خوازگەی یەکەم

## ئەو کەسانەی زەکات نادەن

یەکێك لە مافە هەرە گەورەکانی خوا دەرکردنی زەکاتە، مافێکە دەبێ لە ماڵ و دارایی دەرکرێ. بەڵام ئەوانەی ئەو مافە نابەخشن ئەوا لە زندوبونەوەدا بە هۆی ئەو ماڵ و داراییەوە توشی ئەشکەنجەیەکی پڕ لە ژان و ئازار دەبن.. لە ئایەت و فەرمودانda یادی زۆر جۆرە سزا کراوە:

**یەکەم**: ماڵەکەی لێ دەبێتە ئەژدیهایەکی ترسناك. لە صەحیحی بوخاریدا ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((من آتاه الله مالاً فلم يؤد زكاته مثل ماله يوم القيامة شجاعاً أقرع له زبيبتان يطوقه يوم القيامة ثم يقول: أنا مالك أنا كنزك، ثم تلا: ﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾آل عمران: ١٨٠:

هەر کەسێك خوا ماڵ و دارایی بداتێ و زەکاتی لێ دەر نەکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ماڵەی لێ دەبێتە نێرەمارێکی کەچەڵ و سەرگەڕی ژەهردار، دو خاڵی ڕەش

لەسەرچاوەكانی هەیە و دو كەڵبەی دەرپەڕیوی لە دەمدایە، وەك كەڵەمە لە گەردنی دەئاڵێ و بەهەردو لا لغاوەیدا دەنوسێ. سەرێكی بە لایەك و كلكی بە لایەكەی تری لا لغاوەكەیدا گیر دەكات و پێی دەڵێ: منماڵەكەتم! من گەنجینەكەتم!. پاشان پێغەمبەرﷺ ئایەتەكەی خوێندەوە -واتاكەی-: ئەوانەی رژدی و چروكی لەو ماڵە دەكەن كە خوا پێی بەخشیون، با وانەزانن مایەی خێر و خۆشییانە، نەخێر، بەڵكو بۆ پاشەڕۆژیان وێرانیەو لە رۆژی قیامەتدا ئەو ماڵ و سامانەی لەبەر رژدی و پیسكەیی نەیانبەخشیوەتە هەژاران، دەبێتە تەوقی ئاسنین و دەكرێتە ملیان)).

دوەم: ئەگەر ماڵەكەی دراو و زێر و زیو بێ ئەوا دەبێتە تەختەی ئاگرین و پێی داغ دەكرێ، ئەگەر مەڕ و ماڵات و وشتر و مانگا و ئاژەڵیش بێ ئەوا لە خاوەنەكانیان بەردەدرێ و سزایان دەدەن، خوا دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ: مژدەی سزایەكی بە سفت و سوێ بەوانە بدە كە هەر زێڕ و زیو دادەگرن و لە پێناوی خوا خەرجی ناكەن، رۆژێك دادێ ئەو گەنجینەیان لەناو ئاگری دۆزەخدا سور بكرێتەوە، تا دەبێتە یەك پارچە ئاگر ئەوجا نێوچەوان و پشتیانی پێ داغ دەكرێ، فریشتەی ئاگرەوانیش بە تەوس و سەركۆنەوە پێیان دەڵێن ئەشكەنجەی گەنجینەكەتان بچێژن.﴾التوبة: ٣٤ ٣٥.

لە صەحیحی موسلیمدا ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((ما من صاحب ذهب ولا فضة لا يؤدي فيها حقها إلاّ إذا كان يوم القيامة صفحت له صفائح من نار فأحمي عليها في نار جهنم فيكوى بها جنبه وجبينه وظهره كلما بردت أعيدت عليه في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة حتى يقضى بين العباد فيرى سبيله إما إلى الجنة وإما إلى

مشكاة المصابيح: (١/٥٥٩) ژمارە: ١٧٧٤.

النار. قيل: يا رسول الله فالأبل؟ قال: ولا صاحب إبل لا يؤدي منها حقها، ومن حقها حلبها يوم وردها، إلاّ إذا كان يوم القيامة بطح لها بقاع قرقر أوفر ما كانت عليه، لا يفقد منها فصيلاً واحداً تطؤه بأخفافها وتعضه بأفواهها. كلما مرَّ عليه أولاها ردَّ عليه أخراها في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة حتى يقضى بينَ العباد، فيرى سبيله إما إلى الجنة وإما إلى النار. قيل: يا رسول الله فالبقر والغنم؟ قال: ولا صاحب بقر ولا غنم لا يؤدي فيها حقها إلاّ إذا كان يوم القيامة بطح لها بقاع قرقر، لا يفقد منها شيئاً ليس فيها عقصاء ولا جلحاء ولا عضباء تنطحه بقرونها وتطؤه بأظلافها، كلما مرَّ عليه أولاها ردَّ عليه أخراها في يوم كان مقداره خمسين الف سنة، حتى يقضي الله بين العباد، فيرى سبيله إما إلى الجنة وإما النار:

ئەو کەسەی خاوەنی زێڕو زیو بێ و زەکاتی لێ دەرنەکا لە ڕۆژی دواییدا ئەو زێڕ و زیوە لە ناو ئاگری دۆزەخدا سور دەکرێتەوە تا دەبێتە یەك پارچە ئاگری سور، ئەوجا تەنیشتیو نێوچەوانی و پشتی و تەواوی جەستەی پێ داغ دەکرێ، هەر جارەی کە سارد دەبێتەوە دوبارە سوری دەکەنەوەو داغی دەکەنەوە، ئیتر لەم ڕۆژەی کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە تا بەندەکان لێپرسینەوەیان تەواو دەبێ ڕەوش(حال)ی کابرای زەکات نەدەر هەر بەمجۆرەیە، پاشان ڕێگەی خۆی پێ نیشان دەدرێ جا یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ!، پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەدی وشتر؟ فەرموی: ئەوەی وشتری هەبێ و مافی مافدارانی لێ نەدات لە ڕۆژی قیامەتدا لەپەوڕو لەسەر زەمینێکی بەردەڵانیدا ڕایدەخەن، وشترەکان زۆر زەبەللاح و فیلە تەنن تەنانەت پارێنەیەکیشیان نەقوستان نیە، هەمو وشترەکان یەك بە دوای یەك پێخوستی دەکەن و قەپی لێ دەگرن، جا کە نۆرە تەواو بو دیسان سەرلەنوێ پێیدا دێنەوە ئیتر لەو ڕۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە تا بەندەکان دادگایی دەکرێن ڕەوشیان بەمجۆرەیە، ئەوجار ڕێگەو جێگەی خۆیان پێ نیشان دەدەرێ یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ.. پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەدی ڕەشە وڵاخ و بزن؟ فەرموی: ئەو کەسەی ڕەشە وڵاخ و بزن و مەڕی هەبێ و زەکاتی لێ نەدات ئەوا لە زەمینێکی

بەردەڵانیدا لەسەر دەم پاڵی پێ دەدەنەوە، هەمو مەڕ و بزنەکان ئامادە دەبن و میچکامێکیان نەقوستان نیە، هەروەها هەمویان زرت و ئامادەن بۆ شەڕە قۆچ و شۆق وەشاندن هیچێکیان قۆچ خوار و کوڵ شکاو نین، ئیتر دەیدەنە بەر قۆچان و بە سم گێرەی دەکەن، جا کە سەرجەمیان بەسەریدا رابورین و تەواوبون دیسان سەرلەنوێ لە یەکەمیانەوەڕا دەست پێ دەکەنەوە، تا ئەو کاتەی خوا دادگایی بەندەکانی دەکات کە رۆژەکەی پەنجا هەزار ساڵ درێژە رەوشی ئەو زەکات نەدەرە بەم جۆرەیە، پاشان رێگەو جێگەی خۆی پێ نیشان دەدرێ یان بۆ دۆزەخ یان بۆ بەهەشت))[1].

---

[1] رواه مسلم، في كتاب الزكاة، باب إثم مانع الزكاة، (٢/٦٨٠) ژمارە (٩٨٧) ئەم فەرمودەیە لە صەحیح و سونەنەکانیشدا هەیەو پتر لە یاوەرێك گێراویە، بگەرێوە بۆ جامع الاصول: (٤/٥٥٤).

### خوازگەی دووەم

## خۆ بە گەورەزان و فیزبەرزان

لە روانگەی شەرعی خواوە خۆ بە گەورەزانین و کەشوفشکردن و لاف لێدان تاوانێکی گەلێك گەورەو ناقۆلایە. خوا زۆری ڕق لەو جۆرە کەسانە دەبێتەوەو بە چاوی بێبەزەیی تەماشایان دەکات. لە ژینەوەدا بە زەبونیو ریسواییو بێنرخی زندو دەبنەوە. تیرمذی لە عەمری کوڕی شوعەیب و ئەویش لە باوکیو ئەویش لە باپیری دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((یحشر المتکبرون أمثال الذر یوم القیامة في صور الرجال یغشاهم الذّلّ في کل مکان: خۆ بەگەورە زانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا لە شێوەی خۆیان بەلام بە قەبارە بچوکی وەکو گێرکە زندو دەکرێنەوە، لە هەمو لایەکەوە دەکەونە ژێر پێیان و زەبون و ریسوا دەبن)).[1]

خوا وەك چۆن خەشم و ڕکی لە خودی فیزبەرزەکان هەیە ئاوەهاش ڕکی لەو ناوانە دەبێتەوە کە واتای لاف و گەزاف و خۆ هەڵکێشانی لێ دەفامرێتەوە، لە لاشیدا ناخۆشترین و بەدترین ناو و نرتکە.

بوخاری و موسلیم و تیرمذی لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((أخنع اسم عند الله یوم القیامة رجل تسمی ملك الأملاك: ریسواترین و بێنرخترین ناو لە ڕۆژی قیامەتدا لە لای خوا هی ئەو کەسەیە کە ناوی لە خۆی ناوە پاشای مولکان))

---

[1] مشکاة المصابیح: (٢/٦٣٥) ژمارە: ٥١١٢ واسنادە حسن کما قال محقق المشکاة.

**لە بێژانەوەی موسلیمدا ئەوەندەی پترە: ((لا مالك إلاّ الله ﷻ: چونکە هیچ پاشایەك نیە جگە لە خوای بالاّدەست و بە شکۆ)).**

**موسلیم و ئەحمەدیش بەم واژەیەیان بێژاوەتەوە: ((أغيظ رجل على الله يوم القيامة وأخبثه وأغيظه عليه، رجل كان يسمى ملك الأملاك، لا ملك إلاّ الله: لە ڕۆژی قیامەتدا خوا لەهەمو کەس زێتر ڕقی لەو پیاوە دەبێتەوەو لە لایدا لە هەمو کەس پیسترە کە ناوی لە خۆی ناوە پادشای ماڵ و مولکان، چونکە جگە لە خوا پادشایتر نیە))[1].**

**قازی عیاض دەڵێ: اخنع واتە بێنرخترین ناو. ئیبنو بەطال دەڵێ: جا ئەگەر ناوەکە بێنرخترین و ریسواترین ناو بێ کەواتە ناودارەکەش لەهەمو کەس ڕیسواترو بێنرخترە.[2]**

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/ ٦١٩) ژمارە (٩١٤).

[2] فتح الباري: (١٠/٥٨٩).

## خوازگەی سێیەم

# ئەو گوناحکارانەی کە خوا قسەیان لە گەڵدا ناکات و پاکیان ناکاتەوە

هەندێ جۆرە گوناح و تاوان هەن خوا هەڕەشەی کردوە کە هەر کەسێکی بیانکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا خوا قسەیان لە گەڵدا ناکات و خاوێنیان ناکاتەوەو سزای توندو پڕ لە ئەشکەنجەشیان پێ دەچێژێ.

قەشەو حاخام و زاناکان جۆرێکیانن ئەوانەی کە لەبەر دڵی فەرمانڕەوایەك یا لە پێناو بەرژەوەندیو وەدەستهێنانی کاڵاو پاڵایەکی دنیاییدا فەرمان و پەیامی خوا دەشارنەوە. یاخود وەکو ئەو قەشە و حاخامانەی کە لە پەرتوکەکەیاندا ئاکارو ئەدگاری پێغەمبەرﷺی تێدا باس کراوە و سوڕ دەیانزانی موحەممەد پێغەمبەرە کەچی دەیانشاردەوەو ئینکارییان لێ دەکرد. خوا لە بارەی ئەو جۆرە کەسانەوە فەرمویەتی:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنْ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّارَ وَلاَ يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوْا الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ فَمَا أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ: ئەوانەی ئەو ئایەتانە دەشارنەوە کە خوا لە تەوراتدا دایبەزاندوە تا نرخێکی کەمی دنیایی پێ پەیدا بکەن، هەڵبەت ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاگر ورگیان پڕ دەکات و خواش قسەیان لەگەڵدا ناکات و لە گوناح پاکیان ناکاتەوەو سزایەکی بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە. ئەوانە ڕێنوێنی و لێبوردەنییان فرۆشتوەو گومڕاییو سزایان پێکڕیوە، ئا ئەوانە دیارە لەئاگر ناترسن و بوێرن بەرامبەر بەم ئاگرە﴾البقرة: ١٧٤-١٧٥.

ئیبنو کەثیر ﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ﴾ دەڵێ: (چونکە خوا زۆریان لێ تورەیە، ئەوەی زانیویانە شاردویانە، بۆیە شایستەی خەشمن، خوا تەماشایان ناکات و پاکیان ناکاتەوە، واتە ستایشیان ناکات و پێیاندا هەڵناڵێ، بەڵکو سزایەکی پڕ لە ئەشکەنجەیان دەدات)).[1]

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((من سئل عن علم فكتمه ألجم يوم القيامة بلجام من نار: هەر کەسێك پرسیاری زانستێکی ئاینی لێبکرێ، ئەویش بە بێ بەهانەو بیانو وەڵامی نەداتەوەو بیشارێتەوە ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا بە لغاوێکی ئاگر لغاو دەکرێ)).[2]

لە بێژانەوەیەکی ئیبنوماجەدا دەڵێ:

((ما من رجل يحفظ علماً فيكتمه إلاّ أتى يوم القيامة ملجوماً بلجام من نار: هەر پیاوێك زانستێکی ئایینی بزانێو بیشارێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بە لغاوی ئاگر لغاو کراوە)).[3]

جۆرێکیتر لەو کەسانەی کە خوا لە ژیانەوەدا خەشمیان لێدەگرێو قسەیان لەگەڵدا ناکات و پاکیان ناکاتەوە؛ ئەو کەسانەن کە پەیمانی خۆیان لەگەڵ خوا هەڵدەوەشێننەوەو سوێندی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن و لە پێناو دەسکەوتی دنیاییدا سوێندی گەورە گەورە دەخۆن. خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُولَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ:

---

[1] تفسير ابن كثير: (١/٣٦٣).

[2] رواه أبو داود والترمذي وحسنه، وابن ماجة وابن حبان في صحيحه والبيهقي ورواه الحاكم بنحوه وقال صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه.

[3] الترغيب والترهيب للحافظ المنذري: (١/٩٧).

ئەوانەی پەیمانی خواو سوێندی خۆیان بە نرخێکی بێبەها دەفرۆشن، لە ڕۆژی قیامەتدا لە بەهرە و بەخششی خوا بێبەشن و خوا قسەیان لە گەڵدا ناکات و تەماشایان ناکات و لە گوناحیان خۆش نابێ، هەروەها سزای سەخت و بە ئازاریان پێ دەدرێ﴾آل عمران: ٧٧.

ئیبنو کەثیر زۆر فەرمودەی لەم بارەوە هێناوەتەوە: یەکێکیان ئەو فەرمودەیە کە موسلیم و ئەهلی سونەن و ئەحمەد لە ئەبو ذەریان گێڕاوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((ثلاثة لا يكلمهم الله و لاينظر إليهم يوم القيامة و لايزكيهم ولهم عذاب أليم: سێ جۆرە کەس هەن خوا لە ڕۆژی قیامەتدا قسەیان لە گەڵدا ناکات و پاکیان ناکاتەوەو تەماشایان ناکات و سزایەکی بەئێش و ئازاریان بۆ هەیە)).

ئەبوذەر دەڵێ: منیش گوتم: بە خوا خراپیان بەسەر هاتوە و خراپ دۆڕاون. ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ دەڵێ: سێ جاران پێغەمبەر ﷺ هەر ئاوەهای فەرمو ئینجا فەرموی:

((المسبل، والمنفق سلعته بالحلف الكاذب، والمنان: ئەو کەسەی کە بۆ کەش و فش و تەنتەنە و لاف و گەزاف جل و شەرواڵی شۆڕ دەکات. ئەو کەسەی کە سوێندی درۆ دەخوات تا کەلوپەل و کاڵاکەی بفرۆشێ. ئەو کەسەی کە لە چاکە و خێرکردندا منەتان دەکات)).

بوخاری‌و موسلیم لە عەبدوڵلاوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((من حلف على يمين وهو فيها فاجر ليقتطع بها مال أمرىء مسلم لقي الله ﷻ وهو غضبان: هەر یەکێك بە ساختەو درۆ سوێند بخوات تا قۆڵی موسڵمانێك ببڕێ ئەوا کە دەگەڕێتەوە لای خوا، خوا زۆری لێ تورەیە)).

بوخاری لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئەوفا دەگێڕێتەوە کە جارێکیان پیاوێك شمەکێکی هێنایە بازاڕ و سوێندی بە درۆی لەسەر خواردو گوتی ئەوەندەم پێداوە،

کەچی ئەو هەندیشی پێنەدابو. بۆیە سوێندەکەی خوارد تا موسڵمانێکی پێ هەڵخەڵەتێنێ. ئینجا خوا لەم بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ آل عمران: ٧٧.

❖ ئەحمەد و ئەبو داودو تیرمذی لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێرنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة ولا ينظر إليهم، ولا يزكيهم، ولهم عذاب أليم: رجل منع ابن السبيل فضل ماء عنده، ورجل حلف على سلعته بعد العصر، يعني كاذباً، ورجل بايع إماماً، فإن أعطاه وفى له، وإن لم يعطه لم يف له: سێ جۆرە کەس لە ڕۆژی دواییدا خوا نە قسەیان لە گەڵدا دەکات و نە تەماشایان دەکات و نە پاکیان دەکاتەوەو سزایەکی سەخت و بەژانیشیان دەدرێتێ کە ئەمانەن: پیاوێك ئاوی زیادی لە لایە و نایداتە ڕێبواری تێنو و شەکەت، پیاوێك سوێندی درۆ لەسەر ماڵەکەی بخوا، پیاوێك پەیمان بە پێشەوایەك بدات، جا ئەگەر شتی پێبەخشی ئەوا پابەندی پەیمانەکەی دەبێ، بەڵام ئەگەر پێی نەبەخشی ئەوا پابەند نابێ))[1] تیرمذی دەڵێ: فەرمودەیەکی حەسەنی صەحیحە.

❖ بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة و لاينظر إليهم: رجل حلف على سلعته: لقد أعطي بها أكثر مما أعطي وهو كاذب، ورجل حلف على يمين كاذبة بعد العصر ليقتطع بها مال أمرئ مسلم،ورجل منع فضل ماء، فيقول الله يوم القيامة: اليوم أمنعك فضلي، كما منعت فضل ما لم تعمل يداك: سێ جۆرە کەس هەن خوا نە قسەیان لە گەڵدا دەکات، نە تەماشایان دەکات: پیاوێك بە درۆ سوێند لەسەر ماڵەکەی بخوات و بڵێ بەو خوایە ئەوەندە پارەم پێداوە کەچی واش نەبێ. پیاوێك بە درۆ سوێند بخوات تا قوڵی موسڵمانێکی پێببڕێ،

---

[1] ئەم فەرمودانە لە تەفسیری ئیبنو کەثیر: (٢/ ٦٠) دا تەماشا بکە.

پیاوێك ئاوی زیادی لە لا بێ‌و نەیداتە تێنوان، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا پێی دەڵێ، وەك چۆن تۆ لە دنیادا ئاوی زیادت بە خەڵك نەدەدا ئەمڕۆ منیش لە چاکەی خۆم بێبەشت دەکەم))[1]

جگە لەم جۆرە کەسانە کەسانی تریش هەن وەکو پیری زیناکەر، سەرۆکی درۆزن، هەژاری لوتبەرز، ئازاردەری دایك و باوکان، ئافرەتی لاساکەرەوەی پیاوان، گەواد، ئەو کەسەی لە کۆمەوە لەگەڵ ژنەکەی سەرجێیی دەکات، ئەو کەسەی بۆ لوتبەرزی جلی شۆڕ دەکات، ئەمانەش لە ڕۆژی دواییدا خوا نە قسەیان لە گەڵدا دەکات، نە پاکیان دەکاتەوە نە تەماشایان دەکات:

❖ لە صەحیحی موسلیم و سونەتی ئیبنو ماجەدا هاتوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة، ولا يزكيهم، ولا ينظر إليهم، ولهم عـــذاب أليـــم: شيخ زان، وملك كذاب، وعائل مســـتكبر: ئەم سێ‌کەسە لە ڕۆژی زندوبونەوەدا خوا نەقسەیان لە گەڵ دەکات نە پاکیان دەکاتەوەو نە تەماشاشیان دەکات، وێڕای ئەمەش سزایەکی سەخت و بە ئازاریان هەیە کە ئەمانەن: پیری شەڕواڵ پیس، پاشای درۆزن، هەژاری فیزبەرز))[2].

❖ لە موسنەدی ئەحمەد و سونەنی نەسائی و موستەدرەکی ئەلحاکم، عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ثلاثة لا ينظر الله اليهم يوم القيامة: العاق لوالديه والمــــرأة المترجلـــة المتشـــبهة بالرجـــال والديوث: لە ڕۆژی دواییدا خوا تەماشای ئەم سێ کەسانە ناکات: ئەو کەسەی ئازاری داك و بابی دەدات، ئەو ئافرەتەی خۆی بە پیاوان دەچوێنێ، پیاوێك ناموسی خۆی بەربەرەڵا بکات(گەواد)))[3].

---

[1] صحيح البخاري، كتاب التوحيد، باب قول (وجوه يومئذٍ ناظرة)، فتح الباري (٤١٩/١٣).

[2] صحيح الجامع الصغير: (٧٣/٣) ژمارە: ٣٠٦٤.

صحيح الجامع الصغير: (٧٣/٣) ژمارە: ٣٠٦٦.

[3] صحيح الجامع الصغير: (٧٤/٣) ژمارە: ٣٠٦٦

❖ ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺفەرموی:

((إن الذي يأتي إمرأته في دبرها لا ينظر الله اليه: **خوا تەماشای ئەو کەسە ناکات کە لە کۆمەوەڕا دەچێتە لای خێزانەکەی))**[1].

❖ **لە هەردو صەحیحەکەدا ئەبوهورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((لا ينظر الله يوم القيامة الى من جرَّ ثوبه بطـــــراً: **خوا لە ڕۆژی دواییدا تەماشای ئەو کەسە ناکات کە لەبەر شانازی و فیزەوە جلی خۆی شۆڕ دەکات))**[2].

❖ **هەر دیسان لەو صەحیحانەدا ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((من جرَّ ثوبه خيلاء لم ينظر الله اليه يوم القيامة: **ئەو کەسەی جلی خۆی شۆڕ بکاتەوە بەمەبەستی شانازی و فیزەوە، خوا لە ڕۆژی پەسەڵاندا تەماشای ناکات))**[3].

❖ **ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((الإسبال في الإزار والقميص والعمامة، من جر منها شيئاً تخيلاً لم ينظر الله اليه يوم القيامـــــة: **شەڕواڵ و کراس و مەندیل، هەر کەسێك بە لاف و گەزافەوە شۆڕیان بکات خوا لە ڕۆژی دواییدا تەماشای ناکات))**[4].

---

[1] رواه في (شرح السنة)، مشكاة المصابيح (٢/١٨٤) ژمارە: (٣١٩٤)، وقال فيه محقق المشكاة ورواه النسائي في (الكبرى) وهو حديث صحيح.

[2] مشكاة المصابيح: (٢/٤٧٢) ژمارە: ٤٣١١.

[3] مشكاة المصابيح: (٢/٤٧٢) ژمارە: ٤٣١٢.

[4] رواه أبو داود والنسائي وابن ماجه، وإسناده صحيح كما يقول محقق مشكاة المصابيح: (٢/٤٧٤)، ژمارە: (٤٣٣٢).

## خوازگەی چوارەم

## دەوڵەمەندە دنیاییەكان

ئەو كەسانەی لەگەڵ دنیا تێكەڵ دەبن و دڵیان پێ خۆش دەبێ و هەر خەریكی رابواردن و گوزەرانن، ئەوا لە رۆژی قیامەتدا لە ئاستەنگ و تەنگانەی ناخۆش دەناڵێن و دوچاری ئازارەكانی ئەو رۆژە دەبن، پێغەمبەرﷺ پێی راگەیاندوین كە ئەو كەسەی لە دنیادا زۆر تێر بێ لە رۆژی قیامەتدا برسیەتیەكەی درێژە دەكێشێ، لە سوننەتی تیرمذی و سونەنی ئیبنو ماجە و موستەدرەكی ئەلحاكمدا هەیە كە پێغەمبەرﷺ بە یەكێك لە یاوەرەكانی دەفەرموێ:

((كف عنا جشاءك، فإن أكثرهم شبعاً في الدنيا أطولهم جوعاً يوم القيامة: چیدی قرپان مەینەوە، چونكە ئەوانەی لە دنیادا زۆرتر تێرن لە رۆژی دواییدا زۆرتر برسین))[1].

هەروەها پێی راگەیاندوین كە ئەو دەوڵەمەندانەی خاوەن سامان و دارایی فرەن و لە پێناو خوا نەیانبەخشیوە، لە رۆژی دواییدا پاداشتیان لە هەمو كەس كەمترە. لە هەردو صەحیحاندا هاتوە كە ئەبوذەرﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((إن المكثرين هم المقلون يوم القيامة إلاّ من أعطاه الله تعالى خيراً فنفح فيه بيمينه وشماله وبين يديه وورائه وعمل فيه خيراً: دەوڵەمەندەكان لە رۆژی قیامەتدا هەگبەیان لە هەمو كەس بەتاڵترە مەگەر ئەوانەی لە چاكەیان خەرج كردوەو رێی خێریان پێ دەوڵەمەند كردوە))[2].

---

[1] شێخ ناصری ئەلبانی لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة)دا هەمو رێگاكانی ئەم فەرمودەیەی هیناوەتەوە، ژمارە (٣٤٣).

[2] صحيح الجامع الصغير: (٢/١٦٥) ژمارە: (١٩٥٠).

**جا لەبەر ئەوەی پاداشتیان کەمە بۆیە لە پاشەوەی خەڵکانن کەچی لە دنیادا لە پێشەوەی خەڵکان بون، لە سونەنی ئیبنو ماجەدا ئەبوزەرﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((الأكثرون هم الأسفلون يوم القيامة إلاّ من قال بالمال هكذا وهكذا وكسبه طيب: **ئەوانەی دەوڵەمەند و پارەدارو فرە داراین لە رۆژی قیامەتدا لە چینە پەستەکاندا دەبن تەنها ئەوانە نەبن کە پەیداکردنەکەیان حەڵاڵە و کاری چاکەی پێ دەکەن))**[1].

**هەروەها پێغەمبەرﷺ پێی راگەیاندوین کە ئەوانەی لە دنیادا خۆیان گرانباری رابواردن و خۆشگوزەرانی دنیا کردوە ناتوانن ئاستەنگ و پەرژەنگەکانی رۆژی دوایی هەڵبوێرن، لە شوعەبولئیماندا ئوممودەرداء دەڵێ: لە ئەبودەردائم پرسی: ئەوە بۆ وەکو فلانەکەس ناپارێیەوە دەوڵەمەند بی؟ ئەویش گوتی: گوێم لێبو پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو:**

((إن أمامكم عقبة كؤودا لا يجوزها المثقلون: **سەختە هەورازی واتان لە پێشدایە کە گرانبارەکان قەت ناتوانن پێی تێپەڕن))**[2].

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٦٤/٤) ژمارە: (١٧٦٦).

[2] مشكاة المصابيح: (٦٠٧/٢)، ژمارە (٥٢٠٤) وعزاه في صحيح الجامع الى الحاكم أيضاً، تەماشای صحيح الجامع (١٧٨/٢) ژمارە (١٩٩٧) بکە.

## خوازگەی پێنجەم

## ریسوابون و شەرمەزاری پەیمان شکێنان

ئیبنو عومەرﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((إذا جمع الله الأولين والآخرين يوم القيامة يرفع لكل غادر لواء، فقيل: هـــذه غدرة فلان ابن فـــلان: خوا کە لە رۆژی قیامەتدا سەرجەمی خەڵکی کۆکردەوە، پەیمان شکێنەکان ئاڵایەکی تایبەتیان لە دیاردا هەڵدەکرێ و پێی دەناسرێنەوە، دەڵێن: ئەمە نیشانەی ناپاکی و پەیمان شکێنی فیسارە کەسە)).[1]

غادر: ئەو کەسەیە کە پەیمان دەدات بەڵام دەیشکێنێ، لواء: ئاڵای گەورەیە، کە فەرماندەی لەشکر یاخۆ پەیامنێری لەشکر دەیگرنە دەست و خەڵکیش لە دواوەی دەرۆن .

هەمو پەیمانشکێنەکان لە رۆژی دواییدا ئاڵایەکی تایبەتییان لەلای پاشیانەوە بۆ هەڵدەکرێ تا پێی بناسرێنەوەو شەرمەزار بن، لە صەحیحی موسلیمدا ئەبو سەعید دەگێڕێتەوەو دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((لكل غادرٍ لواء عند استه يوم القيامة: هەمو پەیمان شکێنێك لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ناوزڕان و ڕیسوابونی ئاڵایەکی زل لە لای قینگیەوە بۆ هەڵدەکەن)) [2].

جا هەرچەندی پەیمانشکێنەکە گەورەتر بێ ئاڵاکەش هێندە بەرزتر دەبێ تا زێتر شەرمەزار بێ، لە صەحیحی موسلیمدا ئەبو سەعید دەگێڕتەوەو دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

---

[1] صحيح مسلم: (٣/١٣٥٩) ژمارە: (١٧٣٥) بوخاریو ئەبو داود و تیرمذی و هی دیکەش گێراویانە.

[2] صحيح مسلم: (٣ / ١٣٦١) ژمارە (١٧٣٨).

((لكل غادر لواء يوم القيامة يرفع له بقدر غدره، ألاَ ولا غادر أعظم مـــــن أمـــير عامـــة:
**هـەمو پـەیمان شـكێنێك بـە قـەد زۆری و كـــەمی بـێ پەیمانیەكـەی ئالاكـەی بـەرز هەڵدەكرێ، جا بزانن هیچ پەیمان شكێنیەك وەكو هی فەرمانڕەوای گشتی نیە))[1].**

**فەرمانڕەوای گشتی حاكم و خەلیفە و سەرۆك وڵات دەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی زیانی پەیمان شكێنیەكەی خەڵكانێكی زۆر دەگرێتەوەو پێویستیان بەوەش نیە پەیمان بشكێنن چونكە دەسەڵاتیان هەیە.**

**خوا ئەم جۆرە سزاو تۆڵەیەی بە پێی باری خەڵك داناوە، شاعیر دەڵێ:**

أسمّي ويحك هل سمعت بغدرة      رفع اللواء لنا بها في المجمع

**عارەبەكان لە وەرزی حەج و بۆنەكاندا ئالایان بۆ پەیمانشكێنەكان هەڵدەكرد، هەروەها تاوانكاریشیان بەناو خەڵكدا دەگێرا[2].**

---

[1] صحيح مسلم: (٣/١٣٦١) ژمارە: ١٧٣٨

[2] التذكرة للقرطبي: ٢٩٧

# خوازگەی شەشەم

# دزیکردن لە غەنیمەت

خوا هەڕەشەی لەو جۆرە کەسانە کردوەو لە ڕۆژی زندوبونەوەدا لەبەر چاوی خەڵك ڕیسوای دەکات و چی لە غەنیمەت دزی بێ دەخرێتە کۆڵی:

﴿وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ: هەر کەسێك لە غەنیمەدا دزی بکات لە ڕۆژی قیامەتدا دزییەکەی دەخرێتە کۆڵی، پاشان هەمو کەسێك سزاو پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە بێئەوەی کەس ستەمی لێ بکرێ﴾ آل عمران: ١٦١.

قورتوبی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: واتە لە ڕۆژی قیامەتدا شتە دزراوەکانی دەخەنە کۆڵ و ئەستۆی، بە هۆیەوە توشی سزا و کەشەنگی دەبێ و لە دەنگەکەی دەترسێ، کە خەڵکیش بەم جۆرە دەیبینن مایەی شەرمەزاریو ڕیسوابونیەتی[١]، کە فەرمانڕەواو فەرمانبەر و کاربەدەستانیش ماڵی گشتی گل دەدەنەوە ئەویش بە دزینی غەنیمەت هەژمارە.

پێغەمبەرﷺ پتر لە فەرمودەیەکی لە بارەی چۆنیەتی سزای غەنیمەت دزان فەرموە، ئەبوهورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە و دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەرﷺ هەڵسایەوە باسی غەنیمەت دزینی کردو ڕونی کردەوە کە گوناح و تاوانێکی چەند گەورەیە پاشان فەرموی:

((لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته بعير له رغاء، يقول يا رسول الله أغثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً قد أبلغتك، لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته شاه لها

---

[١] تفسير القرطبي: (٤/٢٥٦)

ثغاء، يقول يا رسول الله أغثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً قد أبلغتك، لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته نفس لها صياح، فيقول يا رسول الله أغثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً قد أبلغتك، لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رأسه رقاع تخفق، فيقول يا رسول الله أغثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً قد أبلغتك، لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته صامت فيقول يا رسول الله أغثني، فأقول: لا أملك لك شيئاً قد أبلغتك: له رۆژی قیامەتدا کەستان نەبینم وشترێکی لە ئەستۆ بێ و بکورکێنێ یان ئەسپێکی لە ئەستۆ بێ و بحیلێنێ یان مەڕێکی لە ئەستۆ بێ و بباڕێنێ یان شتێکی بەنرخی لە ئەستۆ بێ و شتەکە بقیژێنێ یان پارچە پەرۆکێکی لەسەر سەر بێ و شرپەی شەکانەوەی بێ یان زێڕ و زیوی لە ئەستۆ بێ ئەوجا هاوارم بۆ بێنێ و بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام بکەوە، منیش دەڵێم هیچم پێ ناکرێ ئەدی پێم نەگوتی شتی وانەکەی))[1].

طەبەرانی لە (المعجم الکبیر) و بەیهەقی لە (السنن) و ئەلحەمیدی لە موسنەدەکەیدا تەخریجیان کردوە کە پێغەمبەرﷺ عوبادەی کوڕی صامتی بۆ کۆکردنەوەی زەکات ڕەوانەکرد و پێی گوت:

((اتق الله يا أبا الوليد أن تأتي يوم القيامة ببعير تحمله على رقبتك له رغاء أو بقرة لها خوار أو شاة لها ثوائج: باوکی وەلید لە خوا بترسە، لە ڕۆژی قیامەتدا نەتبینم وشترێکت لەسەر شان بێ و بکورکێنێ، یان مانگایەکت لەسەر شان بێ ببۆڕێنێ یان مەڕێکت لەسەر شان بێ و بباعێنێ))[2].

ئیبنو کەثیر لە تەفسیرەکەیدا فەرمودەی زۆر بە ترسی لە بارەی غەنیمەت دزینێ هێناوەتەوە، یەکێکیان فەرمودەکەی ئەبوحەمیدی ساعیدییە، کە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ پیاوێکی لە هۆزی ئەزد نارد ناوی (ابن اللتبيه) بۆ تاکو زەکات خڕ بکاتەوە، کە

---

[1] متفق عليه، بێژانەوەکە هی موسلیمە کە تەواترە، مشکاة المصابيح: (٢/١٠٤) ژمارە: (٢٩٩٥).

[2] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٥٣٧) ژمارە (٨٥٧) والحديث صحيح.

زەکاتەکەی هێناوە، گوتی: ئەوانە بۆ ئێوە ئەوانەش بە دیاری پێشکەشم کراون. پێغەمبەرﷺ هەڵسایەوە سەر مینبەرو فەرموی:

((ما بال العامل نبعثه على عمل، فيقول: هذا لكم، وهذا لي، أفلا جلس في بيت أبيه وأمه، فينظر أيهدى إليه أم لا؟ والذي نفس محمد بيده لا يأتي أحدكم منها بشيء إلاّ جاء به يوم القيامة على رقبته، إن كان بعيراً له رغاء، أو بقرة لها خوار، أو شاة تيعر: ئەم کابرایە چیەتی کە بۆ کردارێکی دەنێرین، کە دێتەوە دەڵێ ئەوە بۆ ئێوەو ئەوەش بۆ من، با لە ماڵی داك و بابی دانیشێ داخۆ بزانێ دیاری پێشکەش دەکەن؟!!. بەو خوایەی گیانی موحەممەدی بەدەستە هەر یەکێکتان هەر شتێك بۆ خۆی گل داتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە زندو دەبێتەوە شتەکەی لەسەر شانە، جا ئەگەر وشتر بێ لۆغەلۆغ دەکات و ئەگەر مانگا بێ دەبۆڕێنێ و ئەگەر مەڕیش بێ دەباعێنێ)) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە[1].

---

[1] تفسير ابن كثير: (٢/١٤٥).

## خوازگەی حەفتەم

## زەوتکەری زەوی و زاران

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((من أخذ من الأرض شيئاً بغير حقه خسف به يوم القيامة إلى سبع أرضين:

هەر یەکێك بە ناڕەوا زەوی و زارێك زەوت بکات ئەوا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا لە هەر حەفت تەبەقەی زەوی دەیباتە خوارێ))[1].

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الرقاق باب إثم من ظلم شيئاً من الأرض، فتح الباري: (١٠٣/٥)

## خوازگەی هەشتەم

## دوزمانەکان( ذوالوجهين )

دوزمانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا خراپترینی خەڵکن، بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا لە ئەبوهورەیرە‌ﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((تجدون شرّ الناس يوم القيامة ذا الوجهين، الذي يأتي هؤلاء بوجه وهؤلاء بوجه: خراپترینی خەڵکی ڕۆژی دوایی دوزمانەکانن کە لەلای هەندێك قسەیەك دەکەن و لە لای ئەوانی تر قسەیەکی تر تا تێکیان بەردەن و ناکۆکیان بخەنە نێوان))[1].

هەندێ فەرمودەی تر لەو بارەوە هاتون کە ئەو جۆرە کەسانە لە ڕۆژی قیامەتدا زمانێکی ئاگرینیان هەیە، عەمماری کوڕی یاسرﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((من كان له وجهان في الدنيا كان له لسان من نار يوم القيامة: ئەو کەسەی لە دنیادا دوزمان بوبێ لە پەسەڵاندا زمانی لە ئاگرە))[2].

---

[1] مشكاة المصابيح: (٢/٥٧٨) ژمارە: ٤٨٢٠

[2] أخرجه أبو داود واللفظ له والبخاري في الأدب المفرد والدارمي وأبو يعلى وغيرهم عن عمار بن ياسر، سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٥٨٤) ژمارە (٨٩٢).

## خوازگەی نۆیەم

## ئەو فەرمانڕەوایانەی مشوری خەڵك ناخۆن

**پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:**

**((من ولّی من أمور المسلمين شيئاً فاحتجب دون خلتهم وحاجتهم وفقرهم وفاقتهم احتجب الله عنه يوم القيامة دون خلته و حاجته وفاقته وفقره: هەر كەسێك بوە فەرمانڕەوای موسڵمانان و مشوری پێویستی و هەژاری و نەبونیان نەخوات، لە ڕۆژی قیامەتدا خواش بە هانایەوە نایەت))**[1].

[1] رواه أبو داود وابن ماجه والحاكم بإسناد صحيح عن أبي مريم الأزدي-صحيح الجامع الصغير: (٣٦٨/٥) ژمارە (٦٤٧١).

## خوازگەی دەیەم

# دەرۆزەکەرانی بێ پێویست

ئەو کەسەی بێئەوەی پێویست بێ و دەست لەبەر خەڵك پان بکاتەوەو داوای شتیان لێ بکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەموچاوی دادەماڵێ، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((من سأل وله ما يغنيه جاءت مسألته يوم القيامة خدوشاً أو خموشاً أو كدوحاً في وجهه، قيل: يا رسول الله وما يغنيه؟ قال: خمسون درهماً، أو قيمتها من الذهب: هەر کەسێك بای خۆی هەبێ و دەرۆزە بکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەرۆزەکەی لێ دەبێتە روشان و داماڵانی دەموچاوی، پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا بای خۆی چەندە؟ فەرموی: پەنجا درهەم، یان پارچە زێڕێکە نرخەکەی پەنجا درهەم بێ))[1].

لە موسنەدی ئەحمەدی پێشەوادا عیمرانی کوڕی حوصەینﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((مسألة الغنى شين في وجهه يوم القيامة: دەرۆزەی بێپێویستان ماك و نیشانەیەکی دزێوە لەسەر روی دەرۆزەکەرەکە لە ڕۆژی قیامەتدا))[2].

---

[1] أخرجه أبو داود والنسائي والترمذي والدارمي وغيرهم، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ژمارە (٤٩٩).

[2] صحيح الجامع الصغير: (٥/٢٠٨) ژمارە: (٥٧٤٧) وقال المحقق فية: صحيح.

## خوازگەی یازدەم

## تف فڕێدان بەرەو ڕوی ڕوگە( قبلە )

ئاڕاستەی ڕوگە شتێکی پیرۆز و بەڕێزە، هەر بۆیەشە لە چونە سەر پێشاودا فەرمانمان پێکراوە پشت و رومان بە ئاڕاستەی ڕوگە نەبێت، هەروەها پێغەمبەرﷺ لەوەش بەرهەڵستی لێکردوین کە تف و بەڵغەم بەرەو ڕوی ڕوگە هەڵنەدەین، پێی ڕاگەیاندوین ئەو کەسەی تف و بەڵغەم بەرەو ڕوگە هەڵدا ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا تف و بەڵغەمەکەی لە نێوچەوانیدا دەبێ:

ئیبنو عومەرﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەی بەڵغەمی ڕوەو ڕوی ڕوگە فڕێداوە بەڵغەکەی بە دەموچاویدا دەبێ[1]، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

((من تفل تجاه القبلة جاء يوم القيامة وتفله بين عينيه: ئەو کەسەی تف بەرەو ڕوی ڕوگە هەڵدا لە ڕۆژی قیامەتدا تفەکەی لە نێوچەوانیدا دەبێ))[2].

---

[1] رواه البزار في مسنده وابن حبان وابن خزيمة في صحيحهما، صحيح الجامع الصغير: (٣/٣٣) ژمارە (٢٩٠٧) وقال الشيخ ناصر فيه: صحيح، لە سلسلة الأحاديث الصحيحةدا تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٢٣) بکە.

[2] رواه أبو داود في سننه وابن حبان في صحيحه عن حذيفة بن اليمان، سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢٢٢).

## خوازگەی دوازدەم

# ئەوانەی خەونان هەڵدەبەستن

**ئیبنو عەبباس‌ رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((من تحلم بحلم لم يره كلف أن يعقد بين شعيرتين ولن يفعل، ومن استمع إلى حديث قوم وهم له كارهون أو يفرون منه صب في أذنه الآنك يوم القيامة:

**هەر کەسێك خەونێك هەڵبەستێ ئەوا لە ڕۆژی دواییدا داوای لێ دەکرێت دو مو لە یەکدی گرێ بدات، کە قەت پێی ناکرێ، هەر کەسێکیش گوێ بداتە قسەی کەسانێك و ئەوانیش پێیان ناخۆش بێ ئەوا لەرۆژی قیامەت قورقوشمی دەخرێتە گوێ))**[1].

[1] صحيح البخاري، كتاب تعبير الرؤيا باب من كذب في حلمه، فتح الباري: (١٢/٤٢٧).

# جێباسی سێیەم

## ڕەوشی پارێزکاران

### خوازگەی یەکەم

### لەڕۆژی قیامەتدا خەڵك دەترسن و ئەوان ناترسن

ترس و سامی ڕۆژی قیامەت سەرجەم خەڵك دادەگرێتەوەو شپرزەیان دەكات و دەیانتاسێنێ، خەم و پەژارە قورسەكانیش بە هەمان چەشن دەرونی خەڵك پڕ دەكەن و دەیانژاكێنن كەچی كەسانێك هەن هەم لەو ترسە سەركەشەدا هەم لەو خەمە سەرگەرمەدا پارێزراون، هەڵبەت ئەو پارێزراوە بەرێزانە بەندە ڕاستەقینەكانی خوان كە بۆ فەرمانەكانی گوێڕایەڵبون و هەردەم لە خەمی ئەو ڕۆژەدا بون و كردەوەی باشیان بۆ خۆ ساز دابو، دا لەبەر ئەوە خوا بێترس و بێخەمیان دەكات و ئارامی و ئاسودەییان پێ دەبەخشێ، كاتێكیش لە گۆڕ قیت دەبنەوە فریشتەكانی خوای میهرەبان هێوریان دەكەنەوەو ترس و خەمیان لێ دەڕەوێننەوە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ، لاَ يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ، لاَ يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلاَئِكَةُ هَذَا يَوْمُكُمْ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ:

ئەوانەی كە لە پێشودا ئاسودەییمان پێ بەخشین و كردەوەی بەهەشتیانیان ئەنجام داوە لە دۆزەخ دورن و گوێیان لە نێڵەنێڵەكەی نابێ، هەروەها لە ناو بەهەشتیشدا نەمرن و هەر چییان حەز لێ بێ بۆیان سازە. ئەو ناخۆشیە یەخەی سەرجەم خەڵكی

هاڵساوه دەگرێ؛ ئەوان خەفەتبار و پەرێشان ناكـات لـە دەروازەكـانی بەهەشـتێدا فریشـتەكان پێشـوازی و پیرۆزباییان لێدەكەن و موژدەیـان دەدەنـێ و دەڵێـن: ئـەوە ڕۆژەكەیە كە بەڵێن و مزگێنیتان پێ دەدرا﴾ الأنبياء: ١٠١.

لەو ڕۆژەدا بانگدەرێك لەلای خواوە بانگی بەندە خواپەرستەكان دەكات و دڵنیـاو ئارامیان دەكاتەوە:

﴿يَاعِبَادِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْكُمْ الْيَوْمَ وَلاَ أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ، الَّذِيـــــنَ آمَنُـــوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْـــــلِمِينَ: هۆ بەندە خواپەرستەكان! ترس ئێوە ناگرێتـەوە و خـەمبار نـابن؛ ئـەو خواپەرسـتانەی بڕوایان بـە ئایەتـەكانی ئێمـە هێنـاو موسـڵمانی گەردەن كەچ بون بۆ خوا﴾ الزخرف: ٦٨-٦٩.

﴿أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُـــــونَ، الَّذِيـــنَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ، لَهُمْ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِـــي الآخِـــرَةِ: بڕوادارانی پارێزكار و لە خوا نزیك لە ڕۆژی قیامەتدا ترس و پەژارەیان نیە، لـە ژیـن و ژیانەودا موژدەو مزگێنیان دەدەرێتێ﴾ يونس: ٦٢-٦٤.

خوای گەورە كە دڵنیایی‌و ئارامیان پێ دەبەخشێ لەبەر ئەوەیە چونكە لـە دنیـادا ترسی خوا دڵیـانی پڕ كردبو و شـەوانی پـێ ئـاوەدان و ڕۆژانـی پـێ تێنو كردبون و خۆیان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە كردبو، خوا لە بارەیانەوە فەرمویەتی:

﴿إِنَّا نَخَافُ مِنْ رَبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا: ئێمە لە پەروەردگارمان دەترسێین لە ڕۆژێكی سەخت و پڕ لە سفت و سوێدا﴾ الدهر: ١٠.

جا هەر كەسێك ڕەوشەكەی ئاوەها بێت، خوا ئارامی دەكات:

﴿فَوَقَاهُمْ اللَّهُ شَرَّ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا، وَجَزَاهُـــــمْ بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيـرًا: خوا لـە ناخۆشی و دژواری ئـەو ڕۆژە پاراستنی و ڕوگەشی و شادی و هەدای پێ بەخشین، لە پـای ئارام و خۆڕاگرتنیـاندا بەهەشـت و

کالآی ئاوریشمی به پاداشت دانه‌وه﴾ الدهر: ١١-١٢.

هه‌روه‌ها شه‌ددادی کوڕی ئه‌وس ده‌گێڕێته‌وه که پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی:

((قال الله ﷻ: وعزتي وجلالي لا أجمع لعبدي أمنين ولا خوفين، إن هو أمنني في الدنيا أخفته يوم أجمع فيه عبادي، وإن هو خافني في الدنيا أمنته يوم أجمع فيه عبادي:

خوای به‌رزو به شکۆ فه‌رمویه‌تی: به عیززه‌ت و جه‌لالی خۆم؛ دو دڵنیایی و دو ترسان بۆ به‌نده کۆ ناکه‌مه‌وه، ئه‌گه‌ر له دنیادا لێم دڵنیا و بێترس بێ ئه‌وا له ڕۆژی دواییدا ده‌یترسێنم، خۆ ئه‌گه‌ر له دنیادا لێم بترسێ ئه‌وا له ڕۆژی کۆکردنه‌وه‌دا دڵنیای ده‌که‌م))[١].

به‌نده تا پتر بۆ خوا پاك و بێ ژه‌نگ بێ خوا له ڕۆژی قیامه‌تدا پتر دڵنیاو ئارامی ده‌کات، ئه‌و خوا به یه‌ك ناسانه‌ی که گه‌ردی شرکیان تێکه‌ڵ به بڕواکه‌یان نه‌کردوه له ڕۆژی دواییدا دڵنیاییه‌کی ته‌واویان پێ ده‌به‌خشێ، له‌و وه‌ڵامه‌ی ئیبراهیمدا که به‌ره‌رچی هه‌ڕه‌شه‌ی موشریکه‌کانی پێداوه، ئه‌وه‌ت بۆ ڕون ده‌بێته‌وه که ده‌یانویست به بته‌کانیان بیترسێنن ئه‌ویش گوتی:

﴿وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلاَ تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللَّهِ وَلاَ تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالأَمْنِ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ، الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمْ الأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ الانعام: ٨١-٨٢.

---

[١] رواه أبو نعيم في الحلية، سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٣٧٧) ژماره: (٧٤٢) وإسناده حسن.

## خوازگەی دووەم

# ئەوانەی لەبەر سێبەری بارەگادان

لە گۆڕەپانی کۆبونەوەدا خەڵك لەبەر تین و تاو و چرقەی گەرمیەکی توند و تیژی ڕۆژێ ڕادەوەستن، کە گەرمیەکی ئەوتۆیە چیای لەبەردا دەتوێتەوە. بەڵام کۆمەڵە خەڵکێك هەن لەو مەینەتە بێبەش و پارێزراون و لەبەر سێبەری بارەگای خوا راوەستاون.

ئەو کۆمەڵە خەڵکە خاوەن هیممەتی بەرز و عەزیمەتی راستن، خاوەنی بیروباوەڕی ئیسلامی و ڕەوشتی پەسند و کردەوەی چاکی وان کە بە پێودانی ئیسلام سەنگێکی زۆریان هەیە ئاخۆ ئەوانە کێ بن؟

یەکێکیان پێشەوای دادگەرە کە هێزو دەسەڵاتێکی کارای بە دەستە بەڵام لە خۆبایی و یاخی نابێ بەڵکو بە پێی بەرنامەو دینی خوا دادو ڕاستی دەچەسپێنێ.

یەکێکی تر ئەو گەنجە خوا پەرستەیە کە لە ترسی خوا ئارەزوەکانی بەرهەڵدا نەکردوەو تەمەنێکی خاوێن و پاکژی ڕابواردوە، یەکێکی تر هاموشۆکەرانی مزگەوتن کە بە پەرستن و یادی خوا ئاوەدانی دەکەنەوەو دڵیان پێوەی بەند بوەو قەت پەیوەندی لێ نابڕن هەتا دەمرن.

یەکێکی تر ئەو کەسانەن کە لە پێناو خوادا یەکتریان خۆشدەوێت و پەیوەندی برایەتی کۆیان دەکاتەوە کە لەسەر چاکەو پارێزکاری و چاکەخوازی کۆدەبنەوەو لەسەر کردەوەی چاکە یەکتر جێ دێڵن.

یەکێکی تر ئەو کەسەیە کە ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و سەلار بۆ کاری بێشەرعی بانگی دەکات بەڵام لە ترسی خوا وەڵامی ناداتەوەو توخنی ناکەوێ.

یەکێکیتر ماڵبەخشەرە کە بەخشین و خێرەکانی لە خەڵك دەشارێتەوە تا نەیبینن تەنانەت لە خۆشی دەشارێتەوە!

**یەكێكی‌تر ئەو لەخواترسەیە كە بە تەنیا و لە دوری خەڵكەوە چاوەكانی فرمێسك هەڵدەڕێژن.**

**ئەبوهورەیرە‌ﷻ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر‌ﷺ دەفەرموێ:**

((سبعة يظلهم في ظله يوم لا ظل إلاّ ظله، الإمام العادل، وشاب نشأ في عبادة ربه، ورجل قلبه معلق في المساجد، ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتفرقا عليه، ورجل طلبته إمرأة ذات منصب وجمال فقال: إني أخاف الله، ورجل تصدق أخفى حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه، ورجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه))[1].

**زۆر فەرمودەی تر لەبارەی ئازیزو خۆشەویستانی ڕێگەی خواوە هاتوە كە لە ڕۆژی كۆبونەوەدا لەبەر سێبەری بارەگای خوا ڕادەوەستن:**

❖ **ئەبوهورەیرە‌ﷻ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر‌ﷺ دەفەرموێ:**

((إن الله يقول يوم القيامة: أين المتحابون بجلالي، اليوم أظلهم في ظلي، يوم لا ظل إلاّ ظلي: **لە ڕۆژی قیامەتدا خوا دەفەرموێ: كوانێ ئەوانەی لەبەر خاتری من یەكتریان خۆشویستوە، ئەمڕۆ دەیانخەمە بەر سێبەری عەرشی خۆم، كە جگە لەم سێبەرە هیچ سێبەری تر نیە))**[2].

❖ **موعاذ‌ﷻ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر‌ﷺ فەرمویەتی:**

((ب المتحابّين في الله في ظل العرش: **خۆشەویستانی پێناو خوا لەبەر سێبەری بارەگادان))**[3].

❖ **عوبادەی كوڕی صامت ﷻ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی كە خوای گەورە فەرمویەتی:**

---

[1] رواه البخاري ومسلم، صحيح البخاري، كتاب الاذان، باب من جلس في المسجد، فتح الباري: (١٤٣/٢)، رواه مسلم: (٧١٥/٢) ژماره (١٠٣) والسياق للبخاري.

[2] رواه مسلم: (١٩٨٨/٤)، ژمارە: (٢٥٦٦).

[3] في معجم الطبراني الكبير ومسند أحمد وصحيح ابن حبان و مستدرك الحاكم، صحيح الجامع الصغير: (١٦١/٢) ژمارە: (١٩٣٣).

((حقــت محبــتي علــى المتحــابين، أظلــهم في ظــل العــرش يــوم لا ظــلّ إلاّ ظلّــي: خۆشەویستیم بۆ ئەوانەی یەکتریان لە پێناو مندا خۆشدەوێت شایەن بو، ئەمڕۆ لەبەر سێبەری بارەگای خۆمیان ڕادەگرم کە جگە لە سێبەری من سێبەری تر نیە)).[1]

لەبەر سێبەردا بون تەنها بۆ ئەم حەفت جۆرە کەسانە نیە، بەڵکو کەسانی تریش هەن بەشدار دەبن. ئیبنوحەجەری عەسقەلانی هەمو ئەو جۆرە کەسانەی کە لەبەر سێبەری بارەگادا دەبن لە پەرتوکێکدا کۆکردۆتەوەو ناوی ناوە ((معرفة الخصال الموصلة الى الظلال)).[2]

یەکێکی تر لەو ئاکار و ڕەوشتانەی بڕواداری پێ دەچێتە بەر سێبەری ئەوانەن کە لە قەرزارەکەیان خۆش دەبن یاخۆ کاتێکی درێژی لەسەر ڕادەوەستن. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

((من أنظر معسراً أو وضع عنه أظله في ظلّــي: ئەو کەسەی ماوەی دانەوەی قەرزی قەرزارەکەی درێژ بکاتەوە یان گەردەنی ئازاد بکات، ئەوا خوای گەورە لەژێر سێبەری خۆی ڕایدەگرێ)).[3]

هەروەها دەفەرموێ:

((مــن نفــس عــن غريمــه أو محــا عنــه، كــان في ظــل العــرش يــوم القيامــة: ئەو کەسەی لەسەر قەرزارەکەی ڕابوەستێ یان لێی خۆش بێ، خوا لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشدا ڕایدەگرێ)).[4]

---

[1] في كتاب (الاخوان) لابن أبي الدنيا باسناد صحيح. صحيح الجامع الصغير(١١٦/٤).

[2] فتح الباري: (١٤٤/٢).

[3] في صحيح مسلم ومسند أحمد عن أبي اليسر. صحيح مسلم: (٢٣٠٢/٤)، ژماره (٣٠٠٦).

[4] في مسند أحمد وسنن الدارمي باسناد صحيح عن أبي قتادة، صحيح الجــامع الصغــير: (٣٦٤/٤)، ژمار (١٤٥٢).

## خوازگەی سێیەم

# ئەوانەی بە تەنگ برای موسڵمانیانەوە دەچن

یارمەتیدانی ئاتاجان(محتاج) و کۆمەکیکردنی کۆسکەوتوان و ڕەواندنەوەی ناخۆشی موسڵمانان، مایەی سوك و سانا بونی کاروبارو سەختیەکانی ڕۆژی دواییە.

❖ ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا، نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة، ومن يسر على معسر، يسر الله عليه في الدنيا والآخرة، ومن ستر مسلماً ستره الله في الدنيا و الآخرة، والله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه: خوای گەورە تەنگانەیەکی ڕۆژی قیامەت لەسەر ئەو کەسە هەڵدەگرێ کە لە دنیادا تەنگانەیەکی لە کۆڵ برواداریێك کردۆتەوە. خوا کاروباری دنیاو قیامەتی ئەو کەسە سوك و سانا دەکات کە لە دنیادا یارمەتی کۆسکەوتوێکی داوە. ئەو کەسەی کەم و کورتی موسڵمانێك داپۆشێت؛ خوا لە ژین و ژیانەوەدا کەم و کورتی دادەپۆشێ. تا بەندە لە هاریکاری برا موسڵمانەکەی دابێت خواش لە هاریکاری وی دایە)) [١].

❖ عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولا يسلمه، و من كان في حاجة أخيه، كان الله في حاجته، ومن فرج عن مسلم كربة، فرج الله عنه كربة من كربات يوم القيامة، ومن ستر مسلماً ستره الله في الدنيا والآخرة: موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لێناکات و نایداتە دەست دوژمن و ناحەزان، ئەو کەسەی لە جێبەجێکردنی ئاتاجی

---

[١] رواه مسلم في صحيحه، مشكاة المصابيح: (١/٧١) ژمارە (٢٠٤).

براکەی دابێ خواش لە جێبەجێکردنی ئاتاجی وی دادەبێ. ئەو کەسەی تەنگانەیەك لە کۆڵ برایەکەی بکاتەوە خوا تەنگانەیەکی ڕۆژی قیامەتی لە کۆڵ دەکاتەوە. ئەو کەسەی خەوشی موسڵمانێك داپۆشێ خوا لە ژین و ژیانەوەدا خەوشەکانی دادەپۆشێ))[1].

❖ ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((من نصر أخاه بظهر الغيب نصره الله في الدنيا والآخرة:

ئەو کەسەی لە پاشملەدا لەسەر برای موسڵمانی وەجواب بێ خوا لە ژین و ژیانەوەدا یارمەتی دەدات))[2]

---

[1] صحيح البخاري، كتاب المظالم. فتح الباري (٥ / ٩٧).

[2] رواه الدينوری في ((المجالسة)) والبيهقي في ((الشعب)) والضياء في ((المختارة)). سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣/٢١٨)، ژمارە (١٢١٧).

## خوازگەی چوارەم

## ئەوانەی ئاسانکاری لەگەڵ دەستەنگەکان دەکەن

❖ ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((کان رجل یداین الناس، فکان یقول لفتاه: إذا أتیت معسراً تجاوز عنه، لعل الله أن یتجاوز عنا، قال: فلقي الله فتجاوز عنه: پیاوێك هەبو قەردی دەدایە خەڵك، هەمو جارێ بە سەرکارەکەی دەگوت: کە چویە لای قەردارێکی دەست دەنگ تەنگاوی مەکە، مۆڵەتی بدێو چاوپۆشی لێبکە، جا بە ڕوی خۆش بێ یان بە لێداشکاندن بێ، یان بە لێبوردنی تەواو بێ. تا بەڵکو خوا چاوپۆشیمان لێبکات. کە مرد و گەڕایەوە لای خوا، خوا چاوپۆشی لە گوناحەکانی کردو لێی خۆش بو)).[1]

❖ ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((إن رجلاً لم یعمل خیراً قط، وکان یداین الناس، فیقول لرسوله: خذ ما تیسر، واترك ما عسر، وتجاوز، لعل الله یتجاوز عنا. فلما هلك قال: هل عملت خیراً قط؟ قال: لا، إلا أنه کان لي غلام، وکنت أداین الناس، فإذا بعثته یتقاضی قلت له: خذ ما تیسر، واترك ما عسر، وتجاوز، لعل الله أن یتجاوز عنا. قال الله: قد تجاوزت عنك: لە نەتەوەکانی پێشاندا پیاوێك هەبو بڵێی چاکەیەك چیە نەیبو، بەڵام قەرزی دەدایە خەڵك و بە سەرکارەکەی دەگوت: ئەوەندەی توانی بیداتەوە وەریگرەوە، ئەوەندەش کە نەیتوانی وازی لێ بێنەو چاوپۆشی لێبکە بەڵکە خوا چاوپۆشیمان لێ دەکات. کە پیاوەکە مرد، خوا پێی گوت: قەت خێرێکت کردوە؟ گوتی: نەخێر، بەڵام قەرزم

[1] رواه البخاري ومسلم في صحیحهما، سلسلة الأحادیث الصحیحة: (٢١٨/٣) ژمارە (١٢١٧).

دەدایە خەڵك، کە خزمەتکارەکەم دەنارده لای قەرزارەکان پێم دەگوت: ئەوەندەی هەیبو وەریگرەوە ئەوەندەی کە نەیبو چاوپۆشی لێبکە بەڵکو خوا چاوپۆشیمان لێبکات. خوا چاوپۆشی لێکرد)) [1].

❖ حوذەیفەو عوقبەی کوڕی عامرو ئەبو موسعودﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((أتى الله ﷻ بعبد من عباده آتاه الله مالاً، فقال له: ماذا عملت في الدنيا؟ فقال: ما عملت من شيء يارب، إلا أنك آتيتني مالاً، فكنت أبايع الناس، وكان من خلقي أن أيسر على الموسر وأنظر المعسر. قال الله تعالى: أنا أحق بذلك منك، تجاوزوا عن عبدي)) [2].

---

[1] رواه النسائي وابن حبان والحاكم باسناد صحيح. مشكاة المصابيح: (٢ / ١٠٨) ژماره (٢٨٩٩).

[2] مستدرك الحاكم باسناد صحيح. صحيح الجامع الصغير: (٩٢/١)، ژماره (١٢٤).

## خوازگەی پێنجەم

## ئەوانەی دادگەری لەفەرمانڕەواییان و خانەوادەیان و کاری بەردەستیان دەکەن

دادگەران لە ڕۆژی دواییدا شوێنپایەکی بەرزو بڵندیان هەیە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((إن المقسطين عند الله على منابر من نور، عن يمين الرحمن ﷻ، وكلتا يديه يمين، الذين يعدلون في حكمهم وأهليهم وما ولوا: دادگەران لە ڕۆژی قیامەتدا لە لای خوادا لەسەر مەشخەڵی ڕوناکین لەلای دەستە ڕاستی خوا، هەردو دەستی خوا هەر ڕاستە، ئەو دادگەرانەی لە فەرمانڕەوایی و لەگەڵ خاو و خێزان و هەر کارێکی لەبەر دەستیان بێ دادگەری تێدا بەکاردێنن)).[1]

[1] صحيح مسلم: (١٤٥٨/٣)، ژمارە: ١٨٢٨.

## خوازگەی شەشەم

# سەنگەرنشین و شەهیدان

شـەهیدەکان کارەسـاتەکانی ئـەو ڕۆژە سـەختەیان دوچـار نابـێ، پێغەمبـەرﷺ فەرمویەتی:

((للشهيد عند الله ست خصال: يغفر له في أول دفعة، ويرى مقعده من الجنة، ويجـار مـن عذاب القبر، ويأمن من الفزع الأكبر، ويوضع على رأسه تاج الوقار، الياقوتة منه خير من الدنيـا وما فيها، ويزوج ثنتين وسبعين زوجة من الحور العـين، ويشـفع في سـبعين مـن أقربائـه: خـوا شـەش پاداشـت و ڕێـز بـە شـەهیدان دەبەخشـێ: (١) لەگـەڵ یەکـەمین دڵۆپـە خوێنیدا خوا لـە هـەمو گونـاح و تاوانـەکانی خـۆش دەبـێ. (٢) جێگـەی خـۆی لـە بەهەشتێدا دەبینێ. (٣) لە چنگ ئەشکەنجەی گۆڕ دالّدە دەدرێ. (٤) لە ترسە هەرە گەورەکەی ڕۆژی قیامەت دڵنیاو ئارام دەکرێ. (٥) تاجی ڕێزو روەتی لەسەر دەنرێ کە هەر مرواریەکی لە هەمو دنیاو ئەوەی تێیدایە باشترە. (٦) حەفتاو دو حـۆری شەنگ و شۆخ و چاو گەش و گەورەی بەهەشتێ دەدرێتێ و تکا خوازی بۆ حەفتا خزمیش دەکات))[1].

ئەو کەسەی لە پێناو خوادا سەنگەرنشینی دەکات و بەرگری و داکۆکی لە خاکی موسڵمانان دەکات؛ وەکو شەهیدەکان ترسی ڕۆژی قیامەت نایگرێتەوە.

❖ ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((رباط يوم خير من صيام دهر، ومن مات مرابطاً في سبيل الله أمن من الفزع الأكبر، وغـدى عليـه برزقـه وريـح مـن الجنـة، ويجـري عليـه أجـر المرابـط حـتى يبعثـه الله: پاداشتی یەك ڕۆژ سەنگەرنشینی لە پاداشتی بە ڕۆژوبونی هەمو تەمەن زۆرترە. ئەو کەسەی بە سەنگەرنشینی پێناو خوا بمرێ لە ترسی هەرە گەورەی ڕۆژی قیامەت بێخەم دەبێ و بژیوی بە هەشـتی دەدرێتـێو سـروەی بەهەشـتێی بـۆ دێـت.

---

[1] في سنن الترمذي وابن ماجة، مشكاة المصابيح: (٢ / ٣٥٨)، ژمارە: ٣٨٣٤، و قال فيه محقق المشكاة: اسناد صحيح.

**تا زندوش دەكرێتەوە بەردەوام پاداشتی ئەو کردەوە چاكانەی بۆ دەنوسرێ كە بەر لەمردن ئەنجامی دەدان))[1].**

**خوا ڕێزێكی‌تر لە شەهیدان دەنێ: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((والذي نفسي بيده، لا يكلم أحد في سبيل الله، والله أعلم بمن يكلم في سبيله، إلا جاء يوم القيامة اللون لون الدم، والريح ريح المسك:

**بەو خوایەی گیانی منی لە دەستە، هەر یەكێك لەپێناو خوا بریندار بێ، خواش زاناترە بەو كەسەی لە پێناو ویدا بریندار دەبێ، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا خوێنەكەی وەك تازە بێ ئاوەها هەڵدەڕژێ، ڕەنگەكەی ڕەنگی ئاڵی خوێنە و بۆنەكەی بۆنی میسكە))[2].**

**موعاذی كوڕی جەبەلﷺ دەڵێ: گوێم لێ بو پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو:**

((من قاتل في سبيل الله فواق ناقه، فقد وجبت له الجنة، ومن جرح جرحاً في سبيل الله أو نكب نكبة، فإنها تجيء يوم القيامة كأغزر ما كانت لونها الزعفران وريحها المسك:

**هەر پیاوێك ئەوەندەی دۆشینی وشترێك لە پێناو خوا لەگەڵ دوژمناندا بجەنگێ بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر دەكات، هەر كەسێك لە جیهاددا زامدار ببێ یان توشی لێقەومانێك ببێ، لە ڕۆژی قیامەتدا كە ئەو بریندارە یان ئەو لێقەوماوە ئامادە دەبێ؛ گەرمەی خوێن لێهاتنی برینەكەیەتی و هەرگیز لەوەو پێش خوێنێكی وا زۆری لەبەر نەڕۆیشتوە، ڕەنگەكەی وەك زەعفەران زەردە بۆنەكەشی وەك بۆنی میسك وایە))[3].**

**ئیبنو حەجەر دەڵێ: (زانایان وتویانە: حیكمەت و ئەنگێزە(هۆ)ی بەو جۆرە زندوبونەوەیان ئەوەیە تا ببێتە نیشانەو شاهێدی لەسەر خۆبەختكردن و قوربانیدانی ژیانی كە لە پێناو خوا فیدای كردوە)[4].**

---

[1] رواه الطبراني باسناد صحيح، صحيح الجامع الصغير: (٣/ ١٧١)، ژمارە: ٣٤٧٣.

[2] صحيح البخاري، كتاب الجهاد، بابا من يخرج في سبيل الله، فتح الباري (٦/٢٠).

[3] رواه الترمذي والنسائي وأبو داود بإسناد صحيح، مشكاة المصابيح: (٢/٣٥٥) ژمارە: ٣٨٢٥.

[4] فتح الباري (٦/٢٠).

## خوازگەی حەفتەم

# ئەوانەی تورەیی قوت دەدەنەوە

**زۆر جاران پیاو هەڵوێستێکی گرژی لەگەڵدا بەکار دەهێنرێ، رەنگە لە مەڕ برادەرێکی نزیك یان دۆستێکی خۆشەویستیشەوە بێت، ئەو هەڵوێستە دەبێتە مایەی ئازارکێشان و ناخی بریندار دەکا، جۆرەها کاردانەوەو هەڵچونی بۆ دەخرۆشێنێ، هانی دەدا ڕوبەڕوبونەوەی توندو تیژ بەرپا بکات.. لەو کاتە ناسکانەدا تەنها پیاوە نایەبەکان دەتوانن خۆیان ڕاگرن.**

**ئیسلام قوتدانەوەی تورەیی بەرەوشتێکی بەرزو پەسەند داناوەو خاوەنەکەی خەڵات دەکات و بەهەشتێکی هەندی ئەرزو ئاسمانی دەداتێ:**

﴿وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ، الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنْ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ: **پێشبرکێ و پەلە بکەن بۆ لێبوردنی خوا و بەهەشتێك کە هەندی ئەرزو ئاسمانان بەرینە کە بۆ پارێزکاران ئامادەکراوە، ئەوانەی لە هەبونی و نەبونیدا ماڵ دەبەخشن و تورەیی و رقی خۆیان قوت دەدەنەوە و چاوپۆشی لە خەڵك دەکەن، خوا چاکەکارانی خۆشدەوێت.**﴾[1].

**پێغەمبەرﷺیش دەفەرموێ:** ((من كظم غيظا ، وهو يقدر أن ينفذه دعاه الله على رؤوس الخلائق يوم القيامة حتى يخيره في أي الحور العين شآء: **هەر کەسێك بتوانێ رقەکەی بەیەکێك برێژێ بەڵام رقەکەی قوت داتەوە لەرۆژی قیامەتدا لەبەر چاوی ئەو هەمو خەڵکە رێزی لێ دەنێ و بانگی دەکات و دەیکاتە سەرپشك کە بە ئارەزوی خۆی پەریە چاو جوانەکانی بەهەشت هەڵبژێرێ**))[2].

---

[1] آل عمران: (١٣٣-١٣٤).

[2] رواه الترمذي وابوداود عن سهل بن معاذ بن جبل عن أبيه. مشكاة المصـــابيح(٢/٦٣١) ژمارە(٥٠٨٨)، وحسن إسناده في صحيح الجامع (٥/٣٥٣) ژمارەکەي ئەوی (٦٣٩٨)، عزاه إلى أحمد والطـــبراني، تەماشای ژمارە (٦٣٩٤) بکە لە صحيح الجامع دا.

## خوازگەی هەشتەم

# ئازادكردنی كۆیلەی موسڵمان

ئازادكردنی كۆیلە یەكێكە لەو كردەوانەی كە تەنگانەو ناخۆشیەكانی ڕۆژی قیامەت لەسەر خاوەنەكەی لادەدات، خوا دەفەرمویٚ:

((فَلاَ اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ، فَكُّ رَقَبَةٍ: هێشتا ئادەمی بە تێكڕایی پەلاماری پلەی سەختی نەداوە، تۆ چوزانیت پلەی سەخت كامەیە؟! ئازاد كردنی بەندەیە﴾البلد: ١١-١٣.

ئیبنوكەثیر لە تەفسیرەكەیدا بۆ زێتر ڕونكردنەوە چەندین فەرمودەی لەم بارەوە هێناوەتەوە:

❖ سەعیدی كوڕی مەرجانە گوێی لێبو ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((من أعتق رقبة مؤمنة أعتق الله بكل إرب منها إرباً منه من النار حتى أنه ليعتق بـالـيد اليـد وبالرجل الرجل وبالفرج الفرج: هەر كەسێك كۆیلەیەكی بڕوادار ئازاد بكات خوا لە پای هەر ئەندامێك ئەندامێكی لە ئاگر دەپارێزیٚ تەنانەت دەستی ئازاد بكا دەستی، پێی ئازاد بكا پێی، داوێنی ئازاد بكا داوێنی لە دۆزەخ ئازاد دەبیٚ)).

عەلی كوڕی حوسێن گوتی: تۆ بەخۆت ئەوەت لە ئەبو هورەیرە گویٚ لێبو؟ سەعید گوتی: بەڵیٚ. عەلی كوڕی حوسێن بە چالاكترینی خزمەتكارەكانی گوت بانگی موطرەف بكە با بێت، كە هات پێی گوت: بڕۆ لە پێناو خوا ئازادم كردی.[1]

[1] قال الإمام أحمد حدثنا عبدالله يعني ابن سعيد بن أبي هند عن إسماعيل بن أبي حكيم مولى آل الزبير، عن سعيد بن مرجانة أنه سمع أبا هريرة يقول: قال رسول الله ﷺ:...، و رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي من طرق عن سعيد بن مرجانة.

ئەو کۆیلەیەی عەلی کوڕی حوسێنی زەینولعابدین ئازادی کرد دە هەزار درهەمی پێدرابو.[1]

ئەبو نەجیح دەڵێ گوێم لێبو پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو:

((أيما مسلم أعتق رجلاً مسلماً، فإن الله جاعل وفاء كل عظم من عظامه عظماً من عظام محررة من النار، وأيما امرأة مسلمة أعتقت إمرأة مسلمة فإن الله جاعل وفاء كلّ عظم من عظامها عظماً من عظاماها من النار: هەر موسڵمانێك پیاوێکی موسڵمانی ئازاد کرد لەپای هەر ئێسقانێکیدا ئێسقانێکی لە دۆزەخ ئازاد دەکات، هەر ئافرەتێکی موسڵمان ئافرەتێکی موسڵمانی کۆیلە ئازاد بکات، خوا لەپای هەر ئێسقانێکیدا ئێسقانێکی لە دۆزەخ ئازاد دەکات)).[2]

❖ پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((من بنى مسجداً ليذكر الله فيه يبني الله له بيتاً في الجنة. ومن أعتق نفساً مسلمة كانت فديته من جهنم، ومن شاب شيبة في الإسلام كانت له نوراً يوم القيامة: ئەو کەسەی مزگەوتێك دروست بکات تاوەکو خەڵك یادی خوای تێدا بکەنەوە خوا لە بەهەشتدا خانوێکی بۆ دروست دەکات، هەر کەسێك موسڵمانێك ئازاد بکات خوا لە دۆزەخی ڕزگار دەکات، هەر کەسێك تاڵەموێکی لە ناو ئیسلامدا سپی کردبێ لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە ڕوناکی)).[3]

❖ پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((من أعتق رقبة مسلمة كانت فكاكه من النار عضواً بعضو، ومن شاب شيبة في سبيل الله كانت له نوراً يوم القيامة، ومن رمى بسهم فبلغ فأصاب أو أخطأ كان كمعتق رقبة من بني إسماعيل:

---

[1] عند مسلم.

[2] قال قتادة عن سالم بن أبي الجعد عن معدان بن أبي طلحة عن أبي نجيح.... رواه ابن جرير، هكذا، وأبو نجيح هذا هو عمرو بن عبسة السلمي.

[3] قال الإمام أحمد: حدثنا حيوة بن شريح، حدثنا بقية، حدثني بحير بن سعد عن خالد بن معدان عن كثير بن مرة عن

هەر کەسێك موسڵمانێك ئازاد بکات ئەندام بە ئەندام دەبێتە باتی رزگاربونی لە دۆزەخ. هەر کەسێکیش هەر تاڵە موێکی سەری لەناو ئیسلامدا سپی بکات لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە ڕوناکی، ئەو کەسەی لە پێناو خوا تیرێك باوێژێو بگاتە جێ مەبەست جا بپێکی یان نا خێرەکەی وەکو ئەوەیە بەندەیەکی نەوەی ئیسماعیلی ئازاد کردبێ)) [1]

❖ ((من ولد له ثلاثة أولاد في الإسلام فماتوا قبل أن يبلغوا الحنث أدخلـه الله الجنة بفضل رحمته إياهم، ومن شاب شيبة في سبيل الله كانت له نوراً يوم القيامـة، ومن رمى بسهم في سبيل الله بلغ به العدو أصاب أو أخطأ كان له عتـق رقبـة، ومن أعتق رقبة مؤمنة أعتق الله بكل عضو منه عضواً من النار، ومن أنفق زوجـين في سبيل الله فإن للجنة ثمانية أبواب يدخلـه الله مـن أي بـاب شـاء منـها: ئەو کەسەی سێ منداڵی ببێو بەر لەوەی خۆ بناسن بمرن خوا بە بەزەیی خۆی لەبەر ئەوان لێی خۆش دەبێ. ئەو کەسەی موی سەری لەناو ئیسلامدا سپی بکات لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە ڕوناکی. ئەو کەسەی تیرێك لە دوژمن بگرێ جا پێی بکەوێ یان نا پاداشتی ئازاد کردنی کۆیلەیەکی هەیە، ئەو کەسەی کۆیلەیەکی بڕوادار ئازاد بکات خوا لە پای هەر ئەندامێکی ئەندامێکی ئازاد دەکات، ئەو کەسەی جوتێك لە پێناو خوا ببەخشێ؛ (بەهەشت) هەشت دەرگای هەیە کام دەرگای مەبەست بێ خوا لەوێ دەیباتە ژورەوە)). [2]

❖ واثیلەی کوڕی ئەسقەع گوتی: لەبارەی حاڵی برادەرێکمانەوە چوینە لای

---

عمرو بن عبسة أنه حدثهم أن النبي ﷺ قال: ...

[1] قال أحمد: حدثنا الحكم بن نافع حدثنا جرير عن سليم بن عامر أن شرحبيل بن السمط قال لعمرو بن عبسـة: حدثنـا حديثاً ليس فيه تزيد ولانسيان. قال عمرو: سمعت رسول الله ﷺ يقول:.. وروى أبو داود والنسائي بعضه.

[2] قال أحمد: حدثنا هاشم بن القاسم، حثنا الفرج، حدثنا لقمان عن أبي أمامة عم عمرو بـن عبسـة، قـال السلمي: قلت له حدثنا حديثاً سمعته من رسول الله ﷺ ليس فيه انتقاص و لا وهم، قال: سمعته يقـول:... پاش فەرمودەکە وتویەتی: وهذه أسانيد جيدة قوية، ولله الحمد.

**پێغەمبەر ﷺ کە ئەویش فەرموی:**

**((اعتقوا عنه، يعتق الله بكل عضو منه عضواً من النـــار: بەندەی بۆ ئازاد بکەن چونکە خوا لە پای هەر ئەندامێکیدا ئەندامێکی لە دۆزەخ ڕزگار دەکات)).[1]**

❖ **پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

**((من أعتق رقبة مسلمة فهو فداءه مـــن النـــار: ئەو کەسەی موسڵمانێك ئازاد بکات دەبێتە سەرگەردی ڕزگاربونی لە دۆزەخ)).[2]**

❖ **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:**

**((من اعتق رقبة مؤمنة فهي فكاكه من النار: ئەو کەسەی بڕوادارێك ئازاد بکات خوا لە دۆزەخ ئازادی دەکات)).[3]**

❖ **بەڕائی کوڕی عازب دەگێڕێتەوە وە دەڵێ: دەشتەکیەك هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکم فێر بکە پێی بچمە بەهەشتێ؟ فەرموی:**

**((لئن كنت أقصرت الخطبة لقد أعرضت المســـــألة، اعتـــــق النســـمة و فـــك الرقبـــة: ئەگەریش وتەکەت کورت کردەوە، بەڵام مەسەلەکەت درێژ کردەوە؛ کۆیلە ئازاد بکە، بەندە ئازاد بکە)).**

**<u>گوتي: ئەی پێغەمبەري خوا ئەدي ئەم دوە یەك شت نین؟ فەرموی:</u>**

[1] قال أبو داود: حدثنا عيسى بن محمد الرمي حدثنا ضمرة عن ابن ابي عبلة، عن العريف بن عياش الديلمـــي، قال: أتينا واثلة بن الأسقع فقلنا له: حدثنا حديثاً ليس فيه زيادة ولانقصان، فغضب وقال: إن أحدكم ليقـــرأ ومصحفه معلق في بيته، فيزيد وينقص قلنا انما اردنا حديثاً سمعته من رسول الله ﷺ قال: أتينا ... وكـــذا رواه النسائي من حديث ابراهيم ين أبي عبلة عن العريف بن عياش الديلمي عن واثلة به.

[2] قال أحمد: حدثنا عبدالصمد حدثنا هشام عن قتادة عن قيس الجذامي عن عقبة بن عامر الجهني أن رسول الله ﷺ قال: ....

[3] وحدثنا عبدالوهاب الخفاف عن سعيد عن قتادة قال: ذكر لنا أن قيساً الجذامي حدث عن عقبة بن عامر أن رسول الله ﷺ قال:... تفرد به أحمد من هذا الوجه.

((لا، إن عتق النسمة ان تنفرد بعتقها وفك الرقبة آن تعين في عتقها والمنحة الوكوف والفيء على ذي الرحم الظالم فإن لم تطق ذلك فاطعم الجائع واسق الظمآن وائتمر بالمعروف وانه عن المنكر فإن لم تطق ذلك فكف لسانك إلاّ من الخير: نەء، (عتق النسمة) ئازاد کردنی بەندەیە، بەلاّم (فك رقبة) یارمەتیدانە لە ئازاد کردنی. سەردانی خزمان بکە ئەگەرچی ئەوان سەردانیان نەکردی، ئەگەر نەتتوانی نان بدەیە برسییان، ئاو بدە تێنوان و فەرمان بە چاکە و نەرێ لە خراپە بکە، ئەگەر نەشتتوانی ئەوا زمانت تەنها لە چاکە وەگەڕێنە))[1].[2]

---

[1] قال الإمام أحمد، حدثنا يحيى بن آدم وأبو أحمد، قالا حدثنا عيسى بن عبدالرحمن البجلي من بني بجيلة من بني سليم عن طلحة بن مصرف عن عبدالرحمن بن عوسجة عن البراء بن عازب....

[2] تفسير ابن كثير: (٧ / ٢٩٥).

## خوازگەی نۆیەم

# پایەی بانگدەران

بانگدەرەکانیش لە ڕۆژی قیامەتدا ڕێزیان لێدەنرێ و گەردنیان لە هەمو کەس بەرزترە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:

((المؤذنون أطول الناس أعناقاً يوم القيامة: لەڕۆژی قیامەتدا بانگدەران گەردنیان لە هەمو کەس درێژترە)).[1]

گەردنبەرزی بۆ مرۆڤ جوانیە بۆیە خوا ئاوەها جوانیان نیشان دەدات چونکە دەنگی یەکخواناسیو نوێژیان بەرزکردۆتەوە.

هەر کەس و شتێکیش لە دنیادا گوێی لە دەنگی بانگدەر بێ لەڕۆژی قیامەتدا شایەدی بۆ دەدا:

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی صەعصەعە گوتی: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ پێی گوتم: دەبینم حەزت لە مالات و مەڕداری و دەشتە، بزانە هەر کاتێك لە ناو مەڕو ماڵەکەتدا بویو بانگت دا یان لەو دەشتە بویو بانگت دا، تاپێت دەکرێ دەنگت بەرزبکەوە چونکە هەرچی مرۆڤ و جنۆکەو هەرشتێکیتر گوێیان لە دەنگی بانگدەر بێ لە ڕۆژی قیامەتدا شایەدی بۆ دەدەن)).[2]

---

[1] صحيح مسلم: (٤/٢٩٠) ژمارە: (٣٨٧).

[2] صحيح البخاري، كتاب التوحيد، باب قول النبي ﷺ: ((الماهر بالقرآن .....)) فتح الباري (١٣/ ٥١٨).

## خوازگەی دەیەم

## ئەو موسڵمانانەی موی سەرو ڕدێنیان سپی دەبێ

گەلێ فەرمودە لەم بارەوە هەن کە هەر کەسێك بە موسڵمانێتی هەر موێکی سەری سپی بکات بۆی دەبێتە ڕوناکی ڕۆژی قیامەتێ:

کەعبی کوڕی مورە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((من شاب شيبة في الإسلام كانت له له نوراً يوم القيامة: هەر کەسێك لە ناو ئیسلامدا موی سەری سپی ببێ لەڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە ڕوناکی)).[1]

- عومەری کوڕی عەبسە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((من شاب شيبة في سبيل الله كانت له نوراً يوم القيامة)).[2]

- عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((الشيب نور المؤمن لا يشيب رجل شيبة في الإسلام إلاّ كانت له بكل شيبة حسنة ورفع بها درجة: پرچی سپی ڕوناکی بڕوادرارانە، هەر کەسێك لەناو ئیسلامدا پرچی سپی ببێ لە پای هەر تاڵە موێکیدا چاکەیەکی پاداشتەو پلەیەکیش بەرز دەکرێتەوە)).[3]

ئەم فەرمودەیە بە فەرمودەیەکی تر شاهدی هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئەبو هورەیرە بە مەرفوعی دەگێڕێتەوە:

---

[1] في مسند أحمد، سنن الترمذي والنسائي وبن حبان. صحيح الجامع الصغير: (٥/ ٣٠٤) ژمارە: (٦١٨٣)، وعلّم الشيخ ناصر بالصحة.

[2] صحيح الجامع الصغير: (٥/٣٠٤) ژمارە (٦١٨٤) والحديث صحيح كما قال محقق الكتاب.

[3] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣/٢٤٧) ژمارە (١٢٤٣).

((لا تنتفوا الشيب فانه نور يوم القيامة من شاب شيبة في الإسلام كانت له بكل شيبة حسنة ورفع بها درجة: **تاڵە موە سپییەکانی سەرتان دەرمەکێشن چونکە ڕوناکی ڕۆژی قیامەتن، هەر کەسێك لەناو ئیسلامدا موی سەری سپی بکات، ئەوا بۆ هەر موێکی سپی چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ‌و پلەیەکی پێ بەرز دەبێتەوە))**.[1]

❖ **فوضالەی کوڕی عوبەید دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((الشيب نور في وجه المسلم فمن شاء فلينتف نوره: **موی سپی نوری دەموچاوی موسڵمانە، جا ئەوەی دەیەوێ با ئەو نورە هەڵکێشێ))**.[2]

---

[1] رواه ابن حبان بإسناد حسن. المصدر السابق.

[2] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣/٢٧٤) ژمارە (١٢٤٤).

## خوازگەی یازدەم

# پایەی دەسنوێژ

ئەوانەی وەڵامی بانگەوازی خواو پێغەمبەرﷺیان داوەتەوەو دەسنوێژی پوختیان هەڵگرتوە لە ڕۆژی قیامەتدا ناوچەوان و دەست و پێیان نورانییەو بە نێوچەوان و چوار پەل سپی بانگ دەکرێن:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ لە پێغەمبەرم گوێ لێبو دەیفەرمو:

((إن أمتي يُدْعون يوم القيامة غُرّاً محجّلين من آثار الوضوء: لە ڕۆژی قیامەتدا نەتەوەی من بە نێوچەوان و چوار پەل سپی بانگیان دەکرێ کە بە سای دەسنوێژەوە نورانی بونە)).[1]

ئیبنو حەجەر دەڵێ: "(غُرّاً) کۆی (أغَرّ)ـە، واتە خاوەن غُرّە، (غرّە) لە بنەڕەتدا بەو شەوقە سپیە دەڵێن کە لە نێوچەوانی ئەسپدا هەیە. پاشان بۆ جوانیو ناوبانگ و پەسەندی بەکار هاتوە، لەم فەرمودەیەدا مەبەستی لەو نورە دێت کە لە نێوچەوانی نەتەوەی موحەممەدﷺدا دەبێ، غُرّاً مەنصوبی سەر حالە، کەواتە واتاکەی ئاوەهایە: لە ڕۆژی دواییدا لە ناو خەڵکدا گەر بانگ بکرێن بەو وەسفە بانگ دەکرێن، چونکە ئەم سیفەتەیان تێدایە.

(محجلين) لە (تحجيل)ـەوەیە، کە سپیاتیەکە لە سێ پای ئەسپدا هەیە لە بنەڕەتدا لە (الحجل)دا هاتوە واتە خڵخاڵ(پاوانە)، بەڵام لێرەدا مەبەستی ڕوناکیە.[2]

ئەو نێوچەوان و دەست و پێ نورانی بونە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئیمانداران

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الوضوء. فتح الباري: (١/٢٣٥).

[2] فتح الباري: (١/٢٣٦).

دەبێتە پۆشتە و خشڵ:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:

((تبلغ الحلية من المؤمن حيث يبلـــــغ الوضـــوء: هـەتا کوێ ئـەندامی موسڵمان ئاوی دەسنوێژ بیگرێتەوە لە ژینەوەدا هەتا ئەوێ خشڵپۆش دەبێ)) .

نەتـەوەی پێغەمبـەرﷺ بەسـای ئـەو پۆشـتە نورانیـەوە لـە ڕۆژی قیامـەتدا لـە نەتـەوەکانی دی جیا دەکرێنـەوە، پێغەمبـەرﷺیـش بـەو نیشانەیە نەتەوەکـەی خـۆی دەناسێتەوە، یاوەر و نایاوەران هەمویان ئاوەها نورانی و پۆشتەن:

ئەبوهورەیرەﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ کە پێغەمبەرﷺ چوە سەر گۆڕستانی بەقیع و فەرموی:

((السلام عليكم دار قوم مؤمنين وإنا إن شاء الله بكم لاحقون وددت أنا قد رأينــــا إخواننا، قالوا: أولسنا إخوانك يا رسول الله؟ قال: أنتم أصحابي، إخواننا الذين لم يــــأتوا بعد. فقالوا: كيف تعرف من لم يأت بعد من أمتك يا رسول الله؟ فقال: أرأيـــت لـــو أن رجلاً له خيل غر محجلة بين ظهري خيل دهم بهم، ألا يعرف خيله؟ قالوا: بلى يا رســـول الله، قال: فإنهم يأتون غراً محجلــــين مـــن الوضـــوء وأنـــا فرطـــهم علـــى الحـــوض: ئەی بڕوادارانی نێو شاری خامۆشان! سڵاوتان پێشکەش، گەر خوا حەز بکا ئێمەش پێتان دەگەینەوە، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرموی: خۆزگە براکانیشمان دەدیت، یاوەران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی ئێمە برای تۆ نین؟ فەرموی: ئێوە یـاوەری منن، براکانم ئەو موسڵمانانەن کە هێشتا نەهاتوز پاشان لە دایک دەبن، گوتیان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا چۆن دەزانی لـە نەتـەوەی تـۆن؟ فەرموی: پێم بڵێن ئەگـەر پیـاوێك ڕەوگە ماینێکی ماپۆی چوارپەل سپی لەناو حەشامەتێك ماینی ڕەشی پەتیدا بێ، ئایـە ڕەوگەکـەی خـۆی ناناسـێتەوە؟ گوتیـان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا!،

---

رواه مسلم في صحيحه، مشكاة المصابيح: (١/٩٦) ژمارە: (٢٩١).

خۆشەویست فەرموی: دەبزانن نەتەوەی منیش کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێنە لام، خۆم لە سەر حەوزی کەوسەر چاوەنواڕیان دەکەم، هەمویان نێوچەوان سپی و ماڕۆ و چوار پەل سپین و ئەو شوێنانەی ئەندامیان کە ئاوی دەسنوێژ دەیانگرێتەوە سپی و گەش و جوانن))[1].

ئەبودەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((أنا أول من يؤذن له بالسجود يوم القيامة، وأنا أول من يؤذن له أن يرفع رأسه، فأنظر إلى ما بين يدي فأعرف أمتي من بين الأمم ومن خلفي مثل ذلك وعن يميني مثل ذلك وعن شمالي مثل ذلك، فقال رجل: يا رسول الله كيف تعرف أمتك من بين الأمم فيما بين نوح إلى أمتك؟ قال: هم غر محجلون من أثر الوضوء ليس أحد كذلك غيرهم وأعرفهم أنهم يؤتون كتبهم بأيمانهم وأعرفهم تسعى بين أيديهم ذريتهم: لەرۆژی قیامەتدا من یەکەمین کەسم کە مۆڵەتم پێ دەدرێ سوژدە ببەم، من یەکەمین کەسم کە مۆڵەتم پێ دەدرێ سەر هەڵبڕم، لە هەمولایەك، پێشەوە، ڕاست، چەپ، پشت. کە تەماشا دەکەم نەتەوەی خۆم دەناسمەوە، پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەناو ئەو هەمو خەڵکەی سەردەمی نوحەوە تا نەتەوەی خۆت چۆن دەیانناسیەوە؟ فەرموی: ئاخر نەتەوەی من ئەندامەکانی دەسنوێژیان سپی و نورانیە و کەسی تر وا نیە، هەروەها بەوەش دەیانناسمەوە کە کارنامەکانیان بەدەستی ڕاست وەردەگرن. بەوەش دەیانناسمەوە کە منداڵ و نەوەکانیان لە بەردەمیاندا دەبن))[2].

---

[1] رواه مسلم، مشكاة المصابيح: (١/٩٨) ژمارە (٢٩٨).

[2] رواه أحمد بإسناد صحيح، مشكاة المصابيح: (١/٩٩) ژمارە (٢٩٩).

بـەنـدی نـۆیـەم

# تکاخوازی

لە گۆڕەپانی ڕۆژی قیامەتدا کە خەڵك بێزار دەبن و پەرژەنگ و مەینەتیەکان لە بەرگە دەردەچن؛ چاو لە خاوەن پایە بەرزو بەڕێزەکانی لای خوا دەگێڕن و داوایان لێدەکەن لە خوا بپارێنەوە تا لەو ڕەزاڵەتە ڕزگاریان بکات و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەنجام بدات و یەکلایان بکاتەوە.

ڕودەکەنە لای ئادەمی بابە گەورەیان و باسی پایە و ڕێزەکەی دەکەن، ئینجا داوای لێدەکەن ئەم کارە گەورەیە ئەنجام بدات، بەڵام ڕازی نابێ و تەوازۆ(عذر) دێنێتەوەو باسی گوناحەکەی دەکات کە کاتی خۆی بەری درەختە قەدەغە کراوەکەی خواردوە. پاشان فەرمویان لێدەکا بچنە لای پێغەمبەر نوح کە یەکەمین پەیامبەری سەر ڕوی زەمین بوەو خوا وەسفی (بەندەی سوپاسگوزار)ی پێداوە، بەڵام ئەویش تەوازۆ دێنێتەوە و باسی کەمتەرخەمی و درێغیەکانی خۆی دەکات، بەم جۆرە ڕەوانیان دەکاتە لای پێغەمبەرانی ئولولعەزم ئەوانیش هەر یەکەیان بۆ لای ئەوەی تریان دەنێرن تا دەچنە لای موحەممەدی دواهەمین پێغەمبەرﷺ کە خوا لە گوناحی بەر و دوای بوریوە، ئەویش هەڵدەستێ و دەچێتە شوێنپایەیەکی وا کە خەڵکانی سەرەتا و کۆتا ستایشی دەکەن، بە هۆیەوە پلەو پایە مەزن و بەرزەکەی وەدەر دەکەوێت، لە خوا دەپاڕێتەوە تا مۆڵەتی بدات. ئەوجا ستایشی خوا دەکات و بە شکۆمەندی خواوە هەڵدەڵێ و بۆ نەتەوەکەی دەپاڕێتەوە، خواش پاڕانەوەکەی قبوڵ دەکات. لەبەر ئەوەی هەمو پێغەمبەران هەریەکەو نزایەکیان لە بارەی نەتەوەکەیانەوە هەیە خوا قبوڵی بکات، بەڵام هەر هەمویان پەلەیان کردوەو لە دنیادا داوایەکەیان کردوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو ڕۆژەی هەڵگرتوە، بەڕاستی هەر وەکو خوا وەسفی کردوە لە ئاست بڕواداران دڵنەرم و دلۆڤانە.

**ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((كل نبي سأل سؤالاً أو قال لكل نبي دعوة دعاها لأمته، وإني اختبأت دعوتي شفاعةً لأمتي يوم القيامة: **هەمو پێغەمبەرێك داخوازی یان نزایەکی بۆ نەتەوەکەی کردوە بەڵام من نزای خۆم بۆ تکاخوازی ڕۆژی قیامەت هەڵگرتوە))**[1].

**جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((لكل نبي دعوة دعا بها في أمته وخبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة: **هەمو پێغەمبەرێك نزایەکی هەبوەو بۆ نەتەوەکەی کردوە بەڵام من نزای خۆم بۆ تکاخوازی ڕۆژی قیامەت هەڵگرتوە))**.

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((لكل نبي دعوة مستجابة فتعجّل كل نبي دعوته وأني أختبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة، فهي نائلة إن شاالله من مات من أمتي لا يشرك بالله شيئاً: **هەمو پێغەمبەرێك نزایەکی قبوڵکراوی هەیە، هەموشیان پەلەیان کردوەو نزاکەیەیان کردوە بەڵام من بۆ تکاخوازی ڕۆژی قیامەتم هەڵگرتوە، ئینشائەڵا هەمو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە نەتەوەی من دەمرن و هاوبەش بۆ خوا پەیدا ناکەن))**[2].

**ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((شفاعتي لأهل الكبائر من أمتي: **تکاخوازیەکەم بۆ ئەو کەسانەی نەتەوەکەمە کە تاوان و گوناحی گەورەیان کردوە))**[3].

---

[1] بوخاري گێراویە، جامع الأصول: ١٠/٤٧٥ ژمارە: ٨٠٠٩

[2] رواه مسلم، جامع الأصول: ١٠/٤٧٥، ژمارە: ٨٠١٠، لە هەردو صەحیحي بوخاری و موسلیم و سونەنی ترمذی دایە، جامع الأصول: ١٠/٤٧٦، ژمارە: ٨٠١١

[3] جامع الأصول: ١٠/٤٧٦، ژمارە: ٨٠١٢ وإسناده صحيح كما قال محقق الكتاب.

## جێباسی یەکەم

# فەرموودەکانی تکاخوازی

گەلێك فەرموودە لە بارەی چۆنیەتی تکاخوازی هەرە گەورە(الشفاعة العظمی)دا هاتون، بەڵام ئێمە تەنها ئەو فەرموودانە دێنینەوە کە ئیبنولئەثیر لە جامیعولئوصولدا کۆی کردونەتەوە:

١. بوخاریو موسلیم لە هەردو صەحیحەکەیاندا لە مەعبەدی کوڕی هیلالی عەنەزی دەگێڕنەوە کە گوتویەتی:

(جارێکیان چوینە لای ئەنەسی کوڕی مالیك و (ثابت)یشمان لەگەڵ خۆدا برد، کە گەیشتینە لای نوێژی چێشتەنگاوەی دەکرد، ثابت ئیزنی بۆ خواستین و چوینە ژورەوە. ثابت لە تەنیشت ویدا لەسەر تەختەکەی دانیشت و پێی گوت: ئەبو حەمزە! ئەو برایانەت خەڵکی بەسران و دەیانەوێ فەرموودەی تکاخوازیان بۆ باس بکەی.

ئەویش گوتی: موحەممەد ﷺ بۆمانی فەرموەو وتویەتی:

((إذا کان یوم القیامة ماج الناس بعضهم إلی بعض، فیأتون آدم، فیقولون: اشفع لذریتك، فیقول: لست لها، ولکن علیکم بإبراهیم، فإنه خلیل الله، فیأتون إبراهیم، فیقول: لست لها، ولکن علیکم بموسی، فإنه کلیم الله، فیؤتی موسی، فیقول: لست لها، ولکن علیکم بعیسی، فإنه روح الله وکلمته، فیؤتی عیسی، فیقول: لست لها، ولکن علیکم بمحمد. فأؤتی فأقول: أنا لها، ثم انطلق فاستأذن علی ربي، فیؤذن لي، فأقوم بین یدیه، فأحمده بمحامد لا أقدر علیها إلاّ أن یلهمنیها، ثم أخر لربنا ساجداً، فیقول: یا محمد، ارفع رأسك، وقل یسمع لك، وسل تعطه،

---

[1] جامع الأصول:(١٠/٤٧٧) تەخریجی فەرموودەکان وەك چۆن موحەققیقی پەرتوکەکە لە پەراوێزدا نوسیومانە.

واشفع تشفع، فأقول: يارب أمتي، فيقول: انطلق، فمن كان في قلبه مثال حبة من بُرَّة أو شعيرة من إيمان فأخرجه منها، فأنطلق فأفعل.

ثم أرجع إلى ربي فأحمده بتلك المحامد، ثم أخر له ساجداً، فيقول لي: يا محمد، ارفع رأسك. وقل يسمع لك، وسل تعطه، واشفع تشفع، فأقول: يا رب أمتي أمتي، فيقال لي: انطلق، فمن كان في قلبه مثقال حبةٍ من خردلٍ من إيمان فأخرجه منها، فأنطلق فأفعل.

ثم أعود إلى ربي أحمده بتلك المحامد، ثم أخر له ساجداً، فيقال لي: يا محمد، ارفع رأسك وقل يسمع لك، وسل تعطه، واشفع تشفع، فأقول: يا رب، أمتي أمتي، فيقال لي: انطلق، فمن كان في قلبه أدنى أدنى أدنى من مثقال حبة من خردل من إيمان فأخرجه من النار فأنطلق فأفعل:

**که ڕۆژی قیامەت دادێت خەڵك بەسەر یەکدا جمە دەدەن و تێکدەشڵەژێن. ئینجا دەچنە لای ئادەم و پێی دەڵێن: تکاخوازی بۆ نەوەکانت بکە، دەڵێ من ئەو کەسە نیم بەڵام بڕۆنە لای ئیبراهیمی پێغەمبەر کە ئازیزی خوایە. دەچنە لای و پێی دەڵێن تکا خوازیمان بۆ بکە، دەڵێ: من ئەو کەسە نیم، بەڵام بڕۆنە لای موسا کە خوا قسەی لەگەڵدا کردوە. دەچنە لای موساو داوای لێدەکەن، دەڵێ: ئەو کەسە نیم بەڵام بڕۆنە لای عیسای ڕوح و کەلیمەی خوا، دەچنە لای و داوای لێدەکەن، دەڵێ: ئەو کەسە نیم بەڵام بڕۆنە لای موحەممەد.**

**دێنە لای من و دەڵێم: من ئەو کەسەم، پاشان مۆڵەت دەخوازم، مۆڵەتم دەدەن و دەچمە پێشگاهی خوا و بە چەند ستایشێکی وا ستایشی خوا دەکەم کە ئێستا ناتوانم بیانبێژم چونکە خوا ئەو کاتی ئیلهامم بۆ دەکات، ئینجا دەچمە سوژدە، پێم دەڵێ: موحەممەد: سەر هەڵبڕە، بڵێ لێت دەبیسترێ و داوا بکە دەتدرێتێ و تکا بکە قبوڵ دەکرێ، منیش دەڵێم: پەروەردگارا! نەتەوەکەم، نەتەوەکەم. دەفەرموێ: بڕۆ هەرچی بە قەد سەنگی دەنکە گەنمێك یان بە قەد دەنکە جۆیەك بڕوای لە دڵدا هەبێ لە ناو ئاگر دەری بێنە جا منیش دەچم و دەریاندێنم.**

**پاشان دەگەڕێمەوە لای خواو بە هەمان ستایش ستایشی خوا دەکەم و پاشان دەچمە سوژدە. پاشان دوبارە و سێبارە دەچمەوە لای پەروەردگار و هەمان شت**

دەڵێم و دەکەم و پێم دەڵێن. لە جاری دوەمدا خوا پێم دەڵێ ئەو کەسەی بەقەد سەنگی دەنکە خەردەڵێك بڕوای لە دڵدا هەبێ لە ئاگری دەربێنە لە جاری سێیەمیشدا ئەو کەسەی بە قەد سەنگی کەمترو کەمتریش لە دەنکە خەردەلەیەك)).

مەعبەد دەڵێ: ئەوە فەرمودەکەی ئەنەس بو کە بۆی گێڕاینەوە ئینجا کە لە خزمەتیدا مەرەخەس بوین، ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای سەروی جەببان کە جێیەکە لە بەصرە، گوتمان: چۆنە بچینە لای حەسەنی بەسرایی کە لە ماڵی ئەبو حەنیفەدا لە ترسی حەججاجی کوڕی یوسف خۆی شاردبۆوە، دەڵێ: چوینە ژورەوەو سڵاومان کرد. گوتمان: ئەبو سەعید وا لە لای ئەبو حەمزەی برای موسڵمانت دێینەوە فەرمودەیەکی وای بۆ گێڕاینەوە لەوەو پێش فەرمودەی وامان نەبیستبو. گوتی: ئێی.. ئێمەش فەرمودەکەمان بۆ گوتەوە، گوتی: ئێی چی‌تر؟ گوتمان: تەواو هەر ئەوەندەی بۆ گێڕاینەوە، گوتی: بەر لە بیست ساڵ هێشتا لە سەر شەنگ و تاقەتی خۆی بو هەمان فەرمودەی بۆ گێڕاینەوە. بەڵام هەندێکی بۆ ئێوە نەگێڕاوەتەوە، جا نازانم لەبیری چوە یان لەبەر ئەوەیە نەبادا لە ئەنجامدانی کردەوەی چاکدا ساردی بنوێنن. گوتمان: دە بۆمان بگێڕەوە. پێکەنی‌و گوتی: مرۆڤ لە پەلەپەل وتاڵوکە بەدیهێنراوە، من ئەوەم هەر بۆیە گوت تا بۆتانی بگێڕمەوە.

گوتی: ((ثم أرجع إلى ربي في الرابعة فأحمده بتلك المحامد، ثم أخر له ساجداً، فيقال لي: يا محمد، ارفع رأسك، وقل يسمع لك، وسل تعطه، واشفع تشفع، فأقول: يا رب ائذن لي فيمن قال: لا إله إلاّ الله، قال: فليس ذلك لك، أو قال: ليس ذلك إليك، ولكن وعزتي وكبريائي وعظمتي لأخرجن منها من قال: لا إله إلاّ الله:

پاشان بۆ جاری چوارەم دەچمەوە لای خواو بە هەمان ستایش ستایشی دەکەمەوە پاشان دەچمە سوژدە، پێم دەڵێ: موحەممەد! سەر هەڵبڕەو بڵێ لێت دەبیستم و داوا بکە پێت دەبەخشم و تکا بخوازە بۆت جێبەجێ دەکەم. دەڵێم: پەروەردگار! ڕێگەم بدە ئەوانەش لە دۆزەخ دەربێنم کە تەنها گوتویانە لا إله إلاّ الله و هیچ کردەوەیەکی

چاکیان نیە. دەفەرموێ: ئەوە بۆ تۆ نیە، بەڵام سوێند بە عیززەت و کبریاء و مەزناتی خۆم ئەوەی گوتبی لا إله إلاَ الله لە دۆزەخی دەردەهێنم)).

مەعبەد دەڵێ: گەواهی دەدەم حەسەنی بەسرایی وتویەتی ئەو زیادەیەم نزیکەی بەر لە بیست ساڵ لە ئەنەسی کوڕی مالیك بیستوە کە ئەوکاتە لەسەر شەنگ و هێزی خۆی بو و پیر نەببو.

لە بێژانەوەکەی قەتادەدا دەڵێ ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((يجمع الله الناس يوم القيامة، فيهتمون لذلك – وفي رواية: فيلهمون لذلك – فيقولون: لو استشفعنا إلى ربنا، حتى يريحنا من مكاننا هذا؟ قال: فيأتون آدم، فيقولون: أنت آدم أبو الخلق، خلقك الله بيده، ونفخ فيك من روحه، وأمر الملائكة فسجدوا لك، اشفع لنا عند ربك حتى يريحنا من مكاننا هذا، فيقول: لست هناكم، فيذكر خطيئته التي أصاب، فيستحي ربه منها، ولكن ائتوا نوحاً أول رسول بعثه الله إلى أهل الأرض.

قال: فيأتون نوحاً، فيقول: لست هناكم، فيذكر خطيئته التي تصاب، فيستحي ربَّه منها، ولكن ائتوا إبراهيم الذي اتخذه الله خليلاً، فيأتون إبراهيم، فيقول: لست هناكم، وذكر خطيئته التي أصاب، فيستحي ربه منها، ولكن ائتوا موسى الذي كلمه الله وأعطاه التوراة.

قال: فيأتون موسى، فيقول: لست هناكم، ويذكر خطيئته التي أصاب، فيستحي ربه منها، ولكن ائتوا عيسى روح الله وكلمته، فيأتون عيسى روح الله وكلمته، فيقول: لست هناكم، ولكن ائتوا محمداً، عبداً غفر الله ما تقدم من ذنبه وما تأخر.

قال: قال رسول الله ﷺ: فيأتوني، فأستأذن على ربي، فيؤذن لي، فإذا أنا رأيته وقعت ساجداً فيدعني ما شاء الله، فيقال: يا محمد، ارفع، قل يسمع، سل تعطه، اشفع تشفع، فأرفع رأسي، فأحمد ربي بتحميد يعلمنيه ربي، ثم أشفع، فيحد لي حداً، فأخرجهم من النار، و أدخلهم الجنة، ثم أعود فأقع ساجداً، فيدعني ما شاء الله أن يدعني، ثم يقال لي: ارفع يا محمد، قل يسمع، سل تعطه، اشفع تشفع، فأرفع رأسي، فأحمد ربي بتحميد يعلمنيه، ثم أشفع، فيحد لي حداً، فأخرجهم

من النار، وأدخلهم الجنة.

قال: فلا أدري في الثالثة أو في الرابعة فأقول: يا رب، ما بقي في النار إلاّ من حبسه القــرآن، أو وجب عليه الخلود: خوا سەرجەم خەڵكی لە ڕۆژی قیامەتدا كۆدەكاتەوە خەڵك هەر هەمو خەم لەو كۆبونەوەیان دەخۆن یاخۆ خوا دەخاتە دڵیانەوە تا یەكێك بدۆزنەوە ببێتە تكا كاریان. دەڵێن با یەكێك بدۆزینەوە لە لای خوا تكامان بۆ بكات بەڵكە لە ناخۆشیو دەردەسەری ئەو ڕاوەستانە ڕزگارمان ببێ.

بەو مەبەستە دەچنە لای ئادەم و پێی دەڵێن: ئەتۆ ئادەمی باوكی سەرجەمی مرۆڤانی، خوا بە دەستەكانی خۆی بەدیهێناویو فوی كردۆتە روحت و فەرمانی بە فریشتان كردوە سوژدەت بۆ ببەن، دەبڕۆ لە لای خوا تكامان بۆ بكە تا بەڵكو لە ئەشكەنجەی ئەم ڕاوەستانە ڕزگارمان دەبێ. دەڵێ: من لەو شوێنپایەدا نیم كە ئێوە تێی دەگەن، ئەوجا یادی گوناحەكەی خۆی دەكاتەوە كە لەبەری دارەكەی خواردوە، بۆیە شەرمێ دەكات تكاخوازی لە خوا بكات، پاشان دەڵێ بەڵام بڕۆنە لای پێغەمبەر نوح كە یەكەمین پەیامبەری سەر ڕوی زەویە.

دەچنە لای نوح و داوای لێ دەكەن ئەویش دەڵێ: من لەو شوێنپایەدا نیم، ئەوجا یادی گوناحەكانی خۆی دەكاتەوە و شەرم دەیگرێ، دەڵێ: بەڵام بڕۆنە لای ئیبراهیم كە ئازیزی خوایە، دەچنە لای ئیبراهیم، ئەویش پێیان دەڵێ: من لەو شوێنپایەدا نیم، ئەوجا باسی گوناحەكانی خۆی دەكات و شەرمێ لە خوا دەكات ئەم تكاخوازیەی لێبكات، دەڵێ: بەڵام بڕۆنە لای موسا كە خوا قسەی لەگەڵدا كردوەو تەوراتی پێبەخشیوە. دەچنە لای موسا و ئەویش پێیان دەڵێ من لەو شوێنپایەدا نیم ئەوجا گوناحی خۆی یاد دەكاتەوەو شەرم لە خوا دەكات، دەڵێ بەڵام بڕۆنە لای عیسا كە ڕوح و وتەی خوایە، ئەویش دەڵێ: من لەو شوێنپایەدا نیم بەڵام بڕۆنە لای موحەممەد كە خوا لە گوناحی پێش و پاشی خۆش بوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەوجا دێنە لای من و منیش ئیزن دەخوازم بچمە لای پەروەردگارم، ئیزنم دەدەن، دەچمە حوزور خوا و كە دەیبینم یەكسەر دەچمە

سوژده تا خوا ویستی لێبێ لە سوژدەکەدا دەمێنمەوە، پاشان فەرمانم پێدەکرێ: موحەممەد! سەرهەڵبڕە، بڵێ گوێت بۆ گیراوە، چت دەوێ دەتدرێتێ، منیش سەرم بەرز دەکەمەوەو بەچەند ستایشێك کە خوا فێرم دەکات ستایشی خوا دەکەم پاشان دەست بە تکا دەکەم، هەندێکم بۆ دیاری دەکرێ لە دۆزەخیان دەردێنم و دەیانخەمە نێو بەهەشت. پاشان بەهەمان جۆر دەچمەوە سوژدەو هەمان شت دەڵێم و دەکەمەوە، ئەوجارەش هەندێکی ترم بۆ دیاری دەکرێو لە دۆزەخ دەریاندێنم و دەیانخەمە بەهەشتەوە.

ئەنەس دەڵێ نازانم لە جاری سێیەمدا یان لە جاری چوارەمدا پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: دەڵێم: پەروەردگارا! تەنها ئەوانە لە دۆزەخدا ماون کە قورئان بەندی کردون واتە ئەوانەی کە بە هەمیشەیی لەوێدا دەمێننەوە)). بوخاریو موسلیم گێراویانەتەوە.

بوخاری بە موعەللەقی ئەوەی تەخریج کردوەو دەڵێ: قەتادە لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((يحبس المؤمنون يوم القيامة ...)) فەرمودەیەکی هەمان جۆری یادکردوە، لە کۆتاییەکەشدا دەڵێ:

((ما بقي في النار إلاّ من حبسه القرآن -أي وجب عليه الخلود- ثم تلا هذه الآية: ﴿عَسَىٰ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾الإسراء:٧٩، قال: وهذا المقام المحمود الذي وُعِدَه نبيّكم ﷺ: کەس لە ئاگردا نەماوە تەنها ئەوانە نەبن کە قورئان بەندی کردون -واتە کە بەهەمیشەیی لە ئاگردا دەبن- پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ئینجا وتی: ئەوە شوێنپایەکەیە کە خوا بەڵێنی بە پێغەمبەرەکەتان داوە)).

لە بێژانەوەیەکیتردا ئەوەندەشی زیاترە: پێغەمبەر ﷺ وتی:

((يخرج من النار من قال: لا إله إلاّ الله وكان في قلبه من الخير ما يزن شعيرة ثم يخرج من النار من قال لا إله إلاّ الله وكان في قلبه من الخير ما يزن برة، ثم يخرج من النار من قال لا إله إلاّ

الله وكان في قلبه من الخير مـــا يـــزن ذرة: ئەو کەسەی لا إلـه إلاّ الله ی گوتبیّ و بە قەد دەنکە جۆیەك یان بە قەد سەنگی دەنکە گەنمێك یان بە قەد سەنگی دەنکە خوێیەکیش چاکەی لە دڵدا هەبێ لە ئاگری دۆزەخ دەردێت)).

یەزیدی کوڕی زەریع دەڵێ: شوعبەم دیت و فەرمودەکەم بۆ گێرایەوە، گوتی: قەتادەش هەمان فەرمودەی لە ئەنەسەوە کە ئەویش لە پێغەمبەرییەوە بۆ گێراینەوە، بەڵام شوعبە لەباتی (الـذَّرَّة)دا (ذُرَةٌ)ی گوت: یەزید دەڵێ: ئەبو بەسطام لە نوسینەوەدا هەڵەی کردوە چونکە لە کتابەکەی موسلیمدا لە بێژانەوەکەی یەزیدی کوڕی شوعبە ئاوەهایە، بوخاری دەڵێ: (ئەبون) هەمان شێوە فەرمودەی لە قەتادە گێراوەتەوە، لە وێدا دەڵێ: (من ایمان) لە جیاتی (من خیر)، لە بێژانەوەیەکی تردا ئەوەی پترە کە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەی تکاخوازیدا دەڵێ: ((فيأتوني فأستأذن على ربي في داره فيؤذن لي عليه)).

بوخاریش بەشێکی لێ گێڕاوەتەوە کە دەڵێ: لە حەمیدەوە ئەویش لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: گوێم لێبو پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو:

((إذا كان يوم القيامة شفعت، فقلت: أدخل الجنة من كان في قلبه خردلة، فيدخلون، ثم أقول: أدخل الجنة من كان في قلبه أدنى شيء، قال أنس: كأني أنظر إلى أصابع النبي ﷺ: لە ڕۆژی قیامەتدا کە تکاخوازی دەکەم دەڵێم: ئەوەی بەقەد سەنگی دەنکە خەردەلەیەك بڕوای لە دڵدایە با بچێتە بەهەشت، ئیتر هەمویان دەچن، پاشان دەڵێم ئەوەی بەقەد سەنگێکی لەویش کەمتری لە دڵدایە با بچێتە بەهەشت.. ئەنەس دەڵێ: ئێستاش لەبەر چاومە وەك بڵێی وا پەنجەکانی پێغەمبەرﷺ دەبینم کە ئەو فەرمودەیەی دەگێڕایەوە))[1].

---

[1] رواه البخاري: (١٣/٣٩٥-٣٩٧) في التوحيد باب كلام الرب تعالى يوم القيامة مع الأنبياء وغيرهم، وباب قول الله تعالى: (لما خلقت بيدي)، وبا قوله تعالى: (وكلم موسى تكليما) وفي تفسير سورة البقرة، باب قول الله تعالى: (وعلم آدم الأسماء كلها)، وفي الرقاق باب صفة الجنة والنار، ومسلم رقم ١٩٣ في الإيمان باب أدنى أهل الجنة منزلة فيها.

٢. **بوخاری و موسلیم و له ئەبوهورەیره ﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێ: ((لە بانگێشتی نان خواردنێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا بوین، حەزی چوە ڕانێك و هەڵیگرت، بە ددانەکانی پێشەوەی هەندێ گۆشتی لێ هەڵپچوڕکان و فەرموی:**

((أنا سيد الناس يوم القيامة، هل تدرون: مم ذاك؟ يجمع الله الأولين و الآخرين في صعيد واحد، فيبصرهم الناظر، ويسمعهم الداعي، وتدنوا منهم الشمس، فيبلغ الناس من الغم والكرب ما لايطيقونه ولا يحتملون، فيقول الناس: ألا ترون إلى ما أنتم فيه، إلى ما بلغكم، ألا تنظرون من يشفع لكم إلى ربكم؟ فيقول بعض الناس لبعض: أبوكم آدم.

فيأتونه. فيقولون: يا آدم، أنت أبو البشر، خلقك الله بيده، ونفخ فيك من روحه، وأمر الملائكة فسجدوا لك، وأسكنك الجنة، ألا تشفع لنا إلى ربك، ألا ترى ما نحن فيه وما بلغنا؟ فقال: إن ربي غضب اليوم غضباً لم يغضب قبله مثله، و لا يغضب بعده مثله، وإنه نهاني عن الشجرة فعصيت، نفسي، نفسي، نفسي، اذهبوا إلى غيري، اذهبوا إلى نوح.

فيأتون نوحاً، فيقولون: يا نوح، أنت أول الرسل إلى أهل الأرض، وقد سماك الله عبداً شكوراً، ألا ترى ما نحن فيه؟ ألا ترى إلى ما بلغنا؟ ألا تشفع لنا عند ربك؟ فيقول: إن ربي غضب اليوم غضباً لم يغضب قبله مثله، ولن يغضب بعده مثله، وإنه كان لي دعوة دعوت بها على قومي. نفسي، نفسي، نفسي، اذهبوا إلى غيري، اذهبوا إلى إبراهيم.

فيأتون إبراهيم فيقولون: أنت نبي الله وخليله من أهل الأرض، اشفع لنا إلى ربك، أما ترى إلى ما نحن فيه؟ فيقول لهم: إن ربي قد غضب اليوم غضباً لم يغضب قبله مثله ولن يغضب بعده مثله وإني كنت كذبت ثلاث كذبات...فذكرها–نفسي، نفسي، نفسي، اذهبوا إلى غيري، اذهبوا إلى موسى.

فيأتون موسى، فيقولون: أنت رسول الله فضلك برسالاته وبكلامه على الناس، اشفع لنا إلى ربك أما ترى إلى ما نحن فيه؟ فيقول: إن ربي قد غضب اليوم غضباً لم يغضب قبله مثله، ولن يغضب بعده مثله، وإني قد قتلت نفساً لم أؤمر بقتلها، نفسي، نفسي، نفسي، اذهبوا إلى غيري، اذهبوا إلى عيسى.

فيأتون عيسى، فيقولون: يا عيسى، أنت رسول الله وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه وكلمت الناس في المهد، اشفع لنا إلى ربك ألا ترى إلى ما نحن فيه؟ فيقول عيسى: إن ربي قد غضب اليوم غضباً لم يغضب قبله مثله ولن يغضب بعده مثله، ولم يذكر ذنباً، نفسي، نفسي، نفسي، اذهبوا إلى غيري، اذهبوا إلى محمد.

فيأتون محمداًﷺ وفي رواية: فيأتوني-فيقولون: يا محمد أنت رسول الله وخاتم الأنبياء، قد غفر الله لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر، اشفع لنا إلى ربك، ألاترى إلى ما نحن فيه؟

فأنطلق، فآتي تحت العرش، فأقع ساجداً لربي، ثم يفتح الله علي من محامده وحسن الثناء عليه شيئاً لم يفتحه على أحد قبلي، ثم يقال: يا محمد، ارفع رأسك يل تعطه واشفع تشفع. فأرفع رأسي فأقول: أمتي يا رب، أمتي يا رب، أمتي يا رب، فيقال: يا محمد أدخل من أمتك من لا حساب عليهم من الباب الأيمن من أبواب الجنة، وهم شركاء الناس فيما سوى ذلك من الأبواب، ثم قال: والذي نفسي بيده، إن ما بين المصراعين من مصاريع الجنة كما بين مكة وهجر -أو كما بين مكة وبصرى- وفي كتاب البخاري: كما بين مكة وحمير:

**لە ڕۆژی دواییدا من گەورەی خەڵکانم، دەزانن بۆ؟ چونکە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا سەرجەم خەڵکی لە خاکێکی ڕاست و بێ کەندو کۆسپ کۆ دەکاتەوە تەنانەت ئەگەر یەکێك بانگیان بکات هەموویان گوێیان لێدەبێ، چاوی هەموویان دەبینێ، ڕۆژ نزیك دەبێتەوەو خەڵك توشی خەم و تەنگانەیەکی هێند ناخۆش دەبن چیتر بەرگەیان نامێنێ و خۆیان پێ ڕاناگیرێ.**

**خەڵکانێك دەڵێن: تەماشا ناکەن چتان لێهاتوە؟ بۆ یەکێك نادۆزنەوە لە لای خواوە تکاخوازیتان بۆ بکات؟**

**هەندێك دەڵێن: ئادەم! دەبا بچینە لای وی، دەچنە لای و پێی دەڵێن: ئادەم! ئەتۆ باوکی مەردومانی، خوا بە دەستی خۆی بەدیهێناوی و لە ڕوحی خۆی فوی پێدا کردی و فەرمانی بە فریشتان کردوە سوژدەت بۆ ببەن و لە بەهەشتدا جێگیری کردی، تەماشاکە چمان لێهاتوە دە بڕۆ لە لای خوا تکامان بۆ بکە.**

ئەویش دەڵێ: ئەمڕۆکە خوا وەها توڕە بوە کە نە لە پێشتردا وا توڕە بوە نە لە پاشتردا وا توڕە دەبێ. خوا بەرهەڵستی لێ کردبوم لە بەری درەختەکە نەخۆم کەچی فەرمانەکەم شکاند.. ئای هاوار بۆ خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆنە لای یەکێکی‌تر، بڕۆنە لای نوح.

دەچنە لای نوح و دەڵێن: ئەی نوح ! تۆ یەکەمین پەیامبەری سەر ڕوی زەوی و خوا ناوی تۆی بە بەندەی سوپاسگوزار هەڵناوە، تەماشاکە چمان بەسەر هاتوە، دە لە لای خوا تکا خوازیمان بکە.

دەڵێ: ئەوڕۆکە خوا وەها توڕە بوە کە قەت نە لە پێشودا نە لە ئاییندەشدا وەها توڕە نابێ. من لە دنیادا نزایەکم هەبو بۆ گەلەکەم گیرابێ ئەویشم کردوە. هاوار بۆ خۆم، خۆم، خۆم.. بڕۆنە لای یەکێکی‌تر بڕۆنە لای ئیبراهیم.

دەچنە لای ئیبراهیم و پێی دەڵێن: ئەتۆ پێغەمبەرو ئازیزی خوای تکاخوازیمان بۆ بکە بزانە چمان لێهاتوە؟

دەڵێ: قەت خوا وەکو ئەمڕۆکە توڕە نەبوەو توڕە نابێ من لە ژیاندا سێ درۆم کردوە.. هەرسێکی ژمارد ئەوجا دەڵێ هەی هاوار بۆ خۆم، خۆم خۆم. بڕۆنە لای یەکێکی‌تر، بڕۆنە لای موسا.

دەچنە لای موساو پێی دەڵێن: ئەتۆ پێغەمبەری خوای و خوا بە پەیام و وتەی خۆی لەنێو خەڵکیدا هەڵیبژاردوی تکامان بۆ بکە، تەماشاکە چمان لێهاتوە.

دەڵێ: قەت نە لە پێشودا نە لەپاشتر خوا وەکو ئەمڕۆ نە توڕە بوە نە توڕەش دەبێ. من کەسێکم کوشتوە بێئەوەی فەرمانم پێ‌کرابێ. هەی هاوار بۆ خۆم، خۆم خۆم. بڕۆنە لای یەکێکی تر، بڕۆنە لای عیسا.

دەچنە لای عیساو پێی دەڵێن: عیسا ! ئەتۆ پێغەمبەری خوای و خوا بەیەك وتە بەدیهێناوی و ڕوحێکی لەوییەوە و بە ساوایی قسەت لەگەڵ خەڵکدا کردوە، تکامان بۆ بکە وانابینی چمان لێهاتوە.

دەڵێ: ئەورۆکە خوا وەها تورە بوە کە نە لەوەو پێش نە لەوەو پاشتر ئاوا تورە نەبوەو نابێ، باسی هیچ گوناحێك ناکات. دەڵێ: هاوار بۆ خۆم. خۆم. خۆم، برۆنە لای یەکێکی‌تر برۆنە لای موحەممەد.

ئینجا دەچنە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی دەڵێن: موحەممەد ! تۆ پەیامبەرو دواهەمین پێغەمبەری خوای، خوا لە گوناحی پێش و پاشت خۆش بوە، تکاخوازیمان بۆ بکە وا دەبینی لە ناو چ رەزاڵەتێك داین.

دەڵێ: منیش هەڵدەستم دەچمە بن بارەگای خواو سوژدەیەك دەبەم پاشان خوا ستایش و پەسەند پێدا هەڵگوتنێکی وام فێر دەکات و دەیڵێم کە هیچ کەسی تری فێر نەکردوە.

پاشان پێم دەگوترێ: ئەی موحەممەد سەر هەڵبرە، داواکە دەتدرێتێ و تکا بکە گیرا دەکرێ.

منیش سەرم بەرز دەکەمەوە و دەڵێم: پەروەردگار! نەتەوەکەم، پەروەردگار! نەتەوەکەم، پەروەردگار! نەتەوەکەم.

پێم دەگوترێ ئەوانەی لە نەتەوەکەتدا لێپرسینەوەیان لەسەر نیە لە دەرگای لای راستی بەهەشت بیانبە ژورەوە، ئەوان لە دەرگاکانی تریشدا هاوبەشی خەڵکن.

سوێند بەو خوایەی ژیانی منی بە دەستەوەیە نێوان هەردو دوری دەرگای بەهەشت وەکو نێوانی مەککەو هەجەرە یان وەکو نێوان مەککەو بوسرایە لە پەرتوکی بوخاریدا: وەکو نێوانی مەککەو حەمیر وایە)).

لە بێژانەوەیەکی‌تردا دەڵێ: ((سینیەك تێکوشە و گۆشتیان هێنایە بەردەست پێغەمبەرﷺ رانەگۆشتی تێدابو، پێغەمبەر ﷺ زۆر حەزی لە رانی مەرێ دەکرد، بە ددانی پیرۆزی پێشەوەی هەندێ گۆشتی لێ هەڵچورکان و فەرموی: من لە رۆژی قیامەتدا گەورەی خەڵکم، کە بینی یاوەران لێی ناپرسن فەرموی بۆ ناڵێن چۆن؟ ئەوانیش گوتیان چۆن؟ فەرموی کە سەرجەمی خەڵك بۆ خوا رادەوەستن... تا دوایی

**فەرمودەکە.**

**لە هی ئیبراهیمدا ئەوەی پترە: پێیان دەڵێ  من بە هەسارەم گوتوە ئەوە خوامە. وتومە بەڵکە گەورەکەیان بتەکانی شکاندوە، هەروەها وتومە: من نەخۆشم. پاشان پیغەمبەر ﷺ فەرموی: سوێند بە خوا کە گیانی منی بە دەستەوەیە نێوانی دو لاشیپان(مصاریع) لە لاشیپانی دەرگای بەهەشت وەکو نێوانی مەکەو هەجەر وایە یان هەجەرو مەکە وایە. نازانم پێغەمبەر ﷺ کامیانی فەرمو)). بوخاریو موسلیم و تیرمذی تەخریجیان کردوە بەلام لە پەڕتوکی موسلیمدا لە وتەکەی پێغەمبەردا دو جاران دەڵێ ((نفسي نفسي)).**

**ئەلحەمیدیش وەکو چۆنمان نەقل کردوە هەر ئاوەهای باس دەکات. لە بێژانەوەی تیرمذیدا لە هەمویاندا سێجاران دەڵێ: ((نفسي، نفسي، نفسي)).[1]**

**هەروەها موسلیم لە حوذەیفەی کوڕی یەمان و ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((يجمع الله تبارك وتعالى الناس. فيقوم المؤمنون حتى تُزلف لهم الجنة، فيأتون آدم، فيقولون: يا أبانا، استفتح لنا الجنة، فيقول: وهل أخرجكم من الجنة إلا خطيئة أبيكم؟ لست بصاحب ذلك، اذهبوا إلى ابني إبراهيم خليل الله.

قال: فيقول إبراهيم: لست بصاحب ذلك، إنما كنت خليلاً من وراء وراء، اعمدوا إلى موسى الذي كلمه تكليماً.

قال: فيأتون موسى، فيقول: لست بصاحب ذلك، اذهبوا إلى عيسى كلمة الله وروحه.

فيقول عيسى: لست بصاحب ذلك.

---

[1] رواه البخاري ٦/٢٦٤ و ٢٦٥ في الأنبياء، باب قول الله عزوجل: ((ولقد أرسلنا نوحاً إلى قومه))، وباب قول الله تعالى: ((واتخذ الله إبراهيم خليلا)) وفي تفسير سورة بني إسرائيل باب (ذرية من حملنا مع نوح إنه كان عبدا شكورا)، ومسلم رقم ١٩٤ في الإيمان، باب أدنى أهل الجنة منزلة فيها، والترمذي رقم ٢٤٣٦ في صفة القيامة، باب ما جاء في الشفاعة.

فيأتون محمداً ﷺ: فيقوم، فيؤذن له، وترسل الأمانة والرحم، فتقومان جنبتي الصراط يميناً وشمالاً، فيمر أولكم كالبرق.

قال: بأبي وأمي. أي شيء كالبرق، قال: ألم تروا إلى البرق كيف يمر ويرجع في طرفة عين؟ ثم كمرّ الطير. وشد الرجال، تجري بهم أعمالهم، ونبيكم قائم على الصراط، فيقول: رب سلم سلم، حتى تعجز أعمال العباد، حتى يجيء الرجل فلا يستطيع السير إلا زحفاً، قال: وفي حافتي الصراط كلاليب معلقة مأمورة، تأخذ من أمرت به، فمخدوش ناج، ومكدوس (وفي بعض النسخ ومكردس) في النار، والذي نفسُ أبي هريرة بيده، إن قعر جهنم لسبعين (وفي النسخ: لسبعون. وكلاهما صحيح، وانظر ما قاله النووي في شرح مسلم) خريفاً:

**لە ڕۆژی قیامەتدا خوا سەرجەم خەڵك كۆ دەكاتەوەو بڕواداران ڕادەوەستن تا بەهەشتیان لێ نزیك دەخرێتەوە. دەچنە لای ئادەم و دەڵێن: باوكە! داوا بكە دەرگای بەهەشتمان لێبكرێتەوە.**

**دەڵێ: ئەدی گوناحەكەی باوكتان نەبو لە بەهەشتێی وەدەرنان؟ من كەسی ئەو كارە نیم. بڕۆنە لای ئیبراهیمی كوڕم كە ئازیزی خوایە.**

**ئیبراهیم دەڵێ من كەسی ئەو كارە نیم ئەمجا من لە دوای كێ‌و كێ ئازیزم. بڕۆنە لای موسا كە خوا قسەی لە گەڵدا كردوە.**

**دەچنە لای و پێیان دەڵێ: من كەسی ئەو كارە نیم بڕۆنە لای عیسا كە وتە و ڕوحی خوایە. عیسا دەڵێ: من كەسی ئەو كارە نیم.**

**جا دێنە لای موحەمەد ﷺ ئەویش هەڵدەستێ و ئیزن دەدرێ تكاخوازی بكات، ڕاسپاردە و خزمایەتیش دەنێردرێن لە هەردو لای ڕاست و چەپی پردی دۆزەخ ڕادەوەستن.**

**یەكەمین كەستان وەكو بروسك تێدەپەڕێ. ئەبو هورەیرە، یان حوذەیفە لێی پرسی ئەی پێغەمبەری خوا دایك و باوكم بە قوربانت بێ چ شتێك وەكو بروسك ڕادەبورێ؟ فەرموی: نەتاندیوە بروسك چۆن لە چاو تروكانێكدا دێت و دەڕوات؟**

پاشان وەکو با پاشان وەکو باڵندە پاشان وەکو غاردانی پیاو ڕادەبورن، کردەوە دەیانڕوێنێ. پێغەمبەریشتان لە سەر پردەکە ڕاوەستاوەو دەڵێ: خوایە سەلامەتی بکە خوایە سەلامەتی بکە با بپەڕێتەوە، بەم جۆرە تا کردەوە دەسەوسان دەبێ چیتر ناتوانێ بیانپەڕێنێتەوە، وای لێدێ پیاو بە چنگەکرێ نەبێ ناتوانێ بڕوا، لە هەردو لای پردەکە قولاب و گازی هەڵواسراو هەیە ئەگەر فەرمانی پێ بکرێ کەسێك بگرێ دەیگرێ. جا هەیە دەڕوشێ‌و ڕزگاری دەبێ هەشە دەکەوێتە ناو ئاگر. سوێند بەو خوایەی گیانی ئەبو هورەیرەی لە دەستە قوڵایی دۆزەخ هێندەی حەفتا پایز دەبێ))[١].

٤. تیرمذی لە ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی

((أنا سيد ولد آدم يوم القيامة، ولا فخر، وبيدي لواء الحمد و لا فخر، وما من نبي يومئذ — آدم فمن سواه — إلاّ تحت لوائي، و أنا أول من تنشق عنه الأرض و لا فخر.

فقال: فيفزع الناس ثلاث فزعات، فيأتون آدم، فيقولون: أنت أبونا آدم، فاشفع لنا إلى ربك، فيقول: إني أذنبت ذنباً فأهبطت به إلى الأرض، ولكن ائتوا نوحاً، فيقول: إني دعوت على أهل الأرض دعوة فأُهلكوا، ولكن اذهبوا إلى إبراهيم، فيأتون إبراهيم، فيقول: إني كذبت ثلاث كذبات. ثم قال رسول الله ﷺ: ما منها كذبة إلا ماحل بها عن دين الله، ولكن ائتوا موسى، فيأتون موسى. فيقول: قد قتلت نفساً، ولكن ائتوا إلى عيسى، فيأتون عيسى، فيقول: إني عُبِدتُ من دون الله، ولكن ائتوا محمداً ﷺ، فيأتوني، فانطلق معهم.

قال ابن جدعان: قال: أنس: فكأني أنظر إلى رسول الله، قال: فآخذ بحلقة باب الجنة، فأقعقعها، فيقال: من هذا؟ فيقال: محمد، فيفتحون لي ويرحبون، فيقولون: مرحباً، فأخرّ ساجداً، فيلهمني الله من الثناء والحمد، فيقال لي: ارفع رأسك، سل تُعطَ، واشفع تُشَفع، وقل يسمع لقولك، وهو المقام المحمود الذي قال الله تعالى: ﴿عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾الإسراء:٧٩: من لە ڕۆژی قیامەتدا گەورەو سەروەری ئادەمیزادانم، بەبێ شانازی، بەیداخی

---

[١] ژمارە ١٩٥ لە الإيمان، باب أدنى أهل الجنة منزلة فيها.

ستایش لە دەستی منە بەبێ شانازی. هەمو پێغەمبەران لە ئادەمڕا تا ئەوانی‌تر سەرجەمیان لە ژێر بەیداخی منن. من یەکەمین کەسم کە گۆڕم بۆ یەکالا دەبێ، بەبێ شانازی.

خەڵك لەڕۆژی قیامەتدا سێجاران ترس و سام دەیانگرێ. دەچنە لای ئادەم و پێی دەڵێن: تۆ ئادەمی باوکمانی، لەلای خواوە تکامان بۆ بخوازە، دەڵێ: من بە هۆی گوناحەوە لە بەهەشتدا خرامە سەر زەوی. بڕۆنە لای نوح. دەڵێ: من دوعام لە خەڵکی زەوی کردوەو فەوتاون بۆیە بڕۆنە لای ئیبراهیم. ئەویش دەڵێ: من سێجاران درۆم کردوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هەر درۆیەکی کردبێ لە پێناو دینی خوا بوە. بەلاّم بڕۆنە لای موسا، ئەویش پێیان دەڵێ من یەکێکم کوشتوە بەلاّم بڕۆنە لای عیسا، دەڵێ: منیان پەرستوە. بەلاّم بڕۆنە لای موحەممەد ﷺ، دێنە لای من منیش لە گەڵیان دەچم.

ئیبنو جەدعان دەڵێ: ئەنەس گوتی: وەك بڵێی وا پێغەمبەر ببینم. دەڵێ: جا دەچم ئاڵقەریزی دەرگای بەهەشت دەگرم و لە دەرگە دەدەم، دەڵێن کێیە؟ دەڵێم: موحەممەدە. دەرگام بۆ دەکەنەوەو پێشوازیم لێدەکەن و دەڵێن یاخوە بە خێر بێی. یەکسەر سوژدەیەك بۆ خوا دەبەم خوا هەندێ ستایش و پێداهەڵگۆتنم بۆ ئیلهام دەکات و دەیڵێم. پاشان پێم دەڵێن: سەرت بەرز کەوە، داوا بکە دەتدرێتێ تکا بکە قبوڵ دەبێ و بڵێ لێت دەبیسترێ. ئەوە ئەو شوێنپایەیە کە خوا لە بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾)).

سوفیان دەڵێ: هیچ وتەیەك لە ئەنەسەوە نیە تەنها ئەوە نەبێ: ((فآخذ بحلقة باب الجنة، فأقعقعها)). تیرمذی تەخریجی کردوە.[1]

[1] ژمارە (٣١٤٧) لە تەفسیردا، باب ومن سورة بني إسرائيل، وقال الترمذي هذا حديث حسن وهو كما قال.

## جیباسی دووەم

# ئەو مەبەستەی فەرمودەکانی تکاخوازی گەورەی پێ گێڕدراوەتەوە

ئەگەر یەکێك سەرنج بداتە ئەو فەرمودانە دەبینی بڕوادارەکان پەنا دەبەنە بەر یەکە یەکەی پێغەمبەرەکان و دواهەمین جاریش موحەممەدی پێغەمبەرمانﷺ. بەڵام پێغەمبەرﷺ کە تکا دەخوازێ تەنها بۆ نەتەوەکەی خۆی دەیخوازێ.

راڤەکاری طەحاویە دوای ئەوەی هەندێ لەو فەرمودانەی هێناوەتەوە دەڵێ:

((زۆر جێی سەیرمانە پێشەواکان لە زۆربەی ڕێگاکانەوە کە ئەم فەرمودانەیان گێڕاوەتەوە باسی تکاخوازی یەکەم ناکەن کە خوا دێت و بڕیار دەدات و کار یەکلا دەکاتەوە، هەروەکو لە فەرمودەکەی کەڕەنادا هاتوە کەچی فەرمودەکان ئەوەیان مەبەستەو ڕەوتی سەرەتایان هەر بۆ ئەوەیە کە خەڵك لە ئادەمڕا پێدادێن و داوای تکاخوازییان لێدەکەن، مەبەستیانە لە تەنگانەو ناخۆشی ڕاوەستانەکەیان ڕزگار بن. هەروەکو لە هەمو فەرمودەکان وا دەڵێ کەچی کە دەگاتە ئەوێ تەنها باسی ئەو تکاخوازیە دەکات کە بۆ بڕوادارە گوناحبارەکان دێتە ئەنجام و لە دۆزەخ دەردەهێنرێن.

پێشینەکان کە هەر لە کورتیڕا فەرمودەکانیان براندۆتەوە تەنها مەبەستیان ئەوە بوە بەرپەچی خەواریج و موعتەزیلەکانی پێ بدەنەوە، کە نکۆڵیان دەکردو دەیانگوت گەر یەکێك بچێتە دۆزەخ دەرچونی بۆ نیە. بۆیە ئەوان تەنها ئەوەندەیان گێڕاوەتەوە کە وەڵامدانەوەیەکی ڕاشکاوی بۆ ئەوانە تێدایە کە هاوبیری ئەو بیدعەیەن و پێچەوانەی فەرمودەن))[1]. پاشان ناواخنی فەرمودەکەی کەڕەنای

[1] شرح الطحاوية: ل ٢٥٥.

هێناوەتەوە.

قسەی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبولعیززی حەنەفیش چەند شتێکی تێدایە:-

١) تەئکیدی لەسەر بونی ئەو ئیشکالە کردۆتەوە، هەروەها ئیبنو حەجەری عەسقەلانیش باسی ئەم ئیشکالەی کردوە، لە (دەراوردی) نەقل کردوە و دەڵێ: ((بێژەرەوەی ئەم فەرمودەیە وەك بڵێی شتێکی دیکەی نابنەڕەتی تێخستوە، چونکە لە سەرەتای تکاخوازیەکەدا بۆ ئەوە دەچێ باسی هەسانەوەو ڕزگاربونی ڕاوەستانی مەحشەر بکات کەچی باسی تکاخوازی لە دۆزەخ دەرهێنانێ دەکات، کە ئەم تکاخوازیە لە دوای تێپەڕین و گوزەرکردنی سەر پردی دۆزەخ دەبێت دوای ئەوەی کە خەڵکانێك بۆ ناو ئاگر بەردەبنەوە ئەوجا تکاخوازی دەرهاتنی دۆزەخ دادێت)) [١].
ئیبنو حەجەر دوای ئەوەی وتەکەی (الدراوردی) نەقل دەکات دەڵێ: ((وهو اشکال قويّ)) [٢]

٢) ڕاڤەکاری طەحاویە هەروەکو وتەکەیمان هێنایەوە وەڵامی داوەتەوە کە ئەوانەی فەرمودەکانیان گێڕاوەتەوە کورتیان کردۆتەوە، هۆیەکەشی ئەوە بوە تا بەرپەچی خەواریجەکانیان پێ بدەنەوە کە نکوڵیان لەوە دەکرد ئەگەر یەکێك بچێتە دۆزەخ پاشان بێتە دەرەوە، پێیان وابو هەر یەکێك بچێتە دۆزەخ ئیتر دەرهاتنی بۆ نیە. ڕاڤەکان بۆ بەڵگەکاری بۆچونەکەی فەرمودەکەی کەڕەنای هێناوەتەوە کە بەڕاشکاوی تێیدا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ یەکەمجار تکا دەکات تا خەڵك دادگایی بکرێن، پاشان تکایەکیتر دەکات تا بەهەشتیەکان بچنە بەهەشت. خۆ ئەگەر فەرمودەکەی کەڕەنا صەحیح بوایە ئەوا ئیشکالەکە چارە دەبو، بەڵام هەروەکو شێخ (ناصرالدين الالباني) لە تەحقیقکردنی فەرمودەکانی (طحاوية)دا ڕونی کردۆتەوە

---

[١] فتح الباري: (١١/٤٣٧).
[٢] فتح الباري: (١١/٤٣٨).

زەعیفە.

رەنگە ئەوەی قازی عیاض بۆی چوەو نەوەویو ئیبنوحەجەرو زانای تریش وەکو ویـان گوتـوە لـە نیشـانە نـزیکتر بـیّو وردەکـاری زیـاتری لـە وتەکـەی راڤـەکاری (طحاویە) تێدا بیّ. ئیبنو حەجەر دەڵیّ: ((عیـاض و نـەوەوییو زانـای تریـش ئـەم ئیشکالەیان شیکردۆتەوە، عیاض دەڵیّ لە فەرمودەکەی حوذەیفەدا کە هاوبەندی فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەیە لە دوای وتەی ((فيأتون محمداً فيقوم)) دەڵیّ ((فيؤذن لـــه)) واتە ئیزنی دەدریّتیّ تکاخوازی بکات. ئەوجا ((وترسل الأمانة والرحم فيقومـــان جنـــبي الصـــراط يمينـــاً وشمـــالاً فيمـــرّ أوّلكـــم كالـــبرق)) عیاض دەڵـیّ: بـەم جـۆرە وتـەکان تێکهەڵدەکێشـرێن، چونکـە ئـەو تکاخوازیـەی خـەڵك مەبەسـتیەتی هەسـانەوەیە لـە ناخۆشی ڕاوەستاندا، پاشان تکاخوازی لە دۆزەخ دەرهێنان دادێت.

لە فەرمودەیـەکی ئـەبوهورەیرەدا هـاتوە فـەرمانکردن بـە نەتـەوەکان کـە هـەر یەکـەیان وەدوای پەرسـتراوەکەی خـۆی بکـەوێت، پاشـان جودابونـەوەی بـڕوادارو دوڕوەکان و پاشان دانانی پردو بەسەردا تێپەڕین و داهاتنی تکاخوازی، سـەرەتای ئەو روداوانە کە فەرمانکردنە بەنەتەوەکان هەریەکەیان وەدوای پەرستراوی خۆیـان بکـەون، ئـەوە سـەرەتای بریـاردانی دادگـاییکردن و دەربازبونـە لـە پـەرژەنگی ڕاوەسـتاندا، دەڵـیّ: بـەم شـێوەیە مـەتنی فـەرمودەکان لەگـەڵ یـەکدا کۆدەبنـەوەو ماناکانیان دەسازیّ)).[1]

ئیبنـو حەجـەر رونکردنـەوەی زیـاتری لـەم بـارەوە وتـوەو ئـەو فەرمودانـەی هێناوەتـەوە کە بەڵگەن بۆ ئەوەی هـەندیّ فـەرمودە کـەمێك کورتبڕی تێدایـە، دەڵـیّ: ((دەڵێم: وا پێدەچیّ هەندێك بێژەرەوە هەندێك شتیان ئەزبەر کردبیّ بەڵام ئەوانیتر لەبەریان نـەکرد بیّ، پاشماوەکەی لـە فـەرمودەی دەروازەکـەی تردا دێـت کـە تێیـدا دەڵیّ:

---

[1] فتح الباري: (١١/٤٣٨).

((حتى يجيء الرجل فلا يستطيع السير إلا زحفاً في جانبي الصراط كلاليب مأمورة يأخذ من أمرت به. فمخدوش ناج ومكدوس في النار))

**لەوەدا دەر دەکەوێت یەکەمین تکاخوازی پێغەمبەر ﷺ بۆ دادگاییکردن و بڕیاردانی نێوان بەندەکانە، پاشان ئەو تکاخوازیە دێت کە بۆ ئەوانەیە لە پردی دۆزەخ دەکەونە ناو ئاگر.**

**لە فەرمودەکەی ئیبنو عومەردا بەراشکاویەوە هاتوە کە ئەنەس و ئەبو هورەیرە بەدرێژتریان گێڕاوەتەوە. لە پەرتوکی زەکاتدا ئەو فەرمودەیە باسکراوە کە حەمزەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئەویش لە باوکیەوە بەم واژەیە دەیگێڕێتەوە:**

((ان الشمس تدنو حتى يبلغ العرق نصف الأذن، فبينما هم كذلك استغاثوا بآدم ثم بموسى ثم بمحمد فيشفع ليقضي بين الخلق، فيمشي حتى يأخذ بحلقة الباب، فيومئذ يبعثه الله مقاماً محموداً يحمده أهل الجمع كلهم)).

**هەروەها لە فەرمودەکەی ئوبەی کوڕی کەعب لە لای ئەبو یەعلادا هاتوە:**

((ثم أمتدحه بمدحة يرضى بها عني، ثم يؤذن لي في الكلام، ثم تمر أمتي على الصراط وهو منصوب بين ظهراني جهنم فيمرون)).

**لە فەرمودەکەی ئیبنو عەبباسدا لە ڕیوایەتی عەبدوڵڵای کوڕی حاریثدا لە لای ئەحمەددا هاتوە:**

((فيقول ﷻ: يا محمد ما تريد أن أصنع في أمتك؟ فأقول: يا رب عجل حسابهم))

**لە ڕیوایەتێکیتری ئیبنو عەبباسدا لە لای ئەحمەد و ئەبو یەعلادا هاتوە:**

((فأقول أنا لها، حتى يأذن الله لمن يشاء ويرضى فإذا أراد الله أن يفرغ من خلقه نادى مناد أين محمد وأمته)).

(الطيبي) **بە شێوەیەکیتر وەڵامی ئیشکالەکەی داوەتەوەو دەڵێ: دەگونجێ مەبەست لە ئاگردا بەند کردن و پەرژەنگ و ناخۆشیەکانی خەڵکانی مەحشەر بێ کە**

ڕۆژ لە سەریانەوە نزیك دەبێتەوەو لەبەر تاو و ئازاری گەرما دەکەونە نێو ناخۆشی تەنانەت لە ناو ئارەقەدا لغاو دەبن. دەگونجێ ڕزگاربونیش لەو ئاگرەدا مەبەستی دەرباز بونیان بێ لەو ڕەوشە تەنگ و ناخۆشەی تێیدان)).

ئیبنو حەجەر دەڵێ: لێکدانەوەیەکی زۆر دورە، تەنها مەگەر لەو کاتەی وابێ ئەگەر بڵێین دو دەرچون هەیە: دەرچونێکیان فەرمودەی ئەم دەروازەیە لەگەڵ جیاوازی هەمو ڕێگەکانی کە دەرچونە لە تەنگانەو ناخۆشی ڕاوەستان. دەرچونێکیشیان کە فەرمودەی دەروازەکەیتر دایە و تێیدا هاتوە: ((فيقول من كان يعبد شيئاً فليتبعه))، کە لە دوای دەرباز بونی ڕاوەستانی مەحشەرو دامەزراندنی پردی دۆزەخ و تێپەڕبون و کەوتنە خوارەوەی هەندێ خەڵك ئەو دەرچونە دێتە ئارا ئەویش بۆ ئەوانەی بۆ ناو دۆزەخ بەربونەتەوە)).

قورتوبی ئەصلی ئیشکالەکەی وەڵامداوەتەوە کە لە فەرمودەکەی ئەبوزەر کە ئەویش لە ئەبو هورەیرەی گێڕاوەتەوە، پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((أمتي أمتي)) ((فيقال أدخل من أمتك من الباب الأيمن من أبواب الجنة من لا حساب عليه ولا عذاب)).

دەڵێ لەوەدا ئاماژە و بەڵگە هەیە کە پێغەمبەر ﷺ تکا بۆ خێرا بونی لێپرسینەوە دەکات، چونکە ئیزنی دەدرێتێ ئەوانە بخاتە بەهەشت کە لێپرسینەوەیان لە گەڵدا ناکرێ، کەواتە بەڵگەن بۆ دواکەوتنی لێپرسینەوەی ئەوانەی لە گەڵیاندا دەکرێ. لە فەرمودە درێژەکەی کەڕەناشدا کە ئەبو یەعلا دەگێڕێتەوە ئەوە هاتوە:

((فأقول وعدتني الشفاعة فشفعني في أهل الجنة يدخلون الجنة. فيقول الله: وقد شفعتك فيهم وآذنت لهم في دخول الجنة)).

دەڵێم: ئاماژەی تێدایە کە ڕانواندن و تەرازو و هەڵدانی کارنامەکان لەو کاتەدا ڕودەدەن. پاشان بانگهێژێك بانگ دەکات: با هەر نەتەوەیەك وەدوای پەرستراوەکەی خۆی بکەوێت، ئینجا بێبڕواکان بەردەبنەوە ناو ئاگر و پاشان بڕوادارو دوڕوەکان بە

هۆی ئەم ئەزمونەوە لەیەکتر هاوێر دەکرێن کە فەرمانیان پێ دەکرێ سوژدە ببەن لەو کاتەی خوا پێی خۆی وەدەر دەخات، پاشان فەرمان دەکرێ پردی دۆزەخ دابنرێو بە سەریدا رابورن، ئەوکاتە روناکی دوڕوەکان دەکوژێتەوەو ئەوانیش دەکەونە ناو ئاگر، بڕوادارانیش بەسەریدا دەپەڕنەوەو دەچنە بەهەشتێ، گوناحباریش هەیە بەر دەبێتەوە هەشیانە دوای پەڕینەوەکەی لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا بۆ تۆڵە رادەگیرێن و پاشان دەچنە بەهەشت)).[1]

دەڵێم: خۆ ئەگەر ئەوە صەحیح بوایە ئەوا ئیشکالەکە نەدەما بەڵام (الکلبي) زەعیفە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سەنەدەکەی نەگوتوە، پاشان لەگەڵ فەرمودە صەحیحەکاندا پێچەوانەیە چونکە بڕوادارەکان لە راوەستاندا بەر لەوەی بچنە بەهەشت داوا لە پێغەمبەران دەکەن تکا خوازییان بۆ بکەن. خواش زاناترە.

[1] فتح الباري: (١١/٤٣٨).

## جێباسی سێیەم

# تکاخوازی قبوڵکراو و تکاخوازی ڕەتکراوەو جۆرەکانی تکاخوازی قبوڵکراو

ئەو فەرمودانەی هێنامانەوە ئاماژەی دو جۆرە تکاخوازیمان بۆ دەکەن:

یەکەم: تکاخوازی هەرە مەزن(الشفاعة العظمى)، کە شوێنپایەی ستایشکراوە، لەم تکاخوازیەدا سەرپاکی خەڵکان ڕو لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن تا لەلای خواوە تکاخوازییان بۆ بکات تا بەڵکو لە مەینەتی و کارەساتە ناخۆشەکانی ڕاوەستانی مەحشەر ڕزگاریان ببێ.

دوەم: تکاخوازی بۆ بڕوادارانی گوناحبار کە چونەتە ناو دۆزەخ، لە جێباسی ((چونە بەهەشت)) لە پەرتوکی (بەهەشت و دۆزەخ)دا خوا یار بێ باسی ئەم تکاخوازیە دەکەین.

چەند جۆرێکی‌تریش هەن کە لە فەرمودەکاندا هاتون، لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەین:

یەکەم و دوەم: تکاکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو کەسانەی کە چاکەو خراپەیان یەکسانە، تا بچنە بەهەشت. بۆ ئەوانەش کە فەرمانکراوە ببرێنە دۆزەخ تاکو نەچن.

سێیەم: تکاکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەرزکردنەوەی پلەی بەهەشتیەکان.

چوارەم: تکاکردن بۆ ئەو خەڵکانەی بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت، دەتوانین فەرمودەکەی عوکاشەی کوڕی موحصن بکەینە بەڵگە کە پێغەمبەر ﷺ نزای بۆ کرد لە ڕیزی ئەو حەفتا هەزارە بێ کە بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت. فەرمودەکەش لە هەردو صەحیحاندا هەیە.

پێنجەم: تکاکردنی پێغەمبەر ﷺ تا سزاو ئەشکەنجەی ئەبو تالیبی مامی سوکتر بێ، بۆیە لە قوڵایی دۆزەخ دەردەهێنرێ‌و دەبردرێتە ناو تەنکە ئاگرێك و لە پێی دەئاڵێ: مێشکی لەگەڵ دەکوڵێ.

شەشەم: تکا کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ چونە بەهەشتی بەهەشتیەکان، لە پەرتوکی (بەهەشت)دا خوا یاربێ باسی ئەو جۆرە تکاخوازیە دەکەین.[1]

تکاکردن بۆ گوناحباران تەنها تایبەت نیە بە پێغەمبەر ﷺ ڕەنگە پێغەمبەران و شەهیدان و زانایانیش تکا بکەن، ڕەنگە کردەوە ببێتە تکاخوان، بەلام پێغەمبەرمانﷺ پشکێکی فرەی لەم بارەوە هەیە، ڕەنگە هی دیکەش تکا بخوازن بۆ بەرزبونەوەی پلەی بەهەشتیان. بەلام جۆرەکانی تر تایبەتی پێغەمبەرن ﷺ.

ئەوەبو سەرجەمی ئەو تکاخوازیانەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێنە ئارا. بەلام ئەو تکاخوازیەی لەو رۆژەدا ڕەتکراوەو قبوڵ نەکراوە، ئەو تکاخوازیەیە کە خەڵك لەدنیادا پیادەی دەکەن کە تکالێکراودکە ڕەنگە بە تکاخوازیەکە ناڕازی بێ، ڕەنگە ڕکیشی لێبێتەوە بەلام چاری ناچار لەبەر پلەوپایەو هێزو زەبرو زەنگی تکاخوازەکە قبوڵی دەکات. هاوبەشپەرست و فەلەکان تەمای ئەو جۆرە تکاخوازیە دەکەن لە پەرستراوەکانیان، بیدعەچیەکان وا لە شێخەکانیان ڕادەپەرمون. بەلام خوا ئەوانەی بەدرۆ خستۆتەوە، کەس بۆی نیە تکاخوازی بکات مەگەر بە مۆڵەتی خوا، ئەگەر خوا لە تکاخوازو تکالێکراو رازی بێ ئەوجا ڕێگە دەدا تکا بکرێ. خوا دەفەرموێ:

﴿مَـنْ ذَا الَّـذِي يَشْـفَعُ عِنْـدَهُ إِلاَ بِإِذْنِـهِ: کەس هەیە بێ مۆڵەتی خوا تکا بخوازێ؟!﴾البقرة:٢٥٥

﴿وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَ لِـمَنْ ارْتَضَـى: تەنها بۆ ئەوانە تکا دەکرێ کە خوا لێیان ڕازیە﴾ الأنبياء: ٢٨.

---

[1] بۆ ئەم بابەتە سەرنجدە شرح الطحاوية: ٢٥٣.

بۆیه باوكی ئیبراهیم كه به بێبڕوایی مردوه تكای ئیبراهیمی كوڕی بۆ قبول ناكرێ. ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((یلقي إبراهیم أباه آزر في یوم القیامة، وعلی وجه آزر قترة وغبرة، فیقول له إبراهیم: ألم أقل لك: لا تعصني؟ فیقول له أبوه: فالیوم لا أعصیك، فیقول إبراهیم: یا رب، إنك وعدتني أن لا تخزني یوم یبعثون، فأي خزي أخزي من أبي الأبعد؟ فیقول الله تعالی: إني حرمت الجنة علی الكافرین. ثم یقال لإبراهیم: ما تحت قدمیك؟ فینظر فإذا هو بذبخ متلطخ، فیؤخذ بقوائمه، فیلقی في النار: ئیبراهیم لە ڕۆژی قیامەتدا ئازەری باوكی دەبینێ مات و كزو پەرێشانە، ئیبراهیم پێی دەڵێ: ئەدی پێم نەگوتی سەرپێچم مەكە؟ باوكی دەڵێ: ئەوڕۆكە سەرپێچیت ناكەم. ئیبراهیم دەڵێ: پەروەردگار! تۆ بەڵێنت پێداوم لە زندوبونەوەدا زەبونم نەكەی، زۆر شەرمەزارم بۆ باوكم، خوا دەفەرموێ: بەڵام من بەهەشتم لە بێبڕواكان یاساغ كردوە، پاشان بە ئیبراهیم دەڵێن: ئەوە چیە لەبەر پێت؟ ئەویش تەماشا دەكات كوشتیەكی خوێن پڕژاوە، پاشان پەل وپۆی دەگرن و توڕی دەدەنە ناو ئاگر)).[1]

---

[1] مشكاة المصابیح: ٣/٥٨.

بەندی دەیەم

# لێپرسینەوەو سزاو پاداشت

## ڕێخۆشەکی

### مەبەست لە لێپرسینەوەو پاداشت و سزا

مەبەست لە لێپرسینەوەو پاداشت و سزا ئەوەیە کە خوا بەندەکانی لەبەر دەستی خۆی ڕادەگرێ و وتەو کردەوەکانی کردویانە پێیان دەناسێنتەوەو هەر بڕواو نابڕواییەك و هەر لاریو ڕاستیەك و هەر سەر پێچیو بەرفەرمانیەکی پەیڕەویان کردبێ هەر هەمویان پێ دەڵێتەوە ئینجا سزاو پاداشتی شایستەیان بە باڵادا دەبڕێ، ئەگەر بڕواداری چاکەکار بن بە دەستی ڕاست کارنامەکەیان وەردەگرن، ئەگەر خراپەکاریش بن ئەوا بە دەستی چەپ وەریدەگرن.

لێپرسینەوە ئەو قسانە دەگرێتەوە کە خوا بە بەندەکانی دەڵێ یان ئەوان لە گەڵیدا دەکەن، هەروەها بیانو هێنانەوەو بەڵگەخوازیو گەواهیدان و کێشانی کردەوەکانیش دەگرێتەوە.

لێپرسینەوە هەیە سانایە، هەیە قورسە، هەیە ڕێز لێنانە هەیە سەرکۆنەو گازاندەیە، هەیە چاوپۆشیو چاکە لەگەڵدا کردنە.. هەمو ئەوانە خوای هەرە بەڕێزو چاکەبەخش ئەنجامی دەدات.

## جێباسی یەکەم

### دیمەنی لێپرسینەوە

خوای پەروەردگار باسی دیمەنی سزاو پاداشتی ڕۆژی لێپرسینەوەی کردوەو دەفەرموێ:

﴿وَأَشْرَقَتْ الأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْحَقِّ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ: زەوی بە نوری پەروەردگارەوە روناك بو. كارنامەكان هاتنە گۆڕێو درانەوە. پێغەمبەران و گەواهیدەرانیشیان هێنا تا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بكرێ و نێوانیان بە هەق یەكلا بكرێتەوە، هیچ كەس ستەمی لێناكرێ﴾الزمر:٦٩.

چەند بە سامە! ئەو خوا بەرزو بەشكۆیەی ئەرزو ئاسمانەكانی ڕاگرتوە ئەو خوایە دانێریو لێپرسینەوەكە دەكات، كە خوا دێت سەرتاپای زەوی روناك دەبێتەوە.

﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَ أَنْ يَأْتِيَهُمْ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنْ الْغَمَامِ وَالْمَلاَئِكَةُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ: دیارە چاوەڕێی ئەو ڕۆژە دەكەن كە خوا لە ناو چەندین هەوری سپی و فریشتەكان دێن كە ئەو كات كار لە كار تەواو بوەو سەرجەم فەرمانەكان بەس بەدەست خوایە﴾ البقرة: ٢١٠.

لەو ڕۆژیدا خوا بە خۆی دێت. چۆنیەتی هاتنەكەی نازانین بەڵام بڕوامان پێی هەیەو ڕاستە. واتاوێڵ(تأويل)ی ناكەین و پیتی لێناگۆڕین و بە درۆی نازانین. هەروەها ئایەتەكە دەفەرموێ فریشتەش دێن... بەڕاستی دیمەنێكی سامناكە ئەو هەمو فریشتەیە ئامادە دەبن و كارنامەی بەندەكانیان لەلادایە كە هەرچی وتەو كردارەو كردویانە تێیدایە تەنانەت تۆزقاڵێكیشیان هەڵنەبواردوە!

﴿ووضع الكتاب فترى المجرمين مشفقين مما فيه ويقولون ياويلتنا مال هذا الكتاب لا يغادر صغيرة ولا كبيرة إلا أحصاها ووجدوا ما عملوا حاضرا ولا يظلم ربك أحدا: **کارنامەکان دەدرێنەوە، تاوانکارەکان سام دەیانگرێو لە تاوانە نوسراوەکانیان دەترسن. دەڵێن: هەی تۆناو تون بین! ئەو کارنامەیە چییە؟ خۆ هیچ تاوان و گوناحێکی گەورەو بچوك نەماوە هەڵینەژماردبێ؟! ئەوجا هەمو کردەوەکانیان بە ئامادەیی دەبیننەوە. خوای پەروەردگار ستەم لە هیچ کەسێك ناکات و سزای نادات گەر تاوانی نەکردبێ پاداشتیشی لێکەم ناکاتەوە﴾** الكهف:٤٧.

**پێغەمبەرەکانیش دێننە گۆڕی لێپرسینەوەو دانێرکاری، لە بارەی ڕاگەیاندنی پەیامەکانی خواوە پرسیاریان لێدەکرێو گەواهیشیان لە بارەی گەلەکەیانەوە پێدەدرێ کە چیان لێزانیون.**

**سەرجەم گەواهیدەران لەو ڕۆژە مەزنەدا دەهێنن و گەواهی دەدەن: ئەو فریشتانەی کردەوەکانیان نوسیوە، پێغەمبەران، زانایان، زەویو ئاسمان. شەو و ڕۆژەکانیش لەم ڕۆژەدا گەواهیدەرن. بەندەکان دێنن و پۆل پۆل بۆ ئەو دادگایە ڕایاندەگرن کە خوا بۆ لێپرسینەوە سازی داوە:**

﴿وعرضوا على ربك صفا: **بەڕیز بۆ خوا رادەنوێنرێن** ﴾ الكهف: ٤٨.

**ئەو تاوانکارو ستەمکارانەش کە لە خوا یاخی بونەو کەش و فشیان لەسەر زەویدا کردوە: کۆت و زنجیر دەکرێن و جلی قەترانیان لەبەردا دەکرێ:**

﴿وترى المجرمين يومئذ مقرنين في الأصفاد، سرابيلهم من قطران وتغشى وجوههم النار، ليجزي الله كل نفس ما كسبت إن الله سريع الحساب: **لەو ڕۆژەدا تاوانکارەکان لە زنجیر کۆت کراون. جل و پۆشاکیان لە قەترانی ڕەش و برشە، ئاگر دەموچاویانی داپۆشیوە، ئەم ڕۆژە بۆ ئەوەیە هەمو کەسێك سزاو پاداشتی کردەوەکانی وەرگرێتەوە﴾** إبراهيم: ٤٩-٥١.

**خەڵك کە ئەو دیمەنە سەخت و پڕ پەرژەنگەی لێپرسینەوە دەبینن لە ترسان چۆکیان دەشکێو بە چۆکدا دەکەون:**

﴿وَتَرَى كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَى إِلَى كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُـونَ: لەو ڕۆژەدا دەبینی هەمو کەسێك ئەژنۆی شکاوەو بە چۆکدا کەوتوە، هەمو کەسێك بانگ دەکرێ تا کارنامەکەی وەرگرێتەوە، بەڵێ ئەمڕۆ سزاو پاداشتی کردەوەکانتان وەردەگرنەوە﴾ الجاثية: ٢٧.

بە ڕاستی دیمەنێکی بە ترس و سامناکە، خوایە بە میهرو بەزەیی خۆت ڕزگارمان بکە.

## جێباسی دووەم

### ئایا بێبڕواكان لێپرسینەوەیان لە گەڵدا دەكرێ؟ بۆچی؟

**زانایان راو بۆچونیان لە بارەی بێبڕواكانەوە جیاوازە كە ئایا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەكرێ یان هەر بەبێ لێپرسینەوە فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخ؟ چونكە كردەوەكانیان پوكاوەیەو وەك تۆزی بەر ڕەشەبایە، بۆیە لێپرسینەوە سودی نیە! جا ئەگەر پرسیاریان لێبكرێ سودی ئەو لێپرسینەوەیە چیە؟**

**ئیبنو تەیمیەی شێخلئیسلام دەڵێ:** ((**زانا پاشینەكان وەكو یارانی ئەحمەد و زانای تریش مشتومڕیان لەم بارەوە كردوە، ئەبوبەكر عبدالعزیز، ئەبولحەسەنی تەمیمی، قاضی ئەبو یەعلا و زانای تریش پێیان وایە لێپرسینەوەیان لە گەڵدا ناكرێ، بەڵام ئەبو حەفصی بەرمەكی كە هاومەزەبی ئەحمەدە، ئەبو سلێمانی دیمەشقی، ئەبو طالب پێیان وایە لێپرسینەوەیان لە گەڵدا دەكرێ**)).[1]

**بەڵام راستیەكەی ئەوەیە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەكرێو كردەوەكانیشان دەكێشرێ، زۆر ئایەت لەم بارەیەوە هەن وەكو خوا دەفەرموێ:**

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ: **خوا بانگی هاوبەشپەرستان دەكات و دەپرسێ: كوا ئەو هاوبەشانەی پێتان وابو شەریكی منن؟**﴾القصص: ٦٢.

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ: **خوا بانگی هاوبەشپەرستان دەكات و لێیان دەپرسێ: چ وەڵامێكتان دا پەیامبەران**﴾ القصص: ٦٥.

---

[1] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٤/٣٠٥) .

﴿فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ، فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ، وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ، فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ، نَارٌ حَامِيَةٌ: **ئينجا ئەو كەسەی سەنگەكانی قورس بێ، ئەوا لە گوزەرانێكی خۆش و پەسندردا دەبێت. بەلاّم ئەو كەسەی سەنگەكانی سوك بێ؛ جێی هاویەیە، تۆ چوزانیت هاویە چیە؟! ئاگرێكی هەلْگیرساوەیە**﴾القارعة:٦-١١.

﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ، تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ، أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ: **ئەو كەسەی كێشی كردەوەكانی سوك بێ خۆیان دەدۆڕێنن و بە یەكجارەكی و هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێننەوە. ئاگر هوروژم دەباتە سەر دەموچاویان و پێستەكەیان هەلْدەقرچێنێ. خوا پێیان دەلْێ: ئەدی ئایەتەكانی منتان بۆ نەدەخوێندرایەوەو ئێوەش بڕواتان پێ نەدەكرد؟**﴾المؤمنون: ١٠٣.

**لەبەر چەند شتێك لێپرسینەوەیان لە گەلْدا دەكرێ‌و كردەوەكانیان دەكێشرێ ئەگەرچی كردەوەكانیشیان ڕوكاوەتەوە:**

**یەكەم. تاكو بیانویان ببڕێ و دادی خوا بێتە دی، كەس نیە هێندەی خوا تەوازۆ(عذر)ی خۆش بوێ، خوا خاوەنی دادی رەهایە(مطلق)، بۆیە لێپرسینەوەیان لەگەلْدا دەكات و كارنامەیان پێ‌نیشان دەداتەوە، تەرازۆش گەورەیی‌و ناقولاّیی تاوانەكانیان نیشان دەدات:**

﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلاَ تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ: **لەو ڕۆژەدا تەرازوە تەرخانكراوەكانی دادگەری دادەمەزرێنن هیچ كەسێك ستەمی لێ‌ناكرێ تەنانەت ئەگەر بەقەد سەنگی دەنكە خەردەلێكیش كردەوەی هەبێ دەیكێشین، ئەوەندە بەسە كە خۆمان لێپرسینەوەكە دەكەین**﴾ الأنبياء: ٤٧.

﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَاوَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لاَ يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلاَ كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلاَ يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا: **كارنامەكان دەدرێنەوە، تاوانكارەكان سام دەیانگرێ‌و لە تاوانە**

**نوسراوەکانیان دەترسن. دەڵێن: هەی تووناو توون بین! ئەو کارنامەیە چیە؟ خۆ هیچ تاوان و گوناحێکی گەورەو بچوك نەماوە هەڵی نەژماردبێ؟! ئەوجا هەموو کردەوەکانیان بە ئامادەیی دەبیننەوە. خوای پەروەردگار ستەم لە هیچ کەسێك ناکات و سزای نادات گەر تاوانی نەکردبێ پاداشتیشی لێکەم ناکاتەوە﴾** الكهف:٤٧.

**قورتوبی دەڵێ: ((خوای بێ هاوبەش بۆیە لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵك دەکات تا بیانویان نەمێنێو حیکمەتەکەی بێتە ئارا)).[1]**

**دووەم: خوا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات تاکو سەرکۆنە و سەرزەنشتیان بکات. شێخلئیسلام دەڵێ: ((مەبەست لە لێپرسینەوە رانواندن(عرض)ی کردەوەی بێبڕواکان و سەرکۆنەکردنیانە، مەبەست لە لێپرسینەوە لە تەرازودان و بەراوردکردنی چاکەو خراپەکانە، جا ئەگەر مەبەست لە لێپرسینەوە واتاکەی یەکەم بێ ئەوا گومانی تێدانیە لێپرسینەوەکەیان بەو ئیعتبارەیە. ئەگەر مەبەستیش واتای دووەم بێ وا دەگەیەنێ کە بێبڕواکان چاکەی وایان بۆ دەمێنێ شایەنی پێچوونە بەهەشت بن کە ئەوەش هەڵەیەکی ئاشکرایە)).[2]**

**سەرکۆنەکردن و گازاندەو سەرزەنشتەکان بە ئاشکرا لەم ئایەتانە دەردەکەون:**

﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ وُقِفُوا عَلَى رَبِّهِمْ قَالَ أَلَيْسَ هَذَا بِالْحَقِّ قَالُوا بَلَى وَرَبِّنَا قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ: **وای ئەگەر دەیانبینی کە لەبەر دەستی پەروەردگاریان رادەوستن و پێیان دەڵێ: ئەدی ئەوە نیە راستە؟ دەڵێن بەڵێ سوێند بەخوا راستە، کەواتە سزای بێبڕواییتان بچێژن﴾** الأنعام: ٣٠.

﴿يَامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا شَهِدْنَا عَلَى أَنفُسِنَا وَغَرَّتْهُمْ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ: **هۆ جنۆکەو مرۆڤینە! ئەدی پێغەمبەرانی منتان بۆ نەهات؟**

---

[1] التذكرة: ٢٢٥.

[2] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٤/٣٠٥).

**ئایەتەکانی منیان بۆ نەخوێندنەوە؟ لە دیداری ئەو ڕۆژەی نەترساندن؟ دەڵێن: بەڵێ، گەواهی دەدەین وایە، ئەو بێبڕوایانە بە دنیا فریوان و گەواهیش لەسەر خۆیان دەدەن کە بێبڕوا بون** ﴿ الأنعام: ١٣٠.

﴿وَبُـرِّزَتْ الْجَحِيـمُ لِلْغَـاوِينَ، وَقِيـلَ لَـهُمْ أَيْـنَ مَـا كُنْتُـمْ تَعْبُـدُونَ : **دۆزەخ بۆ یاخییان دەرکەوت. پێیان دەگوترێ لە دنیادا ئەوانەی کە دەتانپەرستن کوا لە کوێن؟**﴾سورة الأعراف: ٤٤.

﴿وَقِيلَ ادْعُوا شُرَكَاءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ وَرَأَوْا الْعَذَابَ لَوْ أَنَّهُمْ كَـانُوا يَهْتَدُونَ: **پێیان دەگوترێ بانگی هاوبەشەکانتان بکەن، کەبانگیان دەکەن وەڵامیان نادەنەوەو بە هانایانەوە ناهێن. ئینجا سزای خوا دەبینین کە بۆیان ئامادەکراوە. خۆ ئەگەر بڕوادارو ڕێنوێن بونایە توشی سزا نەدەبون** ﴾ سورة القصص: ٦٤.

**ئیبنو کەثیر دەڵێ:** ((**بێبڕواکان ئەگەرچی لەبەر کوفرەکەیان چاکەکانیان سودیان ناداتێ بەڵام کردەوەکانیان دەکێشرێ تا نەگبەتیو زەبونیەکەیان لەبەر چاوی خەڵك دەرکەوێت**)).[1]

**سێیەم: بێبڕواکان هەروەکو لە جێبەجێکردنی ئوصولی شەریعەتدا ئەرکبارن ئاوەهاش لە جێبەجێکردنی فەرعەکاندا ئەرکبارن، جا لە بارەی کەمتەرخەمیو فەرامۆشکردنی هەقدا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ.**

**قورتوبی دەڵێ:** ((**لە قورئاندا بەڵگە لەو بارەوە هەیە کە داوای جێبەجێکردنی فەرعەکانی شەریعەتیشیان لێکراوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێو سزای جێبەجێ نەکردنیان وەردەگرن:**

﴿وَيْلٌ لِلْمُشْرِكِينَ، الَّذِينَ لاَ يُؤْتُـونَ الزَّكَـاةَ: **هاوار بۆ ئەو هاوبەشپەرستانەی زەکات نادەن** ﴾ فصلت: ٦-٧.

---

[1] النهاية لإبن كثير (٢/٣٥).

لەم ئایەتەدا هەڕەشەی سزای لە هاوبەشپەرستان کردوە لەبەر ئەوەی زەکات نادەن، هەروەها لە بارەی تاوانکارانەوە دەفەرموێ:

﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ، قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ، وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ، وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ: بەهەشتیەکان لە تاوانکارەکان دەپرسن چیبو کە دوچاری دۆزەخی کردن؟ دەڵێن: چونکە نوێژمان نەدەکرد و خواردنمان نەدەدایە هەژاران و لەگەڵ قسەی پڕوپوچ و خراپدا هەڵماندەکرد و بڕواشمان بە ڕۆژی دوایی نەبو﴾ المدثر: ٤٢-٤٦.

کەواتە هاوبەشپەرستەکان مادەم داوای بڕواو بڕوابون بە زندوبونەوەو نوێژو زەکاتیان لێکراوە، کەواتە لێشیان بەرپرسیارن و لێیان دەپرسرێتەوە)).[1]

چوارەم: بێبڕوایی‌و گوناح و تاوانی بێبڕواکان ڕادەی بەرزو نزم و پلەی جیاوازیان هەیە، بە گوێرەی کەم و زۆری گوناحەکانیانەوە دەخرێنە دۆزەخ، چونکە ئاگری دۆزەخ چین چینە هەندێ چینی لە ژێر هەندێکی تردایە. هەروەکو بەهەشتیەکان کە هەندێکیان لە ژور هەندێکی تردان. مرۆڤ هەرچەندی بێبڕوایی‌و گومڕایی زۆرتربێ ئەوەندە زیاتر سزاو ئەشکەنجە دەچێژێ، هەندێ بێبڕوا لە چینی هەرە ژێرەوەی دۆزەخدا دەبن، دوڕوەکان لەو جۆرە کەسانەن:

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا: دوڕوەکان لەچینی هەرەژێرەوەی دۆزەخ دان.﴾النساء:١٤٥

شێخلئیسلام ئیبنو تەیمیە دەڵێ: (سزاو ئەشکەنجەی ئەو بێبڕوایانەی خراپەیان زۆرترە لە سزای ئەوانە گەورەترە کە خراپەیان کەمترە، ئەو کەسەی چاکەشی هەبێ سزای سوکترە، بۆیە ئەبو تالیب سزای لە ئەبو لەهەب سوکترە، جا لێپرسینەوە بۆ دەرخستنی پلەی سزاو ئەشکەنجەیە نەك بۆ چونە بەهەشت).[2]

---

[1] تذكرة القرطبي: ٣٠٩

[2] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٣٠٥/٤).

**قورتوبی هەڵسەنگاندنی کردەوەی بێبڕواکان لە دو ڕوان لێکدەداتەوە:**

**یەکەم: بێبڕوایی و تاوانەکانی دەخرێتە تایەکی تەرازو، بەڵام بۆ تایەکەی تر هیچ چاکەیەکی نیە بخرێتە ناوی، ئینجا لەبەر ئەوەی تایەکەی بەتاڵە بۆیە تای گوناحان قورس قورس دەبێ.**

**دوەم: چاکەی بێبڕواکان بە نمونە؛ سەردانی خزمان و خێرکردن و لەگەڵ خەڵکدا باشبون و ئەوانە دەخرێتە تای چاکان بەڵام لەبەر بێبڕوابون هاوبەشپەرستیەکان تای خراپان گرانتر و قورستر دەبێ.**[1]

**بەڵام لێکدانەوەی روی یەکەم راستە چونکە:**

**١. هاوبەشپەرستی دەبێتە هۆی مایەپوچبون و پوکانەوەی تەواوی کردەوە چاکەکان:**

﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ: **گەر هاوبەش پەیدا بکەی تەواوی کردەوەکانت پوچەڵ دەبێتەوە**﴾ الزمر: ٦٥.

﴿وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **هەر کەسێکتان لە دین هەڵگەڕێتەوەو بە بێبڕوایی بمرێ؛ لە ژین و ژیانەوەدا کردەوە چاکەکانی پوچەڵ دەبێ و دەبێتە یەکێك لەوانەی کە بە هەمیشەیی لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە**﴾البقرة: ٢١٧.

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((إنَّ الله لا يقبل من العمل إلاّ ماكان خالصاً وابتغي به وجهه: **خوا تەنها ئەو کردەوانە قبوڵ دەکات کە پاك لە پێناو ئەودایەو شرکی تێدا نیە**))[2].

**٢. لەبەر ئەوەی بێبڕواکان هەر لە دنیادا چاکەو پاداشتی خۆیان وەردەگرنەوەو**

[1] تذكرة القرطبي: ٣١٢.

[2] رواه النسائي في الجهاد عن أبي أمامة. سلسلة الأحاديث الصحيحة، رقم (٥٢).

بۆ ژیانەوەش مایە پوت دەبن، گەلێ فەرمودەی صەحیح لەم بارەوە هەیە بۆ نمونە:

((إنَّ الله لا يظلم مؤمناً حسنته، يعطى بها في الدنيا – وفي رواية يثاب عليها الرزق في الدنيـــا – ويجزي بها في الآخرة، وأما الكافر فيطعم بها بحسنات ما عمل بها لله في الدنيا، حتى إذا أفضـــى إلى الآخرة لم يكن له حسنة يجزى بهـا: خوا ستەم لە هیچ چاکەیەکی بڕوادار ناکات، لە دنیادا شتی پێ دەبەخشێ لە بێژانەوەیەکی تردا دەڵێ: لە پای ئەوەدا لە ژیندا بژێوی پێدەبەخشێ – لە ژیانەوەشدا پاداشتی دەداتەوە. بەڵام بێبڕوا لە دنیادا پاداشتی چاکەکانی وەردەگرێتەوە، بەشێوەیەك لە ژیانەوەدا هیچ چاکەیەکی نامێنێ پاداشتی پێوەرگرێ))[1].

## ئەو ئایاتانەی کە دەفەرمون: بێبڕواکان پرسینەوەیان لەگەڵدا ناکرێ

ڕەنگە بڵێن: ئێوە بەر لە ئێستا سەلماندتان بێبڕواکان لە ڕۆژی قیامەتدا پرسینەوەیان لە گەڵدا دەکرێو مشتومڕ و قسە دەکەن و تەوازۆ و بیانو دەهێننەوە بەڵام ئەدی چ لەو ئایەتانە دەکەن کە لەگەڵ ئەم چەمك و واتایەدا پێچەوانەن؟ وەکو دەفەرموێ:

﴿وَلاَ يُسْأَلُ عَنْ ذُنُوبِهِمْ الْمُجْرِمُونَ: تاوانکارەکان لە بارەی گوناحەکانەوە پرسیاریان لێناکرێ﴾ القصص: ٧٨.

﴿فَيَوْمَئِذٍ لاَ يُسْأَلُ عَنْ ذَنْبِهِ إِنسٌ وَلاَ جَانٌّ: لەو ڕۆژەدا پرسیار لە گوناحی هیچ ئادەمی و جنۆکەیەك ناکرێ﴾ الرحمن: ٣٩.

﴿هَذَا يَوْمُ لاَ يَنطِقُونَ، وَلاَ يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ: ئەمڕۆ ڕۆژێکە بێبڕواکان ناتوانن قسەی تێدا بکەن و ڕێ نادرێن بڕو بیانو بهێننەوە﴾ المرسلات: ٧. زۆر فەرمودەی تریش لەم بارەوە هەن

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٨٢/١) ژمارە: ٥٣.

لەوەلآمدا دەڵێین ئەم ئایەتانە لەگەڵ ئەوانی تر ناساز و ناكۆك نین، زانایانیش لە چەندین روەوە ئەم فەرمودانەیان لەگەڵ یەكدا سازاندوە.

یەكەم: بێبڕواكان پرسیاری نەرم و بە بەزەییان لە گەڵدا ناكرێ بەڵكو لەشێوەی سەركۆنەو سەرزەنشت پرسیارەكەیان لێدەكرێ و پێیان دەگوترێ بۆ واتان كرد و بۆ واتان نەكرد؟[1] قسە لەگەڵدا كردن و بیانو هێنانەوەكەشیان بەهەمان شێوە. خوا قسەی خۆش و نەرمیان لەگەڵدا ناكات بەڵكو بەشێوەیەكی رەق و بە گازاندەوە لە گەڵیان دەدوێ‌و سەركۆنەیان دەكات.

دوەم: پرسیارەكەیان بۆ سۆراغكردن نیە چونكە خوا دەزانێ چیان كردوەو نەكردوە. بەڵكو پرسیاری پێ سەلماندنە. پێیان دەڵێ: بۆ واتان كرد؟ حەسەن و قەتادە دەڵێن: پرسیار لە تاوانەكانیان ناكرێ چونكە خوا هەموی هەڵگرتوەو فریشتەكانیش لەسەریان نوسیون.[2]

سییەم: لەڕۆژی قیامەتدا لە هەندێ جێگەدا پرسیاریان لێدەكرێ لە هەندی جێگەی تریش لێیان ناكرێ. قورتوبی دەڵێ: (ڕۆژی قیامەت جێگەی جۆراو جۆری هەیە جێگە هەیە پرسیاری تێدا نیە).[3]

سەفارینی دەڵێ: (رەنگە لە هەندێ جێگەدا پرسیاریان لێنەكرێ عیكرمە ئەمەی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە.. خەڵك لە ڕۆژی قیامەتدا سێ رەوشیان هەیە ئایەتەكانیش بە گوێرەی ئەم سێ رەوشەوە دواون، پێشەوا ئەحمەد لەم بارەوە لە وەلآمە قورئانیەكانیدا گوتویەتی: یەكەمجار كە خەڵك زندو دەكرێنەوە بەئەندازەی شەست ساڵ قسە ناكەن و رێ نادرێن تەوازۆ و بیانو بهێننەوە. پاشان رێ دەدرێن قسە بكەن هەروەكو خوا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا﴾السجدة:١٢).[4]

---

[1] التذكرة:٢٨٦.
[2] لوامع الأنوار البهية: (١٧٤/٢).
[3] التذكرة: ٢٨٦.
[4] لوامع الأنوار البهية: (١٧٤/٢).

**جا کە ڕێگەیان پێدەدرێ بدوێن، ئەوا قسە و مشتومڕ دەکەن هەروەکو خوا دەفەرموێ:**

﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ الزمر:٣١

**ئەو مشتومڕە لە کاتی لێپرسینەوەو تۆڵە وەرگرتنەوە دایە، پاشان پێیان دەگوترێ:**

﴿لاَ تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُمْ بِالْوَعِيدِ﴾ ق: ٢٨.

**ئیتر لەگەڵ ئەو قسەیەدا ئەشکەنجەو سزا دێتە گۆڕێ.**[١]

**چوارەم: قورتوبی دەڵێ: واتای ئەم وتەیەی خوا کە دەفەرموێ:**

﴿وَلاَ يُسْأَلُ عَنْ ذُنُوبِهِمْ الْمُجْرِمُونَ﴾ القصص: ٧٨.

**ئەوەیە کە ئەو جۆرە پرسیارانە ناکرێ کە بڕواردارو بێبڕوای پێ لێکتر جیا دەبێتەوە، واتە فریشتەکان پێویستیان بەوە نیە بپرسن: دینت چ بوە؟ لە دنیادا چت کردوە؟ تا بزانن داخوە بڕوادار بوە یان بێبڕوا. چونکە هەردوکیان دیارن: بڕوادارەکان ڕوگەش و گوشادو شادن، بێبڕواکانیش ڕوڕەش و مات و ڕەنگ بزڕکاون. هەرکاتێکیش فریشتەکان فەرمانیان پێبکرێ تاوانکارەکان ڕاپێچی دۆزەخ بکەن یەکسەر بە ڕەنگ و ڕو دەیانناسن و ڕاپێچیان دەکەن...**[٢]

---

[١] لوامع الأنوار البهية: (١٧٤/٢).

[٢] التذكرة: ٢٨٧.

# جێباسی سێیەم

## ئەو ڕێسایانەی لێپرسینەوەی بەندەکانی لەسەر ئەنجام دەدرێت

ئەگەر خوا سەرجەم بەدیهێنراوەکانی خۆشی سزا بدات و بیانخاتە ناو ئەشکەنجەش هەر نابێتە ستەمکار چونکە هەموویان بەندەو موڵکی خوان، خاوەن موڵکیش لە ئاست موڵکەکەیدا ئازادە چ بکات و چ نەکات. بەڵام خوای بەرزو پیرۆز لێپرسینەوەیەکی دادپەروەرانە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، کە مرۆڤایەتی لە پێشودا دادی وای بەخۆ نەدیتوە، خوا لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا کۆمەڵێك یاسای هەڵناوەو بە پێی ڕێوشوێنی ئەو یاسایانە لێپرسینەوە ئەنجام دەدات و دادگایی بەندەکانی دەکات.

ئێمەش ئەو یاسایانە دەخەینە ڕو کە لە میانەی دەقەکانەوە بۆمان دەرکەوتوە:

۱) دادێکی تەواو و بێگەرد لە ستەم:

خوای دادگەر تەواوی پاداشتی بەندەکان دەداتەوە بێئەوەی تەنانەت تۆزقاڵێکیشی لێ کەم بکاتەوە:

﴿ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ: پاشان هەمو کەسێك پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە بێئەوەی ستەمیان لێبکرێ﴾ البقرة: ۲۸۱.

لوقمان لە ئامۆژگاریەکەیدا دادی خوا بە کوڕەکەی دەناسێنێو دەڵێ:

﴿يَابُنَيَّ إِنَّهَا إِنْ تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ فَتَكُنْ فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ: کوڕی خۆم ! هەر کردەوەیەك ئەگەر سەنگی دەنکە زیوانێکیشی هەبێ جا لە ناو گابەردێك بێ یان لە ئاسمان یان لەناو

**زەوی خوا هەر دەیهێنێ، خوا شارەزاو لێزانە﴾** لقمان: ١٦.

**خوا لە جێگەی تردا دەفەرموێ:**

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ: **خوا بە سەنگی گەردێکیش چیە ستەم ناکات.**﴾النساء:: ٤٠

﴿والآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنْ اتَّقَى وَلاَ تُظْلَمُونَ فَتِيـــلاً: **بۆ پارێزکاران ژیانەوە باشترە، بەقەد داوی ناو زگی دەنکە قەسپێکیش ستەمتان لێناکرێ﴾** النساء: ٧٧.

﴿وَمَنْ يَعْمَلْ مِنْ ،صَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّــةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِــيرًا: **هەر یەکێك کوڕ بێ یان ،ێ، ژن بێ یان پیاو، بەو مەرجەی بڕوادار بێو چاکە بکات دەچێتە بەهەشت، بەئەندازەی ئاستەمێکیش ستەمی لێناکرێت ﴾** النساء ١٢٤.

﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَــرَه، وَمَــنْ يَعْمَــلْ مِثْقَــالَ ذَرَّةٍ شَــرًّا يَــرَه: **هەرکەسێك بەئەندازەی گەردێکیش چاکەو خراپەی هەبێ ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەیبینێتەوە﴾**الزلزال:٧-٨.

**لەم ئایەتانەدا خوا پێمان دەڵێ هەمو بەندەیەك بە گوێرەی کردەوەکانی خۆی پاداشت وەردەگرێتەوە، ئاستەمێکیشی لێ بەفیڕۆ نادات و بەقەد گەردێکیش چیە کەمی ناکاتەوە.**

(ذرة): **ئەو گەردو دەنکە تۆزانەیە کە لەناو تیشك و تیرۆژی کلاوڕۆژنـاندا دەبینرێ.**

(فتیل): **ئەو داوەیە کەلەناو کەلێنی زگی ناوکە خورمادا هەیە.**

(نقیر): **ئەو گرنجەیە کە لەسەر پشتی ناوکە خورمادا هەیە.**

## ٢- کەس ئۆباڵی کەس هەڵناگرێ:

**ئەم یاسایە ئەوپەڕی دادگەری تێدا دەپشکوێتەوە کە بەندەکان بەپێی کردەوەکانیان سزاو پاداشتی خۆیان وەردەگرنەوە، هیچ کەسێکیش ئۆباڵی کەسێکیتری ناخرێتە ئەستۆ، هەروەکو خوا دەفەرموێت:**

﴿وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ثُــمَّ إِلَــى رَبِّكُــمْ مَرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُــونَ: **هەمو کەسێك ئۆباڵی کردەوەکانی خۆی لەئەستۆی خۆیەتی، کەس گوناحی کەس هەڵناگرێ، پاشان سەرەنجامتان بۆ لای خوایــەو لــەرۆژی قیامــەتدا هــەواڵی جیاوازیتــان لــەبیروباوەڕ و کــاردا پێڕادەگەیەنێ**﴾الأنعام ١٦٤

**ئەمەیە لوتکەی دادگەری، کە دادیتری لەهەورازتر نیە، ئەو کەسەی ڕێنوێن بوە بەروبومی ڕێنوێنیەکەی دەچنێ، ئەوکەسەی گومڕاش بوە ئۆباڵی لە مل خۆیەتی:**

((مَنْ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلاَ تَــزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً: **ئەوەی ڕێنوێن ببێ بۆ خۆیەتی، ئــەوەی گومــڕاش ببــێ لەســەر خۆیــەتی، کەســیش گونــاحی کــەس هــەڵناگرێ، کەسیشمان سزا نەداوە تا پەیامبەرمان بۆ نەناردبێ**﴾الأسراء ١٥

**ئەم یاسا مەزنە بڕگەیەك بوە لەبەرنامەی سەرجەم پەیامە ئاسمانیەکان. خوا دەفەرموێ:**

﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَى، وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى، أَلاَّ تَــزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى، وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى، وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى، ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَــزَاءَ الأَوْفَــى: **دیارە نوسراوەکانی پەڕاوی موساو ئیبراهیمی پێڕانەگەینراوە، ئەو ئیبراهیمەی کە پەیمانی خۆی لەگەڵ خوادا بەجێ هێناوە، کە هیچ کەس باری گوناحی کەسێکیتر هەڵناگرێ و مرۆڤ هەرچی بە کردوکۆشی خۆی پەیدای نەکات دەستی ناکەوێ. بێگومان پاداشتی کردەوەی خۆی نیشان دەدرێتەوە، لەرۆژی قیامەتیشدا پاداشتی تەواوی دەدرێتەوە**﴾النجم ٣٦-٤١.

**قورتوبی لەوەڵامی** ﴿أَلاَّ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾**دا دەڵێ: (واتە باری گوناحی کەسێکیتر هەڵناگرێت، هیچ کەسێك بەگوناحی جگە لە گوناحی خۆی سزا نادرێت، بەڵکو هەمو کەسێك تەنها سزای کردەوەکانی خۆی وەردەگرێتەوە، لەبنەڕەتدا**

(الوزر) واتە قورسایی وەکو دەفەرموێ: ﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ﴾ الشرح ٢.
بەڵام لێرەدا بەواتای گوناح دێت.. ئایەتەکە دەرهەق بە وەلیدی کوڕی موغیرە دابەزیوە کە بەخەڵکی دەگوت: وەشوێن من بکەون گوناحتان لە ملی من، ئیبنوعەباس ئەمەی باس کردوە. وتوشیانە بۆ وەڵامدانەوەی عەرەبەکانی سەردەمی نەفامێتی دابەزیوە کە بەهۆی باوك و براوە کابرایان سزا دەدا یانیش بەهۆی هاوپەیمانەکەیەوە هەڵوێستیان لە دژدا وەردەگرت)[1]

**٣) ئەوکەسانەی باری تریشیان سەربار دەبێت:**

**ڕەنگە هەندێ زانا لە ڕوی وتەکەمان قیت ببنەوەو بڵێن وتەکەی ئێوە پێچەوانەی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:**

﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالاً مَعَ أَثْقَالِهِمْ: **جگە لە گوناحی خۆیان گوناحی تریش هەڵدەگرن.**﴾ العنكبوت ١٣.

﴿وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ: **جگە لە گوناحی خۆیان هەندێ گوناحی ئەوانیش هەڵدەگرن کە بەبێ زانست گومڕایان کردون**﴾ النحل ٢٥.

**بەڵام ئەوەی وتومانەو ئایەتمان لەبارەوە هێناوەتەوە لەگەڵ ئەم ئایەتانەدا تێکناگیرێن و ناکۆك نین. ئەو ئایەتانە دەفەرمون؛ مرۆڤ جگە لە گوناحەکانی خۆی گوناحی ئەوانیش هەڵدەگرێ کە بە گوفتار یان بەکردار گومڕای کردون بێئەوەی لەگوناحی گومڕاکراوەکانیش کەم ببێتەوە، بەپێچەوانەوەش هەر ڕاستە ئەوانەی بانگەوازی بۆ ڕێی ڕاست و ڕێنوێنی دەکەن جگە لە پاداشتی خۆیان بەئەندازەی پاداشتی شوێنکەوتوانیش خێریان بۆ دەنوسرێ. گومڕاکردنی خەڵك خۆی لەخۆیدا کردەوەیەکی ئەوانە و سزای لەسەر وەر دەگرن.**[2]

---

[1] تفسير القرطبي(٤/١٥٧)

[2] لەپەرتوکی (مقاصد المكلفين)دا بەفروانی لەم بارەوە دواوین.

٤- نیشاندانەوەی كردەوەكان:

بۆ ئەوەی دادگەری خوا بسەلمێ‌و بەندە بیانو و هەنجەتی نەمێنێ خوا هەمو كردەوە چاك و خراپەكانی پێ نیشان دەداتەوە، تا بەخۆیان دادگایی خۆیان بكەن و ئیتر بەهانەیان نەمێنێ.

﴿إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ: سەرەنجامتان بۆ لای خوایە، لەرۆژی قیامەتدا هەمو كردەوەكانتان پێ دەڵێتەوە كە چتان كردوەو نەكردوە﴾المائدة: ١٠٥.

﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِنْ سُوءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ أَمَدًا بَعِيدًا: لەرۆژی قیامەتدا سەرجەم كردەوە چاك و خراپەكانی بە گەڵاڵە كراوی دەبینێتەوە، حەز دەكا كردەوە خراپەكانی زۆر لێی دور بن.﴾ آل عمران ٣٠.

﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ: لەرۆژی قیامەتدا هەمو كەسێك دەزانێ پێش و پاش مەرگ چی ئەنجام داوە﴾ الأنفطار ٥.

﴿وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلاَ يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا: هەمو كردەوەكانیان بە گەڵاڵە كراوی دەبیننەوە، پەروەردگارت ستەم لەكەس ناكات.﴾ الكهف ٤٩.

نیشاندانەوەی كردەوەكان بەو چەشنەیە كە كارنامەكانیان دەدرێتەوەو هەمو كردەوەكانیان تێدا دەخوێننەوە، خوا پێی راگەیاندوین كە هەمو كەسێك دو فریشتەی بۆ تەرخان كردوە،چاك و خراپەكانی دەنوسن و كاتێكیش كە دەمرێ مۆر لەكارنامەكەی دەدرێ، تا لەرۆژی قیامەتدا دەیدەنەوە پێی‌و دەڵێن؛ كارنامەكەت بخوێنەوەو بەخۆت گەواهیدەری خۆت بە.

﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا، اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا: كردەوەكانی هەر مرۆڤێكمان بە ملیەوە پابەند كردوە، لە رۆژی قیامەتدا كارنامەكەی دەردەهێنین و بەكراوەیی

لەبەردەستیدا دەبێ. پێی دەگوترێ کارنامەکەت بخوێنەوە، خۆت بەسی لە خۆت بپرسیەوە﴾ الإسراء ١٣.

ئەم کارنامەیە تەواوی کردەوەکانی لەخۆ گرتوە، بچوك و گەورە، قەت هیچی نەپەڕاندوە:

﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَاوَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لاَ يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلاَ كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلاَ يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا: کارنامەکان دەدرێنەوە، تاوانکارەکان سام دەیانگرێو لە تاوانە نوسراوەکانیان دەترسن. دەڵێن: هەی تونا و تون بین! ئەو کارنامەیە چیە؟ خۆ هیچ تاوان و گوناحێکی گەورەو بچوك نەماوە هەڵینەژماردبێ؟! ئەوجا هەمو کردەوەکانیان بە ئامادەیی دەبیننەوە. خوای پەروەردگار ستەم لە هیچ کەسێك ناکات و سزای نادات گەر تاوانی نەکردبێ پاداشتیشی لێکەم ناکاتەوە﴾ الكهف:٤٧.

## ٥- چەندانە بونی پاداشت و وەکوخۆبونی سزا:

خوا لەمیهرەبانی خۆیەوە پاداشتی کردەوە چاکەکان چەندانە دەکات؛

﴿إِنْ تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ: ئەگەر ماڵێکی باش لەپێناو خوا ببەخشن؛ خوا بەچەندین جار لەخۆی زیاتر پاداشتی دەداتەوە﴾ التغابن ١٧.

کەمترین رادەی چەندانەکە دەجار پترە؛

﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا: هەرکەسێك چاکەیەك بکات (دە)هێندەی خۆی پاداشت وەردەگرێتەوە﴾الأنعام: ١٦٠

بەڵام گوناح تەنها هێندەی خۆی سزا وەردەگرێو ئاستەمێکیشی لێپتر ناکرێ؛

﴿وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا: ئەوەی خراپەیەك بکات تەنها سزای شایەنی خۆی وەردەگرێ بێئەوەی لێی پتر بکرێ﴾ الأنعام ١٦٠.

چونکە دادی خوا وا دەخوازێ.

ئـەبو ذەر ﷺ دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ لـەخواوە دەگێڕێتـەوە کـە فەرمویەتی:

﴿الحسنة بعشر امثالها أو زيد، والسيئة واحدة أو أغفرها، ولو لقيتني بقراب الأرض خطايـا مالم يشرك بي، لقيتـك بقرابهـا مغفـرة: هەرچاکەیەك بە دە هێند یان زیاتر پاداشت وەردەگرێتەوە، بەڵام خراپە تەنها هێندەی خۆی سزا وەردەگرێتەوە یان لێی خۆش دەبم، بەندە! ئەگەر بەپڕایی زەوی گوناحم بۆبێنی بەڵام هاوبەشت بۆ پەیدا نەکردبم ئەوا منیش بەپڕایی زەوی لێت دەبورم﴾[1].

یەکێکیتر لەو کردەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی راگەیاندوین کە پاداشتی بە دە هێند وەردەگرێتەوە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزە:

ئیبنومەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

(من قرأ حرفا من كتاب الله، فله به حسنة، والحسنة بعشر امثالها، لا أقول (الم) حرف، الـف حرف، لام حرف، ميم حـرف: هەرکەسێك یەك پیت لە قورئاندا بخوێنێتەوە لەپای ئەوەدا چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ، هەرچاکەیەکیش دە پاداشتی پێشکەشە، ناڵێم (الم) یەك پیتە، بەڵکو الف، لام، میم، هەریەکەیان پیتێکە))[2].

هـەروەها پێـی راگـەیاندوین کـە یـادکردنی خـواش بـە دە هێنـدە پاداشـت دەدرێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی عـەمری کوڕی عـاص ﷺ دەگێڕێتـەوە کە پێغەمبـەرﷺ فەرمویەتی:

((خصلتان –أو خلتان لا يحصيهما رجل مسلم الا دخل الجنة، وهما يسـير، ومـن يعمل بهما قليل؛ يسبح الله في دُبُر كل صلاة عشرا، ويحمده عشرا، ويكبره عشرا، فلقـد

---

[1] رواه الحاكم في مستدركه وأحمد في مسنده بأسناد حسن، سلسلة الأحاديث الصحيحة: الحديث رقم ١٢٨

[2] رواه الترمذي والدارمي بأسناد صحيح، وقال الترمذي هذا حديث حسن صحيح، غعريب اسناداً، مشكاة المصابيح: (١/٦٦١) رقم (٢١٣٧)

رأيت رسول اللهﷺ يعقدها بيده، قال: فتلك خمسون ومائة باللسان، والف وخمسمائة في الميزان، وإذا أخذت مضجعك تسبحه وتكبره وتحمده مائة مرة، فتلك مائة باللسان، والف في الميزان. فأيكم يعمل في يوم والليلة الفين وخمسمائة سيئة؟ قالوا فكيف لا نحصيها؟ قال: يأتي احدكم الشيطان وهو في صلاته. فيقول: اذكر كذا، اذكر كذا، حتى ينفتل، فلعله لا يفعل، ويأتيه وهو في مضجعه، فلا يزال ينومه حتى ينام: دو رەوشتی ئاسان و سانا هەن و کەم کەس کاریان پێ دەکات، هەر موسڵمانێك پەیڕەویان لێبکات دەچێتە بەهەشت: لەدوای هەمو نوێژێکدا هەریەکە و دەجاران بڵێ: سبحان الله، الحمدلله، الله أكبر. عەبدوڵلای کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺم دیت بەپەنجەکانی دەستی دەیژماردن. ئەگەر وابکات لەهەر پێنج نوێژاندا سەدوپەنجا جار بەزمان دەیانڵێ، بەلام لەتەرازوی ڕۆژی قیامەتدا بەهەزارو پێنجسەد جار هەژمارە. شەوانیش کە دەچێتە سەرجێو سەدجاریتر سبحان الله و الحمدلله و الله اكبر بڵێتەوە کە لەسەر زمان سەدە، بەلام لەتەرازودا هەزارە، کامتان لەشەو و ڕۆژێکدا دوهەزارو پێنجسەد گوناح دەکات؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەرچی نایانکەین؟! فەرموی: لەنوێژدا شەیتان دێتە لای‌و پێی دەڵێ ئەوشتەو ئەوشتە بەبیر خۆت بێنەوە، تا خەریکی دەکات و کە نوێژەکەی تەواوکرد ڕەنگە یادەکان نەکات یان لەسەر جێگادا هەر بیری خەوێی دێنێتە مێشك تا دەنوێ و یادەکان ناکات))[1].

لە بێژانەوەیەکی ئەبو داووددا لەدوای وتەی (في الميزان)ی یەکەمدا دەفەرموێ:

((ویکبر أربعا وثلاثين إذا أخذ مضجعه، ويحمد ثلاثا وثلاثين، ويسبح ثلاثا وثلاثين، فذلك مائة باللسان، والف في الميزان، فلقد رأيت رسول الله ﷺ يعقدها بيده. قالوا: يارسول الله، كيف هما يسير، ومن يعمل بهما قليل؟ قال: يأتي أحدكم الشيطان في منامه فينومه قبل أن يقوله، ويأتيه في صلاته فيذكره حاجته قبل أن يقولها: ئەگەر چوە سەرجێو بخەوێ سیوچوار جاران بڵێ الله اكبر و سیوسێ جارانیش بڵێ الحمدلله و سیوسێ جارانیش بڵێ

[1] أخرجه الترمذي والنسائي

سبحان الله، کە سەرجەمیان دەکاتە سەد، لە تەرازوشدا دەکاتە هەزار. پێغەمبەرم دیت بەپەنجەکانی دەست دەیژماردن. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن ئاسانن و کەم کەس کاریان پێ دەکات؟! فەرموی: لەسەر جێگادا شەیتان بۆی دێت و بەرلەوەی یادەکان بڵێ دەیخەوێنێ. لەنوێژدا بۆی دێت و ئیش وکارەکانی وەبیر دێنێتەوەو وەناکات یادەکان بکات))[1].

بوخاری و موسلیم و هیدیکەش دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە شەوی بەرزبونەوەکەیدا لەنێوان خواو موسادا هاموشۆی دەکرد، هەمو جارێ موسا داوای لێدەکرد بگەڕێتەوە لای خوا تاکو نوێژی بۆ ئاسانتر بکاتەوە تا لە ئەنجامدا لەپەنجا نوێژ بوە پێنج نوێژ، لەکۆتاییەکەیدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((قال الجبار تبارك وتعالى؛ انه لا يبدل القول، كما فرضت عليك في أم الكتاب، فكل حسنة بعشر أمثالها، فهي خمسون في الكتاب، وهي خمس عليك. فرجع الى موسى، فقال: كيف فعلت؟ قال: خفف عنا، أعطانا بكل حسنة عشرة امثالها: خوای مەزن و باڵادەست فەرموی: ئێستا ئەوەندەیە کە لە تەختی پارێزراودا فەرزم کردوە، هەمو چاکەیەك بە دەجار پتر پاداشت دەدرێتەوە. لە تەختی پارێزراودا پەنجا نوێژە، بەڵام لەلای تۆ پێنج نوێژە، پاشان گەڕایەوە، موسا لێی پرسی: چت کرد؟ گوتی: ئاسان بو، بۆ هەمو چاکەیەك دە هێندەمان پێدەبەخشێ)).

ڕەنگە لە دە هێندەش پتر بێ، ڕەنگە بگاتە حەفسەدو زیاتریش، ماڵبەخشین لەپێناو خوا لەو جۆرە خێرانەیە، وەکو خوا دەفەرموێ:

﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ: وێنەی ئەو کەسانەی لەپێناو خوا ماڵ دەبەخشن وەکو وێنەی دەنکە تۆیەکە حەفت گوڵ بگرێ، هەر گوڵەی سەد دەنکۆڵەی گرتبێ، بەڵکو خوا پاداشتی لەوەش

[1] جامع الأصول: (٣٧٢/٤) رقم٢٤١٨

پتر دەداتەوە، خوا زانایەو بەخششی فرەوانە﴾ البقرة ٢٦١.

ئیبنو کەثیر دەڵێ: خوا لەچاکی خۆیەتی کە ئەو هەمو چەندانە پاداشتە بەو کەسانە دەبەخشێ کە لەپێناو خوادا ماڵ دەبەخشن. هەرچاکەیەکیش لە دە هێندەوە تا حەفسەد هێند پاداشت دەدرێتەوە، دەفەرموێ:

﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: (واتە ماڵبەخشین لەرێی جیهادو بەخێوکردنی هەسپ و هێسترو پەیداکردنی چەك و ئەو شتانە)، ئیبنو عەبباسیش وتویەتی: (هەر درهەمێك لە رێی جیهادو حەجدا بەخت بکرێ پاداشتەکەی تا حەفسەد هێند دەڕوات).[1]

ئیبنو کەثیر لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەو فەرمودەیەی هێناوەتەوە کە موسلیم و نەسائی و ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەگێڕێتەوە کە جارێکیان پیاوێك وشترێکی لوت بڕاوی هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ و لەپێناو خوای بەخشی، پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((لتأتين يوم القيامة بسبعمائة مخطومة: لەرۆژی قیامەتێدا بەخۆو بەحەفسەد حوشتری لوتبڕاو دێیە مەیدان)).

ئەم فەرمودەیە واژەی ئەحمەدو نەسائی بو، لەواژەی موسلیمدا دەڵێ: پیاوێك حوشترێکی لوتبڕاوی هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەوەم لەپێناو خوا بەخشی. فەرموی:

((لك بها يو القيامة سبعمائة ناقة: لەرۆژی قیامەتدا لەپای ئەمەدا حەفسەد وشترت دەدرێتەوە)).[2]

بەرۆژوبونیش یەکێکە لەو کردەوانەی کە پاداشتەکەی هەژمار ناکرێ و بەبێ

[1] تفسير ابن كثير: (٥٦١/١)

[2] تفسير ابن كثير: (٥٦٢/١).

ئەندازە هەر خوا بەخۆی دەزانێ چەندی پاداشت دەداتەوە.

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((كل عمل ابن آدم يضاعف الحسنة بعشر أمثالها الى سبعمائة ضعف، قـــال الله تعـــالى الا الصوم فإنه لي، وأنا أجـــزي بـــه: هـەمو کردەوەیـەك لـە دە تـا حەفسـەد هێنـد پاداشتی دەدرێتـەوە، خـوا دەفـەرموێ: تەنـها رۆژو نـەبێ مـن خـۆم دەزانم چـەندی پاداشـت دەدەمەوە))[1].

رۆژو بۆیـە ئـەو هـەمو پاداشـتە بێئەندازەیـەی دەدرێتــەوە چونكـە بریتیـە لـە ئارامگرتن، ئارامگرانیش پاداشتی خۆیان بەبێ ئەندازە وەردەگرنەوە؛

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَـابٍ: ئارامگران بەبێ ئەندازە پاداشتی خۆیان وەردەگرنەوە﴾ الزمر ١٠.

قورتوبی دەڵێ: (زانایان دەڵێن هـەمو پاداشتێك بەپێوانە دەپێورێـت، هـەمویان بەتەرازو دەکێشرێن، تەنها رۆژوگرتن نەبێ کە بەبێ ئەندازە پاداشتی بۆ هەڵدەڕژێ)[2]

ئـارامگرتن ئـەوەش دەگرێتـەوە کـە خـۆی لەبـەر تەنگانـەو ناخۆشـیەکانی دنیـا ڕاگرێ کە خوا بەمەبەستی تاقیکردنەوە مرۆڤی پێگرفتار دەکات:

﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الاَمْوَالِ وَالانفُسِ وَالثَّمَـــرَاتِ وَبَشِّرْ الصَّابِرِينَ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُـونَ أُوْلَئِـكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُهْتَدُونَ: هەڵبـەت تاقیتـان دەکەینـەوە بەکەمێك ترس و برسیەتیو کەمبونەوەی داراییو کەس لێمردن و نەهاتی، مژدە بدە بەخۆڕاگران. ئەوانەی کە توشی سەختیەك دەبن دەڵێن: بە فەرمانی خوا هاتوین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، ئەوانە درود و بەخشش و میهری خوایان بەسەردا

---

[1] رواه بخاري ومسلم. مشكاة المصابيح: (١/٦١٣) ژمارە(١٩٥٩)

[2] تفسير القرطبي: (١٥/٢٤٠)

دەڕژێ. هەر ئەوانن ڕێنوێنبوانی ڕاستەقینە﴾البقرة:١٥٥-١٥٧.

لەرۆژی دواییدا لەشساغ و ناگرفتارەکان کە پاداشت و پلەی ئارامگرتن دەبینن خۆزگە دەخوازن لە دنیادا پێستی لەشیان هەنجن هەنجن بکرابا.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لیودّون اهل العافية يوم القيامة، أن جلودهم قرضت بالمقاريض، مما يرون من ثواب اهل البلاء: کە ناگرفتارەکان لەرۆژی قیامەتیدا پلەو پاداشتی ئارامگران دەبینن حەز دەکەن گۆشت و پێستیان بەئاسن لێکرابایەوە))[1].

یەکێکی‌تر لەچاکیەکانی خوا ئەوەیە گەر بڕواداڕێك بیەوێ چاکەیەك بکات بەڵام نەیکات، ئەوا چاکەکەی بۆ دەنوسرێ، بەڵام ئەگەر ویستی گوناحێك بکات پاشان لەترسی خوا نەیکات ئەوا نەك هەر گوناحی بۆ نانوسرێت بەڵکو چاکەیەکیشی بۆ دەنوسرێت.

ئیبنوعەبباس لەپێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە خوا فەرمویەتی:

((إن الله كتب الحسنات والسيئات، ثم بين ذلك، فمن هم بحسنة فلم يعملها، كتبها الله له عنده حسنة كاملة، فإن هو هم بها فعملها كتبها الله له عنده عشر حسنات الى سبعمائة ضعف، الى اضعاف كثيرة، ومن هم بسيئة فلم يعملها كتبها الله له عنده حسنة كاملة، فإن هو هم بها فعملها، كتبها الله له سيئة واحدة: خوا چاکەو خراپەی لەسەر هەمو شتێکدا نوسیوە، پاشان رونی کردۆتەوە، جا ئەو کەسەی ویستی چاکەیەك بکات و پاشان نەیکرد، ئەوا چاکەیەکی ڕێك و پێکی بۆ دەنوسرێ، وە ئەگەر ویستی بیکات و کردی ئەوا لە دە چاکە تا حەفسەد چاکەی بۆ دەنوسرێت، بەڵکو زیاتریش.. بەڵام ئەگەر هەرکەسێك نیازی وابو خراپەیەك بکات بەڵام نەیکات ئەوا چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسرێت، خۆ ئەگەر بیکات هەر یەك خراپەی بۆ دەنوسرێت.﴾[2].

---

[1] في سنن الترمذي عن جابر، ومعجم الطبراني عن ابن عباس بأسناد حسن. صحيح جامع الصغير: (١١١/٥
[2] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب من هم بحسنة أو سيئة، فتح الباري (٣٢٣/١١).

## گۆڕینی خراپەکان بۆ چاکە:

خوا لەگەڵ بەندەکانیدا هێند بەبەزەیی و میهرەبانە تەنانەت خراپەکانیان بۆ دەکاتە چاکە.

ئەبوذەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((اني لأعلم أخر اهل الجنة دخولاً الجنة، وأخر اهل النار خروجاً منها، رجل يؤتى بـــه يـــوم القيامة، فيقال: اعرضوا عليه صغار ذنوبه، فيقال: عملت يوم كذاوكذا، وعملت يوم كذاوكذا، وكذاوكذا. فيقول: نعم؛ لا يستطيع أن ينكر. وهو مشفق من كبار ذنوبه أن تعرض عليه. فيقـال له: فإن لك مكان كل ســـيئة حســـنة. فيقـــول: رب، عملـــت اشـــياء لا أراهـــا هاهنـــا!: من دەزانم ئاخر کەس چۆنە کە دەچێتە بەهەشت، هەروەها ئاخیر کەسیش کە لە دۆزەخ دەردێت، لەرۆژی قیامەتدا پیاوێك دەێنن خوا دەفەرموێ: گوناحە گچکەکانی بۆ رانوێنن، پێی دەڵێن؛ لە فلانە رۆژی ئاوەهاو ئەوهات کرد، لەفیسارە رۆژیشدا ئەوهاو ئەوها. دەڵێ بەڵێ راستە، ناتوانێ نکوڵی لێبکات، لەگوناحە گەورەکانی زۆر دەترسێ بۆی رانوێنن، بەڵام پێی دەگوترێ؛ دەبزانە لەجێی هەر گوناحێك چاکەیەکت بۆ دەنوسرێ. ئینجا دەڵێ؛ خوایە هەندێك گوناحم کردوە لێرەدا نابینم! ئەبوزەر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی هاتێ تا ددانە خڕەی وەدیار کەوت))[1].

## ٥- بێبڕوا و دوڕوەکان ڕووەو ڕوی شاهێدان دەکرێنەوە:

گەورەترین شاهێدی رۆژی قیامەت خوای ئافەریدگارە کە هیچ شتێکی لێ بزر نابێ،

﴿وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إذ تفيضون فيه: هەر کردەوەیەکی دەتانکرد پێتان ئاگادار بوین﴾ يونس/٦١

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: خوا دەسەڵاتی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە﴾ النساء/٦٦

---

[1] صحيح مسلم: (١/١٧٧) ژمارە(١٩٠)

بەلاَم خوا حەز دەكا بەندەكان بیانویان نەمێنێ، بۆیە هەندێ لەبەدیهێنراوانی دەكاتە شاهێد، پتر لەئایەتێك لەبارەی ئەم شاهێدانەوە هاتوە:

﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الأشْهَادُ: ئێمە لەدونیاو ئاخیرەتدا پێغەمبەران و بڕواداران سەردەخەین لەو ئاخیرەتەی كە شاهێدان روەو روتان دەكرێنەوە﴾ غافر ٥١.

﴿وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ: لەو رۆژەدا پێغەمبەران و گەواهیدەران دێنن﴾الزمر:٦٩

یەكەمین كەس كە شاهێدی لەسەر نەتەوەكان بدەن پێغەمبەرەكانیانە، هەمو پێغەمبەرێك شاهێدی لەسەر نەتەوەكەی دەدات كە پەیامی خوای پێ راگەیاندون.

﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاَءِ شَهِيدًا: چۆنە ئەگەر لەرۆژی قیامەتدا بۆهەمو نەتەوەیەك شاهێدێكمان هێناو، تۆشمان كردە شاهێد لەسەر ئەوانەی نەتەوەكەت﴾النساء ٤١.

﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِمْ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَى هَؤُلاَءِ: لەرۆژی قیامەتدا هەمو نەتەوەیەك شاهێدیان لەخۆیانەوە بۆ دەهێندرێ، تۆش لەسەر ئەوانە دەكەینە شاهێد﴾النحل ٨٩.

﴿شَهِيدًا عَلَيْهِمْ مِنْ أَنفُسِهِمْ: شاهێدیان لەخۆیانەوە بۆ دەهێنرێ كە پێغەمبەرانن.﴾التوبة:١٢٨.

چونكە هەمو پێغەمبەران لەنەتەوەكەی خۆیانن وەكو خوا دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنفُسِكُمْ: پێغەمبەرتان لەخۆتانەوە بۆ هاتوە﴾ التوبة ١٢٨.

﴿وَنَزَعْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ: بۆهەمو نەتەوەیەك شاهێدێك دێنین شاهێدیان لەسەر بدات، بە بێبڕواكان دەلێین؛ دەی بەلگە بێنن كە من هاوبەشم هەیە﴾القصص ٧٥

ئینجا هەروەكو چۆن گەواهی دەدەن كە فەرمانی خوایان راگەیاندوە، ئاوەهاش

شاهیدی دەدەن کە بێبڕوابیان پێ‌کردون:

﴿يَوْمَ يَجْمَعُ اللَّهُ الرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَا أُجِبْتُمْ قَالُوا لاَ عِلْمَ لَنَـــا إِنَّـــكَ أَنْـــتَ عَـــلاَّمُ الْغُيُوبِ: لەرۆژی قیامەتدا خوا سەرجەم پێغەمبەران کۆدەکاتـەوەو لێیـان دەپرسێت: نەتـــەوەکانتان چیـــان وەڵام دانـــەوە. دەڵێـــن: خوایـــە ئێمـــە نـــازانین خـــۆت پەنامەکیزانی﴾المائدة:١٠٩

﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ، فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِمْ بِعِلْمٍ وَمَـــا كُنَّـــا غَـــائِبِينَ: لەپێغەمبـەران و نەتـەوەکان دەپرسـینەوە بزانـین داخـۆ چـۆن وەڵامـی پەیامبەرانیان داوەتەوە﴾ الأعراف ٦-٧

ئیبنوکـەثیر لـە تەفسـیری ئایـەتی یەکـەمدا دەڵـێ: (خـوا رادەگەیـەنێ لـە رۆژی قیامەتدا لەپەیامبەران دەپرسێ داخۆ نەتەوەکانیان چ جۆرە وەڵامێکیان داوەتـەوە.. کە پەیامبـەرانیش دەڵێن: (لاعلم لنا) ئـەوا موجاهیدو حەسـەنی بەسـرایی‌و سـەدی دەڵێـن: لەبـەر ناخۆشـی ئـەو رۆژە وا دەڵێـن... ئیبنوعەباسـیش دەڵـێ: واتـە هیـچ زانیاریەکمان نیە مەگەر ئەوەی کە بەخۆت چاتر دەیزانی.. ئیبنوجەریر گێڕایتیـەوە. پاشان بەخۆشی ئەوەی هەڵبژاردوە، بێگومان وتەیـەکی چاکە، لەخانـەی رێزنواندنـە بۆ خوا. واتە: خوایە! زانیاری ئێمە لەچاو هی تۆ هەرهیچ نیە، ئێمە هـەرچی بیزانین و بیلێین هەر بەکردەوە رواڵەتیەکان ئاگادارین و بە دەرون و ناوەوەیـان ئاگـادار نـین، تۆ بەهـەمو شتێك ئاگـاداری و زانیـاریت بەسـەر هـەمو شتێکدا هەیـە، زانستی ئێمـە لەچاو هی ئێوە هیچ نیە)[1]

﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُـــمْ شَهِيدًا: بەم جۆرە ئێوەمان کردۆتـە نەتەوەیەکی نێوەڕاستی تـا ببنـە شـاهێد لەسەر خەڵکاز و پێغەمبەریش ببێتە شاهێد لەسەر ئێوە﴾البقرة ١٤٣.

ئەبوسەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

---

[1] تفسير ابن كثير (٢/٦٧٦)

((يدعى نوح يوم القيامة فيقول: لبيك وسعديك يارب، فيقول: هل بلغت؟ فيقـــول: نعـــم. فيقال لأمته: هل بلغكم؟ فيقولون: ما أتانا من نذير. فيقول: من يشهد لك؟ فيقول محمد وأمتـــه. فيشهدون أنه قد بلغ، ويكـــــون الرســـول عليكـــم شـــهيدا، فذلـــك قولـــه جـــل ذكـــره ﴿وكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُـــولُ عَلَيْكُـمْ شَهِيـدًا﴾: لەرۆژی قیامەتدا بانگی نوح دەكرێ، دەڵێ: بەڵێ خوایە بەرفەرمانم. پێی دەفەرموێ: پەیامی منت پێڕاگەیاندن؟ دەڵێ: بەڵێ. دەفەرموێتە نەتەوەكەی: پێی ڕاگەیاندون؟ دەڵێن: هەرگیز پێغەمبەرمان بۆ نەهاتوە! بە نوح دەفەرموێ: كێ شاهێدیت بۆ دەدات؟ دەڵێ: موحەممەد و نەتەوەكەی. ئەوانیش شاهێدی بۆ دەدەن و پێغەمبەریش شاهێدی لەسەر ئێوە دەدات. ئەوەیە كە خوا دەفەرموێ: ﴿وكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّـاسِ وَيَكُـونَ الرَّسُـولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾البقرة ١٤٣))[1]

ئیبنوحەجەر لەهەندێ بێژانەوەدا ئەوەندەشی زیاد كردوە: (فيقال: مـــا علمكـــم؟ فيقولون: (أخبرنا نبينا أن الرسل قد بلغوا فصدقنـــاه: پێغەمبەرمان پێی ڕاگەیاندوین كە پێغەمبەران پەیامیان بەخەڵك ڕاگەیاندوە، ئێمەش بڕوامان پێ هێناوە)[2]

زەوی و شەو و ڕۆژیش لەو ڕۆژەدا شاهێدی دەدەن كە چیان تێدا كراوە. پارەو داراییش شاهێدی لەسەر خاوەنەكەی دەدات كە چی پێ كردوە. قورتوبی لە پەرتوكەكەیدا بەناوی (التذكرة) دەروازەیەكی تایبەتی لەبارەی ئەم بابەتەوە تەرخان كردوە، لەوێدا ئەو فەرمودەیەی تیرمذی هێناوەتەوە كە ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە جارێكیان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَـــا: زەوی لە ڕۆژی دواییدا هەواڵ و باسوخواسی خۆی باس دەكات.﴾الزلزلة:٤

---

[1] صحيح البخاري: كتاب التفسير: (١٧١/٨)

[2] فتح الباري (١٧٢/٧)

فەرموی: دەزانن هەواڵی زەوی چیە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن؟ فەرموی: ((فإن اخبارها أن تشهد على كل عبد أو امة بما عمل على ظهرها، تقول: عمل يوم كذا، وكذا وكذا، فهذه أخبارها: هەواڵ و باسوخواسی زەوی ئەوەیە کە هەر کەسێك یان هەر نەتەوەیەك چی لەسەر پشتدا کردوە شاهێدی لەسەر بدات، دەڵێ: فلانە رۆژی ئاوەهات کرد)).[1]

هەروەها فریشتەکانیش شاهێدی دەدەن کە لەدنیادا کردەوەی بەندەکانیان نوسیوە؛

﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ: لەو رۆژەدا هەمو کەسێك ئەو دو فریشتەیەی لەگەڵدا دێن کە لەدنیادا بەنوسینەوەی کردەوەکان تەرخان بون.﴾ق ٢١.

فریشتەکانی تریش شاهێدی لەسەر کردەوەی بەندەکان دەدەن:

﴿وَيَقُولُ الاشْهَادُ هَؤُلآءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ: فریشتەکان دەڵێن ئەوانەبون بڕوایان بەخوا نەدەکرد﴾هود ١٨.

تا ئەگەر بەندەکە لاملی بکات و بکاتە مشتومڕو نەسەلمێنێ، ئەوا خوا هەر لە جەستەی خۆیەوە شاهێدی لەسەر دەدات کە لەپێشتر باسمان لێوە کردوە.

---

[1] قال الترمذي هذا حديث حسن صحيح غريب.

## جێباسی چوارەم

# ئەو شتانەی بەندە پرسیاری لێ دەکرێ

لەرۆژی قیامەتدا پرسیار لە بەندەکان دەکرێ ئاخۆ چیان پەرستوە؟ چ وەلامێکیان داوەتەوە پەیامبەران؟ کە ئەو بابەتەمان لەپێشتردا باس کردوە. پرسیاریان لێدەکرێ کردەوەکانیان چۆن بوە؟ پرسیار لە خۆشگوزەرانیان دەکرێ، پرسیاریان لەبارەی بەڵێن و پەیمانەکانیان لێدەکرێ، لەبارەی بەهرەی چاو و گوێ لێیان دەپرسرێتەوە، لەم جێباسەدا ئەم بابەتانە دەتوێژینەوە.

### ١- بێبڕوایی‌و هاوبەشپەرستی:

مەزنترین پرسیاری لێپرسینەوە لەبارەی بێبڕوایی‌و هاوبەشپەرستیەوەیە، پرسیاریان لێدەکرێ لە بارەی ئەو هاوبەش و هاوەڵانەی کە بۆ خوایان بڕیار دابو، هەروەکو خوا دەفەرموێ:

﴿وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ، مِنْ دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنْصُرُونَكُمْ أَوْ يَنْتَصِرُونَ: پێیان دەوترێ: کوا ئەو بەناو خوایانەی دەتانپەرستن؟ ئاخۆ دەتوانن کۆمەکیتان بکەن؟ یاخۆ دەتوانن کۆمەکی خۆیان بکەن؟!﴾الشعراء ٩٢-٩٣

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنْتُمْ تَزْعُمُونَ: خوا بانگیان دەکات و پێیان دەڵێ: کوا ئەو هاوبەشانەی پێتان وابو لەگەڵ مندا خوایەتی دەکەن؟﴾القصص:٦٢.

لە بارەی ئەو سەرگەرد و قوربانیانەش پرسیاریان لێدەکرێ کە بە بتەکانیان دەبەخشی یان بەناوی بتەکانیانەوە ئاژەڵیان دەکردە قوربانی:

﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لاَ يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَاهُمْ تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ﴾النحل:٥٦.

**لەم بارەوەش لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ کە بڕوایان بە پێغەمبەران نەکردوە:**

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ. فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ الانبَاء يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَاءلُونَ: **لە ڕۆژی قیامەتدا خوا بانگیان دەکات و لێیان دەپرسێ: چ وەڵامێکتان داوەتەوە پێغەمبەران. ئینجا وەڵام و باسوخواسی بەسودیان بزر دەبێ‌و لە ڕزگار بون بێهومێد دەبن هەر بۆیەشە بۆ وەڵام لە یەکتری ناپرسن.**﴾القصص: ٦٥-٦٦.

**٢- کردەوەکانی لەدنیادا:**

**لە ڕۆژی قیامەتدا مرۆڤ لە بارەی هەمو کردەوەکانیدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ:**

﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ. عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ: **سوێند بە پەروەردگارت لەگەڵ هەمویاندا لێپرسینەوە دەکەین کە چییان کردوە**﴾ الحجر:٩٢.

﴿ فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ: **هەڵبەت لەگەڵ ئەوانەی پەیامبەریان بۆ هاتوەو لە گەڵ پێغەمبەرانیش لێپرسینەوە دەکەین** ﴾ الأعراف:٦.

**لە سونەنی تیرمذیدا لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

**((لا تزول قدما عبد يوم القيامة حتى يسأل عن أربع؛ عن عمره فيما أفناه وعن علمه ماذا عمل به وعن ماله من أين اكتسبه وفيم أنفقه وعن جسمه فيم أبلاه: مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا تا چوار پرسیاری لەگەڵدا نەکرێ گوزەر ناکات: لە بارەی تەمەنەکەی ئاخۆ لە چی رابردوە؟ لە بارەی زانستەکەی ئاخۆ چ کارێکی پێکردوە؟ لەبارەی ماڵ و داراییەکەی ئاخۆ چۆنی وەدەستهێناوە و چۆنی خەرج کردوە؟**

لەبارەی جەستەکەی ئاخۆ لە چی ڕزاندوە؟))[1].

هەر لە سونەنی تیرمذیدا لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((لا تزول قدما ابن آدم يوم القيامة من عند ربه، حتى يسأل عن خمس: عن عمره فيم أفناه وعن شبابه فيم ابلاه وعن ماله من أين اكتسبه وفيم أنفقه وماذا عمل فيم علم: مرۆڤ لە لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەتدا تا پێنج پرسیارانی لێ نەکرێ ئەوێ جێناهێڵێ: لەبارەی تەمەنەکەی لە چی بەسەر بردوە؟ لە بارەی گەنجیەکەی لەچی بەکار بردوە؟ لەبارەی ماڵەکەی لە کوێی پەیدا کردوەو لە چی خەرج کردوە؟ لە بارەی زانستەکەی چی پێکردوە؟))[2].

ئەگەر یەکێك لەم فەرمودانە ڕامێنێ و بیر بکاتەوە ئەوجا دەزانێ پێغەمبەر ﷺ بۆچی هانی موسڵمانانی داوە دنیا بە کەم بگرن و ماڵ و پارەی فرە کۆنەکەنەوە، چونکە هەرچەندی ماڵی زۆر بێ لێپرسینەوەی سەختترو درێژترە، بە پێچەوانەوەش هەرچەندی ماڵی کەمتر بێ لێپرسینەوەکەی زوتر دەبڕێتەوەو دەچێتە بەهەشت.

پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە کۆچەرە هەژارەکان چل ساڵ پێشی دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشت.

ئەبو عەبدوڕڕەحمانی حوبلی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: سێ کەس هاتنە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص و منیش لەوێ بوم. گوتیان: ئەبو موحەممەد! بەو خوایە دەستمان هەند کورتە هیچمان پێناکرێ نەدەتوانین خەرجی ماڵەوە بدەین نە دەتوانین وشترێك بکڕین نەدەتوانین شتێکی خۆش یان کەلوپەلێکی باش بکڕین. ئەویش گوتی، ئەوجا چ دەڵێن واتان بۆ دەکەین، ئەگەر پاشان سەردانمان

---

[1] جامع الأصول: (١٠/٤٣٦) ژمارە (٧٩٦٩)، وقال المحقق: قال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح. وكذا رمز له الشيخ ناصر بالصحة في صحيح الجامع: (٦/١٤٨) ژمارە: (٧١٧٧).

[2] جامع الأصول: (١٠/٤٣٧) ژمارە (٧٩٧٠)، وهو حديث حسن كما قال محقق جامع الأصول. وقد حسنه الشيخ ناصر في صحيح الجامع: (٦/١٤٨)، ژمارە (٧١٧٦).

دەکەنەوە ئەوەندەی خوا بکاتە قسمەت دەتاندەینێ. ئەگەر دەتانەوێ باسی حاڵ و ژیوارتان بۆ لای سوڵتان دەنێرین، یان ئەگەر ئارامیش دەگرن باشتر چونکە گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:

((ان فقراء المهاجرين يسبقون الأغنياء يوم القيامة إلى الجنة أربعين خريفاً: کۆچەرە هەژارەکان لە ڕۆژی قیامەتدا چل ساڵ زوتر پێشی دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشتێ))[1]

٣) خۆشگوزەرانی:

خوا هەر بەخشش و بەهرەو خۆشگوزەرانیەکی بە بەندە بەخشیبێ لە ڕۆژی قیامەتدا پرسینەوەی لەگەڵدا دەکات، خوا دەفەرموێ:

﴿ثم لتسئلن يومئذ عن النعيم: هەڵبەت لە ڕۆژی قیامەتدا لەبارەی بەهرەو بەخشەکانی خواوە پرسینەوەتان لەگەڵدا دەکریێ﴾التكاثر: ٨.

بەهردو بەخشش واتە: تێری، ئاوی سارد، خانو، لەش و لاری ڕێك، نوستنی بە چێژ سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: تەنانەت خواردنی هەنگوینیش. موجاهید دەڵێ: هەمو چێژێکی دنیا. حەسەنی بەسرایی دەڵێ: خواردنی بەیانیو ئێوارانیش لە خانەی بەهرەو بەخششدایە. ئەبو قولابە دەڵێ: خواردنی ڕون و هەنگوین بە نانی چاك ئەویش هەر بەهرەو بەخششە. لە ئیبنو عەبباسیش دەگێڕنەوە وتویەتی: بەهرەو بەخشش لەش و چاو و گوێ ساغیە.[2]

هەمو ئەو تەفسیرانە کە بۆ وشەی بەهرەو بەخشش کراوە بە وێنە هێنانەوەی چەند جۆرێکە ئەگینا بەهرەو بەخششەکانی خوا هێند زۆرن کە قەت ناژمێردرێن:

﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا: ئەگەر بتانەوێ بەهرە و بەخششەکانی خوا

---

[1] صحيح مسلم: (٤/٢٢٨٥) ژمارە (٢٩٧٩).

[2] تفسير ابن كثير: (٧/٣٦٤).

هەڵژمێرن بۆتان ناژمێردرێ﴾إبراهيم: ٣٤.

هەندێ بەهرەو بەخشش هەن بۆ مرۆڤ زەرورییەو هەندێکیتر بۆ پتر خۆشگوزەرانیە، خەڵکیش بە پلە و جۆری جیاواز بەهرەمەندن. لە هەندێ سەردەمدا جۆرە بەهرەو بەخششی وا هەیە لە سەردەمەکانی تردا نیەو لە هەندێ وڵاتدا هەیە لە وڵاتیتردا نیە.. ئەمانە هەموی لێپرسینەوەیان لەسەر دەکرێ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویە:

((إن أول ما يحاسب العبد عنه يوم القيامة من النعيم أن يقال له ألم نصحّ لك جسمك؟ ونروّك من الماء البارد؟: یەکەمین پرسیاری بەخشش لەبەندە بکرێ ئەوەیە: ئەدی تەندروستیم پێنەدابوی؟ ئەدی ئاوی ساردم پێنەدابوی؟)) [1].

بەڵام خەڵکی وا هەیە هەست بە بەهرەو بەخششەکانی خوا ناکات، هەست بە بەخششی ئاو و خواردن و خانو و ژن و منداڵ و شتیتر ناکات، وا تێدەگات بەهرەمەندی و بەخششداری ئەوەیە کە کۆشك و باڵاخانەو باخچەو بیستان و بەلەم و ترومبێلی هەبێ!.

جارێکیان پیاوێك هاتە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص و لێی پرسی: ئەرێ منیش لە کۆچەرە هەژارەکان نیم؟ پێی گوت: ژنت هەیە؟ گوتی: بەڵێ: پێی گوت: خانوت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، پێی گوت: دەنا دەوڵەمەندی. گوتی خزمەتکارێکیشم هەیە. پێی گوت کەواتە پاشای. [2]

هەروەها لە موسنەدی ئەحمەددا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((نعمتان مغبون فيها كثير من الناس الصحة والفراغ: دو بەهرەو بەخشش هەن خەڵك لێیان کەمتەرخەمە و سوپاسگوزاری ناکەن و ئەرکەکانی بەجێ ناگەیەنن، کە لەشساغیو دەستبەتاڵیە)) [3].

---

[1] رواه الترمذي . مشكاة المصابيح: (٢/٦٥٦) ژمارە (٥١٩٦) وقال محقق المشكاة: اسناده صحيح.

[2] صحيح مسلم: (٤/٢٢٨٥) ژمارە (٢٩٧٩).

[3] رواه البخاري، مشكاة المصابيح: (٢/٦٤٨) ژمارە: (٥١٥٥).

هەروەها لە موسنەدی ئەحمەددا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((لا بأس بالغنى لمن اتقى الله ﷻ والصحة لمن اتقى الله خير من الغنى وطيب النفس من النعيم: چی تێدا نیە گەر پارێزکارێك دەوڵەمەند بێ، بەڵام لەشساغی بۆ پارێزکاران باشترە، ئاخی خۆش و ئارامیش بەهرەو بەخششە)) [1].

پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ فەرمودەدا دیمەنی ئەو لێپرسینەوەمان بۆ دەخاتە بەرچاو کە خوا چۆن چۆنی پرسیار لە بەهرەکان دەکات؟

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((يلقى (الرب) العبد فيقول: أي فلُ، ألم أكرمك وأسودك وأزوجك وأسخّر لك الخيل والإبل وأذرك ترأس وتربع؟ فيقول: بلى، قال: فيقول: أفظننت أنك ملاقيَّ؟ فيقول لا، فيقول فإني أنساك كما نسيتني.

ثم يلقى الثاني فيقول: أي فلُ، ألم أكرمك وأسودك وأزوجك وأسخّر لك الخيل والإبل وأذرك ترأس وتربع؟ فيقول: بلى أي رب. فيقول: أفظننت أنك ملاقيَّ؟ فيقول: لا. فيقول فإني أنساك كما نسيتني.

ثم يلقى الثالث فيقول له مثل ذلك. فيقول: يا رب، آمنت بك وبكتابك وبرسلك وصليت وصمت وتصدقت، ويثني بخير ما استطاع. فيقول: ههنا إذن.

قال ثم يقال له: الآن نبعث شاهدنا عليك، ويتفكر في نفسه من ذا يشهد علي؟ فيختم الله على فيه، ويقال لفخذه ولحمه وعظامه انطقي فتنطق فخذه ولحمه وعظامه بعمله، وذلك ليعذر من نفسه. وذلك المنافق الذي يسخط الله عليه: بەندە بە دیداری خوا دەگات تا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات، خوا پێی دەڵێ: ئەدی ڕێزم لێنەنای؟ ماڵ و سامان و ژن و خێزانم پێنەبەخشی؟ ئەسپ ومایین و وشترم بۆ رام نەکردی؟ نەمکردیە خاوەن زەوی‌و زارو خانو؟ لە بەخششەکانی من بەهرەمەند نەبوی؟ دەڵێ: بەڵێ. خوا دەفەرموێ: پێت وابو پێم دەگەی؟ دەڵێ:

---

[1] مشكاة المصابيح: (٢/٦٧٦)، ژمارە (٥٢٩٠) وعزاه المحقق الى ابن ماجة وقال: اسناده صحيح.

نەخێر. خواش پێی دەڵێ: چۆن ئەتو منت لەبیر چوبو و نەتدەناسیم ونەتدەپەرستم. منیش تۆ لەبیر خۆم دەبەمەوە.

پاشان کەسی دوەم و سێیەمیش هەمان پرسیاریان لێدەکات، حاڵی دوەم وەکو هی یەکەمە، بەڵام هی سێیەم دەڵێ: پەروەردگار! بڕوام بە تۆو بە پەرتوك و پەیامبەرانت هەبو، نوێژ و ڕۆژو و زەکاتم جێبەجێ کردوە، چەندی پێی دەکرێ بەخۆیدا هەڵدەڵێ. خوا پێی دەفەرموێ: دە بوەستە ئێستا گەواهیدەرت بۆ دێنم، ئەویش لە دڵی خۆیدا دەڵێ: دەبێ کێ گەواهیم لەسەر بدات؟. ئەوجا مۆر لە دەمی دەدرێت و دەمبەست دەبێ پاشان فەرمان بە ڕان و گۆشت و ئێسقانەکانی دەکرێ قسە بکەن. ئەوانیش هەرچی کردویە ئاشکرای دەکەن، بۆیە ئەندامەکانی خۆی گەواهی لێدەدەن تا هیچ پاساو و پۆزشی نەمێنێ. ئەو کەسە دوڕوێکە، خوا خەشمێکی توندی لێ دەگرێ))[1].

مەبەست لە لێپرسینەوەی بەخشش و بەهرەکان ئەوەیە کە داخوە لە پای ئەو بەهرانەدا سوپاسی خوای کردوە یان نا؟ ئەگەر سوپاسی کردبێ ئەرکی خۆی بەجێهێناوە؟... بەڵام ئەگەر سوپاسی خوای نەکردبێ ئەوا خوا لێی توڕە دەبێ ئەنەس دەگێڕێتەوە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((إن الله ليرضى عن العبد أن يأكل الأكلة فيحمده عليها أو يشرب الشربة فيحمده عليها: خوا لەو بەندەیە خۆشنود دەبێ ئەگەر نان بخوات سوپاسی خوا بکات، ئەگەر ئاو بخواتەوە سوپاسی خوا بکات))[2].

٤) بەڵێن وپەیمان:

خوا لەو پەیمانانەش دەپرسێتەوە کە بەندەکان بە خوایان داوە:

﴿وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِنْ قَبْلُ لاَ يُوَلُّونَ الأَدْبَارَ وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْئُولاً:

[1] رواه مسلم في صحيحه: (٤/٢٢٨٠) ژمارە (٢٩٨٦).

[2] رواه مسلم. مشكاة المصابيح: (٤/٤٤٦) ژمارە (٤٢٠٠).

**لەپێشتر بەڵێنیان دا ئەمجارە رو لە جیهاد وەرنەگێڕن و بەشداری بکەن. ئاگاداربن خوا لە پەیمان دەپرسێتەوە**﴾ الأحزاب: ١٥.

**ئەگەر بەڵێنێك رەوا بێت ئەوا خوا لە ئەمەكداری بەندەكان دەپرسێتەوە ئاخۆ جێبەجێیان كردوە یان نا:**

﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً: **پەیمانەكانتان بەجێ بێننن چونكە خوا لە بەڵێن و پەیمانتان دەپرسێتەوە**﴾ الإسراء: ٣٤.

## ٥- چاو وگوێ و دڵ:

**خوا لە هەمو وتەیەك دەپرسێتەوە بۆیە وریامان دەكاتەوە لە خۆڕا بەبێ زانست قسەو بڕیاران نەدەین.**

﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً: **ئەگەر زانیاریت لەبارەی شتێكەوە نەبو قسەو بڕیاری لێمەدە، چونكە چاو و گوێ و دڵ هەر هەمویان بەرپرسیارن** ﴾ الإسراء: ٣٦

**قەتادە دەڵێ:** ((**كە نەتدیوە مەڵێ دیومە، كە گوێت لێنەبوە مەڵێ بیستومە، كە نەتزانیوە مەڵێ زانیومە، چونكە لە هەر هەمو ئەوانەت لێ دەپرسێتەوە**))[1].

**ئبنو كەثیر دەڵێ: پوختەی لێكدانەوەكانی ئەم ئایەتە ئەوەیە كە خوا بەرهەڵستی لە قسە كردنی بێ زانست كردوە كە بریتیە لە گومان و گومانیش لێكدانەوەی لە خۆڕا و خەیاڵە. وەكو خوا دەفەرموێ:**

﴿اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنْ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ: **خۆتان زۆر لە گومان بپارێزن چونكە هەندێ گومان هەیە گوناحە**﴾الحجرات:١٢.

**لە فەرمودەشدا هاتوە:** ((إياكم والظن فان الظن أكذب الحديث: **دور بن لە گومان ،**

---

[1] تفسير ابن كثير: (٤/٣٠٨).

چونکه گومان درۆزنترین وتەیە)).

لە سونەنی ئەبو داودیش هاتوە خراپترین چارەوێی (سواری) مرۆڤ وشەی ((وا دەڵێن))ە.

لە فەرمودەیەکی‌تردا هاتوە: ((إن أفرى الفرى أن يري الرجل عينيه ما لم يراه: خراپترین قسە هەڵبەستان ئەوەیە بڵێ بینیومە و نەیدیبێ))[1]

لە فەرمودەی صەحیحیشدا هاتوە: ((من تحلم حلماً كُلِّفَ يوم القيامة أن يعقد بين شعرتين وليس بفاعل: ئەوەی بە درۆ خەونێك هەڵبەستێ لەڕۆژی قیامەتدا دەڵێن: دەی ئەو دو تاڵەموە گرێ بدە کە قەت پێشی ناکرێ))

## جێباسی پێنجەم

## یەکەمین ئەو کردەوەیەی لێپرسینەوەی لەبارەدا دەکرێ

یەکەمین کردەوە بەندەی پێ بەرپرس بکرێ نوێژە، ئەگەر نوێژەکانی بە پوختەیی کردبێ ئەوا رزگاری دەبێ ئەگینا خەسارەتمەندو دۆڕاو دەردەچێ. ئەبو هوەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((إن أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة من عمله صلاته، فإن صلحت فقد أفلح وأنجح، وإن فسدت فقد خاب وخسر، فإن انتقص من فريضته شيئاً قال الرب تبارك وتعالى: انظروا هل لعبدي من تطوع فيكمل بها ما انتقص من الفريضة، ثم يكون سائر عمله على ذلك: لە رۆژی قیامەتدا یەکەمین کردەوە کە بەندەی پێ بەرپرسیار بێ نوێژە. ئەگەر

---

[1] بوخاری گێراویەتەوە. اقتران النيرين ب:٥ ، ل: ١٧١.

[2] تفسير ابن كثير: (٣٠٨/٤).

نوێژەکەی بە پوخت و جوانی بەجێ گەیاندبێ رزگاری دەبێ و دەباتەوە، بەڵام ئەگەر بە نارێکی ئەنجامی دابێ ئەوا دەدۆڕێو دەفەوتێ. ئەگەر نوێژە فەرزەکانی کەموکورتی تێدابێ خوا دەفەرموێ: تەماشا بکەن ئەگەر نوێژی سوننەتی هەبێ کەم و کورتیەکەی بۆ پڕ بکەنەوە، پاشان کردەوەکانی‌تری دەخرێتە بەر پرسیاران)) .

هەمدیسان ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((إن أول ما يحاسب الناس به يوم القيامة من أعمالهم الصلاة، قال: يقول ربنا ﷻ لملائكته: انظروا في صلاة عبدي، أتمها أم نقصها؟ فإن كانت تامة كتبت له تامة، وإن كان انتقص منها شيئا، قال: انظروا هل لعبدي من تطوع، فإن كان له تطوع، قال: أتموا لعبدي فريضته من تطوعه، ثم تؤخذ الأعمال بعد ذلك: لە ڕۆژی قیامەتدا یەکەمین کردەوە کە بەندەی پێ بەرپرسیار بێ نوێژە، خوا بە فریشتەکانی دەڵێ: تەماشای نوێژەکانی بکەن ئەگەر بە تەواوی و بەبێ کەموکوڕی ئەنجامی داوە؟ ئەگەر وابێ بە تەواوی بۆی دەنوسرێ . بەڵام ئەگەر وانەبو دەفەرموێ بزانن نوێژە سوننەتەکانی هەیە. ئەگەر هەیەتی بۆی پڕ بکەنەوە، ئینجا دوای ئەوە کردەوەکانی تری دەخرێتە بەر پرسینەوە)).

---

لە سونەنی تیرمذیو نەسائیدایە؛ جامع الأصول: (١٠/٤٣٥) ورقمه: ٧٩٦٥، وعزاه الشيخ ناصر في صحيح الجامع الى ابي داود والنسائي وأحمد والحاكم. وقال فيه: صحيح. صحيح الجامع: (٢/٣٥٢) ورقمه ٢٥٦٨.

جێباسی شەشەم

# چەشنەكانی لێپرسینەوەو نمونەیان

## خوازگەی یەكەم

## چەشنەكانی لێپرسینەوە

لێپرسینەوەی بەندەكان جۆراو جۆرە، بێبڕاو تاوانكارەكان ئەوانەی شركیان بۆ خوا بڕیارِ داوە و لە شەرعی خوا یاخی بونە و بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێناوە لێپرسینەوەیان تا بڵێی سەخت و دژوارە. هەروەها هەندێ بڕواداری گوناحباریش هەن كە بەهۆی گوناحەكەیانەوە لێپرسینەوەی دورو درێژیان لەگەڵدا دەكرێ.

هەندێ بەندەی تر هەن بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت كە كۆمەڵێكی دیاریكراون و لە حەفتا هەزار تێناپەڕن، ئەو جۆرە كەسانە بژاردەی ئەم نەتەوەیەن و پێشەنگی هەرە بەرزی بڕوا و پارێزكاریو چاكیو جیهادن، كە دەگەینە باسی بەهەشتیەكان ئاكارو ڕەوشتی ئەو جۆرە كەسانە باس دەكەین.

بەندەی تر هەیە لێپرسینەوەیەكی ساناى لەگەڵدا دەكرێ و لێكۆڵینەوەو لێپێچانەوەی لەگەڵدا ناكرێ، بەڵكو هەر ئەوەندەیە كە كردەوەكانی بۆ ڕادەنوێنرێتەوەو پێی نیشان دەدرێتەوە پاشان خوا لێی خۆش دەبێ. ئەمەیە واتای ئەم ئایەتەی كە دەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا: هەر كەسێك كارنامەكەی بە دەستی ڕاست وەرگرێتەوە لێپرسینەوەیەكی سوك و ئاسانی لەگەڵدا دەكرێ﴾الإنشقاق: (٧-٨).

خاتو عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ليس أحد يحاسب يوم القيامة إلاّ هلك: هەر کەسێك لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ دەفەوتێ)).

منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەدی خوا نافەرموێ:

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾

فەرمووی: ((إنما ذلك العرض وليس أحد يناقش الحساب يوم القيامة إلا هلك: ئەو لێپرسینەوەیە تەنها ڕانواندنی کردەوەکانە نەك لێپێچانەوەو لێکۆڵینەوە؛ چونکە ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ دەفەوتێ))[1].

نەوەوی لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ: (نوقش الحساب واتە بەدواداچون و لێپێچانەوە. ئەلقاضی دەڵێ وتەی (عُذِّب) دو واتای هەیە، یەکەم: لێپێچانەوەو ڕانواندنی گوناهەکان و هەڵوەستە لەبەردا کردنی کە خۆی لە خۆیدا سزاو ئەشکەنجەیە چونکە سەرکۆنە و گازاندەی تێدایە. دوەم: دەبێتە مایەی دوچاربونی سزای ئاگری دۆزەخ. لە بێژانەوەیەکی تردا لەجیاتی وشەی (هلك) وشەی (عذّب)ی هێناوە. ئەمە وتەی ئەلقاضی بو.

نەوەوی دەڵێ: هی دوەمیان ڕاستە واتاکەشی ئەوەیە زۆربەی بەندەکان کەمتەرخەمییان هەیە، جا ئەوەی لێپێچانەوەی لەگەڵدا بکرێ و خوا لێی خۆش نەبێ ئەوا دەچێتە دۆزەخ، بەڵام خوا ئەگەر بیەوێ لە هەمو تاوان و گوناهێکی خوار شیرك خۆش دەبێ)[2].

ئیبنو حەجەر وتەیەکی قورتوبی لەبارەی (إنما ذلك العرض)دا دەهێنێتەوەو دەڵێ: (ئەو لێپرسینەوەیەی لە ئایەتەکەدا هاتوە بریتیە لە ڕانواندنی کردەوەکان تا بەندە بزانێ کە خوا لە دنیادا دایپۆشیوە و لە ئاخیرەتیشدا لێیبەخشیوە)[3].

وەکو لەم فەرمودەو وتانە دەردەکەوێ ڕانواندنی گوناهەکان بۆ ئەوەیە بڕوادارەکە بزانێ خوا چ بەخششێکی لەگەڵدا کردوە کە لێی خۆشبوە.

---

[1] صحيح بخاري. كتاب الرقاق باب من نوقش الحساب عذب. فتح الباري: (١١/٤٠٠). صحيح مسلم: (٤/٢٢٠٤)ژمارە (٢٨٧٦) واللفظ للبخاري.

[2] النووي على مسلم: (١٧/٢٠٨).

[3] فتح الباري: (١١/٤٢٠).

## خوازگەی دووەم

# بۆ هەر یەکەیان وێنەیەك

لە سوونەتدا زۆر فەرمودە هەن باسی دیمەنی لێپرسینەوەو رانواندن و سەرکۆنەکانیان کردوە کە خوا لە گەڵ بەندەکانیدا دەیکات، لێرەدا بۆ هەر یەك لەم سێ دیمەنەدا دیمەنێك دەخەینە ڕو کە لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە:

۱) گفتوگۆی ریاکاران:

موسلیم و تیرمذی و نەسائی لە شەفی کوڕی ماتعی ئەصبەحی ﷺ دەگێڕنەوە کە جارێکیان (شەفی) دەچێتە شاری مەدینە و پیاوێك دەبینێ خەڵکی لە دەوردا کۆبونەتەوە پرسی: ئەوە کێیە؟ گوتیان ئەبو هورەیرەیە، دەڵێ منیش لێی نزیك بومەوە تا چومە بەردەستی و دانیشتم، قسەی بۆ خەڵك دەکرد کە تەواو بو و خەڵك هەڵسان پێم گوت: تو ئەو خوایە ئەگەر فەرمودەیەکی وام بۆ نەگێڕیەوە خۆت لێی فامی بیو زانیبێت. ئەبو هورەیرە گوتی: باشە. فەرمودەیەکی ئاوەهات بۆ دەگێڕمەوە. پاشان ئەبو هورەیرە ﷺ کردیە گریان و ئەوەندە گریا تا بورایەوە، ماوەیەك چاوەڕێ بوین تا وەخۆ هاتەوە، پاشان گوتی: فەرمودەیەکت پێ‌دەڵێم کە لەم خانوەدا پێی فەرموم و جگە لە خۆم و خۆی کەسی‌تر ئامادە نەبو. پاشان دایە قوڵپی گریان و ئەوەندە گریا تا بورایەوە، ئینجا کە ژێر بۆوە دەموچاوی خۆی هەڵگلۆفی‌و پاشان گوتی: باشە فەرمودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەم خانوەدا بۆی فەرموم کە جگە لە خۆم و خۆی کەسی تری لێنەبو، ئەمجارەیان زۆر بە کوڵ گریا تا لە خۆ چو و روەوڕو کەوتە سەر زەوی، ماوەیەکی زۆر دەستم وەبەر سەری نابو و رامگرتبو تا بە خۆ هاتەوە، ئینجا گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((أن الله إذا كان يوم القيامة ينـــزل إلى العباد ليقضي بينهم وكل أمة جاثية، فأول من يدعـو به رجل جمع القرآن، ورجل قتل في سبيل الله، ورجل كثير المال، فيقول الله للقارئ: ألم أعلمـــك ما أنزلت على رسولي؟ قال: بلى يا رب، قال: فماذا عملت فيما علمت؟ قال: كنت أقــوم بـــه آناء الليل وآناء النهار، فيقول الله له: كذبت، وتقول له الملائكة: كذبت، ويقول الله لـــه: بـــل أردت أن يقال إن فلانا قارئ، وقد قيل ذلك.

ويؤتى بصاحب المال فيقول الله: ألم أوسع عليك، حتى لم أدعك تحتاج إلى أحد؟ قال: بلى يـــا رب، قال: فماذا عملت فيما آتيتك؟ قال: كنت أصل الرحم وأتصدق، فيقول الله له: كذبـــت، وتقول له الملائكة: كذبت، ويقول الله: بل أردت أن يقال فلان جواد، فقيل ذلك.

ثم يؤتى بالذي قتل في سبيل الله، فيقول الله: في ماذا قتلت؟ فيقول: أمرت بالجهاد في ســبيلك فقاتلت حتى قتلت، فيقول الله له: كذبت، وتقول له الملائكة: كذبت، ويقول الله: بـــل أردت أن يقال فلان جريء، فقد قيل ذلك.

ثم ضرب رسول الله ﷺ على ركبتي فقال: يا أبا هريرة، أولئك الثلاثة أول خلق الله تســـــعر بهم النار يوم القيامـــة: **لە ڕۆژی قیامەتدا خوا دادەبەزێ تا دادگایی بەندەکان بکات، هەمو خەڵك لەبەر پەرژەنگی ئەو ڕۆژە ئەژنۆی شکاوەو لەسەر چۆك کەوتوە، یەکەمین کەس کە بانگ دەکرێ: پیاوێکە تەواوی قورئانی لەبەر کردوە، دوەم کەس پیاوێکە لە جیهادی ڕێی خوا کوژراوە، پیاوی سێیەم: دەوڵەمەندێکە.**

**بە قورئانخوێنەکە دەڵێ: ئەوەی بۆ پێغەمبەرم ناردبو فێرم کردی؟ دەڵێ: بەڵێ خوایە. دەفەرموێ: چت بەو زانیاریە کرد؟ دەڵێ: لە هەناوی شەوان و ڕۆژی ڕۆژگاران دەمخوێندەوە. دەفەرموێ: درۆت کرد. فریشتەکان دەڵێن درۆت کرد، خوا دەفەرموێ: بۆ ئەوەت خوێندۆتەوە تا پێت بڵێن قورئانخوێنێکی چاکە، ئەوەشیان پێ وتی.**

**دەوڵەمەندەکە بانگ دەکەن، خوا پێی دەفەرموێ: دەوڵەمەندم نەکردی؟ وام نەکرد پێویستیت بە هیچ کەس نەبێ؟ دەڵێ: بەڵێ خوایە. دەفەرموێ: چت پێکرد؟ دەڵێ: یارمەتی خزمانم داوە و سەردانم کردونەو خێرم پێکردوە. خوا دەفەرموێ:**

درۆت کرد، فریشتەکانیش دەڵێن: درۆت کرد، پێی دەفەرموێ: بۆ ئەوەت بو تا پێت بڵێن مەردانەیە، واشیان پێ گوتی.

پاشان کوژراوەکە دێنن. خوا لێی دەپرسێ: لە پێناو چ کوژرای؟ دەڵێ: لە پێناو تۆ جیهادم کردوە تا کوژرام. پێی دەفەرموێ: درۆت کرد، فریشتەکانیش دەڵێن درۆت کرد. خوا پێی دەفەرموێ: بۆ ئەوەت بو تا پێت بڵێن پیاوێکی ئازایە ئەوەشیان پێ گوتی.

کە پێغەمبەر ﷺ لە وتەکانی بۆوە دەستی خستە سەر ئەژنۆکانم و فەرموی: ئەو سێکەسە یەکەمین کەسن کە ئاگری دۆزەخیان پێ خۆش بێ)).[1]

وەلید؛ ئەبو عوسمانی مەدائنی دەڵێ: عوقبەی کوڕی موسلیم هەواڵی پێدام کە (شەفی) خۆی چوەتە لای موعاویەو ئەو فەرمودەیەی بۆ گێڕاوەتەوە.

ئەبو عوسمان دەڵێ: ئەلعەلائی کوڕی ئەبو حەکیم پێی وتم: (شمشێر بەدەستی معاویە بووە، پیاوێك هات بۆ لای و ئەو فەرمودەی لە ئەبو هورەیرەوە بۆ گێڕاوەیەوە، جا موعاویە گوتی: ئەوانە وایان لێبکرێ ئاخۆ خەڵکیتر چی بەسەر بێ؟ پاشان موعاویە هەند بە کوڵ گریا گوتمان دەمرێ، وە گوتمان ئەو پیاوە خراپەی هێناوە، پاشان بەخۆ هاتەوەو دەموچاوی خۆی هەڵگلۆفیو گوتی: خواو پێغەمبەری خوا راست دەفەرمون:

﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: ئەوانەی ژین و جوانکاری دنیایان دەوێت هەر لە دنیادا پاداشتیان دەدەینەوە بێئەوەی هیچیان لێکەم بکەینەوە. بەڵام ئەو جۆرە کەسانە لە ژیانەوەدا جگە لە ئاگر بەشیتریان نیە و هەرچی کردویانە پوکەڵ دەبێتەوەو ئەوەی دەیکەن پوکاوەیە﴾هود:١٥-١٦).[2]

---

[1] رواه مسلم والترمذي والنسائي.

[2] أخرجه الترمذي

لە گێڕانەوەی موسلیم و نەسائیدا سلێمانی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوەو دەڵێ: خەڵك لە دەوری ئەبو هورەیرە بڵاوەیان کردو ڕۆیشتن. ناتلی برای شامیەکان گوتی: یا شێخ فەرمودەیەکم بۆ بگێڕەوە کە بە خۆت لە پێغەمبەرت گوێ لێ بوبێ. دەڵێ: بەڵێ گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:

((إن أول الناس يقضى يوم القيامة عليه رجل استشهد، فأتي به، فعرفه نعمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: قاتلت فيك حتى استشهدت، قال: كذبت ولكنك قاتلت لأن يقال جريء فقد قيل، ثم أمر به فسحب على وجهه، حتى ألقي في النار.

ورجل تعلم العلم وعلمه وقرأ القرآن، فأوتي به، فعرفه نعمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: تعلمت العلم وعلمته وقرأت فيك القرآن، قال: كذبت ولكنك تعلمت العلم ليقال عالم وقرأت القرآن ليقال هو قارئ، فقد قيل، ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار.

ورجل وسع الله عليه وأعطاه من أصناف المال كله، فأتي به، فعرفه نعمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: ما تركت من سبيل تحب أن ينفق فيها إلا أنفقت فيها لك، قال: كذبت ولكنك فعلت ليقال هو جواد، فقد قيل، ثم أمر به فسحب على وجهه ثم ألقي في النار)).[1]

**٢) ڕانواندن(عرض)ی گوناحان:**

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ بەخۆم گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:**

((إن الله يدني المؤمن، فيضع عليه كنفه ويستره، فيقول: أتعرف ذنب كذا، أتعرف ذنب كذا؟ فيقول: نعم أي رب، حتى إذا قرره بذنوبه، ورأى في نفسه أنه هلك، قال: سترها عليك في الدنيا وأنا أغفرها لك اليوم، فيعطى كتاب حسناته.. وأما الكافر والمنافقون فيقول الأشهاد ﴿هَـؤُلاَءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلاَ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾:

**لە ڕۆژی قیامەتدا موسڵمان لە خوای خۆی نزیك دەبێتەوە بەڕەنگێکی وا خوا لە**

---

[1] واتاکەی هەمان واتای فەرمودەی پێشترە. وەرگێڕ-

پەنای خۆیدا دالدەی دەدات و لە پەنای پەردەی میهرەبانی خۆیدا دەیپۆشێ، تا خەلکی دەشتی مەحشەر چاویان لێ نەبێ، ئەوجا خوا یەك یەك گوناحەکانی بۆ رادەنوێنێ‌و پێی دەسەلمێنێ، پێی دەلێ: ئەو گوناحەت کردوە؟ بەندەکەش هەمو جارێ دەلێ: بەلێ کردومە، ئیتر بەندەکە دەترسێ‌و لە دلی خۆیدا دەلێ: تازە فەوتام بەلام خوا دەفەرموێ: مەترسە! من لە ژیندا ئەو گوناحانەم بۆ پۆشی ئەورۆکەش لێت خۆش دەبم، پاشان کارنامەی کردەوە باشەکانی دەدەنە دەست، ئەمەیە حالی موسلمان.

بەلام حالی بێبڕواو دوڕوەکان لەبەر چاوی ئەو هەمو گەواهیدەرانە پێیان دەگوترێ: ﴿هَؤُلاَءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلاَ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ: ئەوانە بون درۆیان بەدەم خواوە دەکرد، بزانن نەفرین و سزای سەختی خوا بۆ ستەمکارانە﴾هود: ١٨))[1]

قورتوبی لەبارەی وتەی ((فیضع علیه کنفه))دا دەلێ: واتە دایدەپۆشی تا خەلك نەیبینن و رێزو میهرەبانی لە گەلدا دەنوێنێ، بە وتەی نەرم لەگەلیدا دەدوێ‌و پێی دەلێ: دەزانی وات کردوە، دەلێ: بەلێ خوایە. خواش چاکەی لەگەلدا دەکات و پێی دەلێ: لە دنیادا دام پۆشی‌و ریسوام نەکردی ئەورۆکەش لێت خۆش دەبم.[1]

**٣) سەرکۆنەی کەمتەرخەمان:**

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکدا باسی ئەم دیمەنە دەکات و دەفەرموێ:

((إن الله تعالى يقول يوم القيامة: يا ابن آدم، مرضت فلم تعدني؟ قال: يا رب، كيف أعودك وأنت رب العالمين؟ قال: أما علمت أن عبدي فلانا مرض فلم تعده؟ أما علمت أنك لو عدته لوجدتني عنده؟ يا ابن آدم استطعمتك فلم تطعمني؟ قال: يا رب، كيف أطعمك وأنت رب العالمين؟ قال: أما علمت أنه استطعمك عبدي فلان فلم تطعمه؟ أما علمت أنك لو أطعمته

---

[1] صحيح البخاري كتاب المظالم، فتح الباري (٥/٩٦)، صحيح مسلم: (٤/٢١٢٠)ژمارە (٢٧٦٨)

لوجدت ذلك عندي؟ يا ابن آدم استسقيتك فلم تسقني؟ قال: يا رب، كيف أسقيك وأنت رب العالمين؟ قال: استسقاك عبدي فلان فلم تسقه أما إنك لو سقيته وجدت ذلك عندي:

له ڕۆژی قیامەتدا خوا دەفەرموێ: ئادەمیزاد! نەخۆش کەوتم سەردانت نەکردم؟ دەڵێ: خوایە چۆن سەردانت بکەم، تۆ پەروەردگاری هەمو جیهانیانی و تۆ نەخۆش ناکەوی، دەفەرموێ: ئەدی نەتزانی فلانە بەندەم نەخۆش کەوت و کەچی سەردانت نەکرد؟ ئەدی نەتدەزانی ئەگەر سەردانی بکەی من لەوێ ئاگادار بوم. ئادەمیزاد داوای خواردنم لێکردی نەتدامێ؟ دەڵێ: خوایە چۆن خواردنت بدەمێ کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ دەفەرموێ: ئەدی فلانە بەندەم داوای خۆراکی لێنەکردی نەتدایێ؟ نەتدەزانی ئەگەر پێی بدەی لە لای مندا دەتدرێتەوە؟ ئادەمیزاد! داوای ئاوم لێکردی نەتدامێ؟ دەڵێ: خوایە چۆن ئاوت بدەمێ کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ دەفەرموێ: ئەدی فلانە بەندەم داوای ئاوی لێ نەکردی نەتدایێ؟، نەتدەزانی ئەگەر ئاوت پێبدایا لە لای مندا دەتدۆزیەوە؟)).[2]

---

[1] تذكرة القرطبي: ٢٦٣

[2] رواه مسلم في صحيحه عن أبي هريرة. مشكاة المصابيح: (٤٨٦/١) **ژمارە** (١٥٢٨).

## جێباسی حەفتەم

## وەرگرتنەوەی کارنامە

کە لێپرسینەوەی هەر بەندەیەك تەواو دەبێ کارنامەکەی دەدرێتەوە و چی کردوەو نەکردوە تێیدا نوسراوە.

وەرگرتنەوەی کارنامەکان جۆراوجۆرە، بڕوادارەکان لە پێشەوەڕا بە دەستی راست وەریدەگرن:

﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ. فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا. وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا: ئەو کەسەی کارنامەکەی بە دەستی راست وەرگرێ لێپرسینەوەیەکی سوك وسانای لەگەڵدا دەکرێ، بە دڵشادیو ئاسو دەیی دەگەڕێتەوە لای خزم و کەس و کارو برادەرانی﴾ الإنشقاق:٧-٩.

ئەوجا کە کارنامەکەی دەبینێ ئەو هەمو کردەوە چاك و خواپەرستیەی تێدایە دەگەشێتەوە و دڵخۆش و گوشاد دەبێ و دەنگ هەڵدەبڕێو شادی خۆی دەردەبڕێ:

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيَهْ. إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ. فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ . فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ. قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ . كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الأَيَّامِ الْخَالِيَةِ: ئەو کەسەی کارنامەکەی درایە دەستی راستی، لە خۆشیان دەڵێ: ها نامەکەکەم تەماشاکەن. دەمزانی توشی ئەو لێپرسینەوەیە دەبم بۆیە خۆم ئامادەکرد. ئەو کەسە لە خۆشگوزەرانیەکی ئاسودە دەبێ. لەناو بەهەشتی بەرزدا دەبێ. کە میوەکانی شۆڕ بوینەوەو بە ئاسانی لێدەکرێنەوە. پێیان دەگوترێ بخۆن و بخۆنەوە، نۆشی گیانتان بێ بەسای چاکەکانی لە دنیادا کردوتانە شایەنتانە﴾ الحاقة: ١٩-٢٤.

بـەڵام بێـبڕواو دوڕو و گومڕاکـان لـە پشـتەوەڕا بەدەسـتی چـەپ کارنامەکـەیان وەردەگرنەوە، ئەوجا دەکەنە شین و زاری و هات و هاوارو واوەیلا:

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيهْ. وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَـابِيهْ. يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ. مَا أَغْنَى عَنِّـي مَالِيـهْ. هَلَكَ عَنِّـي سُلْطَانِيهْ. خُذُوهُ فَغُلُّوهُ. ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ: بەڵام ئەو کەسـەی کارنامەکـەی درایـە دەسـتی چـەپی دەڵـێ: ئـاخ! خۆزگە هەر نەمدرابایێ. نەمزانیبا سەرەنجامی لێپرسینەوەم چیە. خۆزگە بەمردنی دنیا رزگارم دەبو، ماڵەکەم هیچ قازانجی پـێ نـەدام. زەبرو زەنگ و باڵادەستیم لـە دەست چو. ئینجا بـە دەرگـاوانی دۆزەخ دەگوتـرێ: بیگـرەو زنجـیر بخـە دەسـت و گەردنی. پاشان فڕێی بدە ناو دۆزەخ ﴾ الحاقة: ٢٥-٣١.

کە بەندەکان کارنامەکەیان وەردەگرنەوە پێیان دەوترێ:

﴿هَذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُـمْ بِـالْحَقِّ إِنَّـا كُنَّـا نَسْتَنسِـخُ مَـا كُنتُـمْ تَعْمَلُـونَ: ئەوە کارنامەکەی ئێمەیە کە بۆ تۆمارکردنی سـەرجەم کردەوەکانتـان تـەرخان کرابـو ئەمڕۆ بەهەق پێتان دەڵێ چتان کردوە؟﴾الجاثية: ٢٩.

## جێباسی هەشتەم

# قورتوبی دیمەنی لێپرسینەوە دەخاتە بەرچاو

قورتوبی دەڵێ: (بەندەکان لە نێو گۆڕدا زندو دەبنەوەو لە گۆڕەپانی کۆبونەوەدا تا خوا مەبەستی بێ رادەوستن، خەتەنە نەکراون، روتن. پاشان وەختی لێپرسینەوە دادێت، خوا فەرمان دەکات ئەو کارنامانە بێنن کە فریشتەکان نوسیویانە. ئەوانەی بە دەستی راست وەریدەگرنەوە شادمان و ئاسودەن، بەڵام ئەوانەی بە دەستی چەپ یان لە پشتەوەڕا وەریدەگرنەوە ناشادو بەدبەختن، ئەوکاتی هەمو کەس کارنامەکەی دەخوێنێتەوە، شاعیران وتویانە:

| | |
|---|---|
| مثل وقوفك يوم العــــرض عريانـــا | مستوحشا قلق الأحشـــــاء حيرانـــا |
| والنار تلهب من غيظ ومـــن حنـــق | على العصاة ورب العرش غضبانـــا |
| اقرأ كتابك يا عبدي علــــى مـــهل | فهل ترى فيه حرفا غير مــــا كانـــا |
| لما قـــرأت ولم تنكـــر قراءتــــــه | اقرار من عرف الأشـــــياء عرفانـــا |
| نادى الجليل خذوه يــــا ملائكـــتي | امضوا بعبد عصا للنــــار عطشــانا |
| المشركون غدا في النــــار يلتـــهبوا | والمؤمنون بـــــدار الخلــد ســكانا |

برای ئازیزم ! ئەو وەختە بێنە بەرچاوت کە کارنامەکان هەڵدەدرێن و تەرازو دادەمەزرێ، کە لە نێو ئەو هەمو ئاپۆرە خەڵکەدا بەناوی خۆت: فلانی کوڕی فلان ! بۆ لێپرسینەوە بانگ دەکرێی و فریشتەکان دێن قۆڵت دەگرن و بەرەو لای خوات دەبەن. هەڵە ناکەن ئەگەر چی یەکێکیتریش ناوی خۆت و باوکتی هەبێ. کە ناوت بانگکرا دڵت دادەخورپێ و مۆریلە دەتگرێ پەل و پۆت دەلەرزێ و ڕەنگت دەگۆڕی و دڵت مشاوەش دەبێ، دەتبەن و ریزی خەڵکت پێ دەبڕن تا بەر دەستی خوا، هەمو خەڵك تەماشات دەکەن، ترس هەمو گیانی داگرتوی، نازانی چت بەسەر دێ؟!.

بێنە بەرچاوت کە لەبەر دەستی پەروەردگارت ڕەوەستاوی و کارنامەکەت لە دەست دایە کە تاوان و گوناحێکی وردیشی هەڵنەبواردوە، هەمو ڕازو نهێنیو پەنامەکیەکانتی تێدایە، بە زمانی شکاو و دڵی ساردو پڕخەفەتەوە چاوی پێدا دەگێڕیو دەیخوێنیەوە، پەرژەنگ و ناخۆشیەکان دەورەیان داوی. چەندەها گوناحت کردوە لەبیرت کردون ! چەندەها تاوانت کردوە شاردۆتەوە ! بەلاًم ئەمڕۆکە بەبیرت دێتەوەو لێت ئاشکرا دەکرێ! چەندەها کردەوەت ئەنجام داوە وا تێدەگەی بەپاکی کردوتە، بەلاًم ئەمڕۆ دەردەکەوێ ریابازیت تێدا کردوەو لێت دەبێتە بڵقی سەر ئاو! ئای کە ئەمڕۆ تەمات بەو کردەوانە هەبو رزگارت بکات! کەچی خەم و خەفەت و ئەفسوس و داخ داتدەگرێ و لەو ژیانەت پەشیمان دەبیەوە کە گوناهت تێدا کردوە.

بەلاًم ئەوانەی کارنامەکەیان بەدەستی ڕاست وەرگرتوە شادمان و دڵگوشادن. دەزانن بەهەشتین و دەڵێن: خەڵکینە فەرمون تەماشاکەن کارنامەم بخوێننەوە. پیاوچاکەکانیش بەناوی خۆیان و باوکیانەوە بانگ دەکرێن، پیاوچاك دەچێتە پێشەوە تا نزیك دەبێتەوە، ئینجا پەڕتوکێکی سپی و روناکی بۆ دەردێنن، کە سەرەتاکەی دەخوێنێتەوە هەموی گوناهەو ڕەنگی تێك دەچێ و دڵی تەنگ دەبێ، بەلاًم کە دەگاتە کۆتاییەکەی دەبینێ نوسراوە: ئەمانە گوناهەکانت بون بەلاًم من لێت خۆش بوم، یەکسەر دەگەشێتەوە، ئینجا لاپەڕەکانی تر هەڵدەداتەوەو چاکەکانی دەخوێنتەوە، ئیتر هەر شادو شادتر دەبێ تا دەگاتە کۆتایی، دەبینێ نوسراوە: ئەمانە چاکەکانت بون ئەوا چەند جار بۆم چەندانە کردیەوە. لە خۆشییان ڕەنگ و ڕوی سپی سپی دەبێو دەگەشێتەوە، تاجێك دێنن دەخەنە سەریو بەرگ و پۆشاکێکی زێڕینی لەبەردەکەن و بەژنی دەبێتە شەست گەز کە بەژنی ئادەم بوە، پێی دەڵێن: بڕۆ لای برادەرەکانت و موژدەیان بدێ، بڵێ هەموتان ئەمەتان دەدرێتێ، کە دەڕوا دەڵێ:

﴿هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ، إِنِّي ظَنَنْتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ﴾الحاقة:١٩-٢٠.

ئیتر ﴿ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ، فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ، قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾الحاقة:٢١-٢٣.

دەچێتەوە لای برادەرەکانی و پێیان دەڵێ دەمناسنەوە؟ دەڵێن: ڕێزانەی خوا داپیۆشیوی ناتناسینەوە تۆ کێی؟ دەڵێ: من فلانی کوڕی فلانم، مزگێنیتان بدەمێ هەموتان ئەو ڕێزەتان لێدەنرێ:

﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الأيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾الحاقة:٢٤.

بەڵام پیاوی خراپەکار بە پێچەوانەوە، بەناوی خۆی‌و باوکیەوە بانگ دەکرێ، دەچێتە پێش و نزیك دەبێتەوە، کارنامەیەکی ڕەش و تاریکی بۆ دەردێنن کە بە دێری ڕەش و بڕش نوسراوەتەوە. ناواخنەکەی چاکەی تێدایە، ڕواڵەتەکەی خراپە، لە سەرەتادا چاکەکانی دەخوێنێتەوە دڵی خۆش دەبێ و وا دەزانێ ڕزگاری دەبێ، بەڵام کە لێدەبێتەوە نوسراوە: ئەمانە چاکەکانت بون هیچی وەرنەگیراوە، ئینجا ڕەنگ و روی رەش هەڵدەگەڕێ و بێهومێد دەبێ، پاشان کارنامەکە وەردەگێڕێ و خراپەکانی دەخوێنێتەوە بەرەبەرە رەشتر و رەشتر دەبێ و پتر خەم و خەفەت دایدەگرێ، ئەوجا لە کۆتاییدا نوسراوە: ئەمانە خراپەکانت بون کە سزای پێ وەردەگری. ئیتر چاوەکانی شین هەڵدەگەڕێ و ڕەنگ و روی ڕەش دەبێ، پاشان پۆشاکی قەترانی لەبەر دەکەن و بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێ. پێی دەڵێن بڕۆوە لای برادەرەکانت و پێیان بڵێ هەموتان ئاوەهاتان لێدێت، کە دەڕوا دەڵێ:

﴿يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيهْ. وَلَمْ أَدْرِمَا حِسَابِيهْ. يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ. مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيهْ. هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيهْ﴾الحاقة:٢٥-٢٩.

ئیبنو عەباس (سُلْطَانِيهْ) بە بیانو تەفسیر دەکات.

خواش دەفەرموێ: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ. ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ. ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ﴾الحاقة:٣٠-٣٢.

حەسەن دەڵێ: ئیبنو عەبباس دەڵێ: حەفتا باڵ بەباڵی فریشتە.

(فاسْلُكُوه) وتویانه: ملی دەخرێته ناوی و رادەکێشرێ، ئەگەر یەك قەفی ئەم زنجیرە لەسەر شاخ دابنرێ دەیتاوێنتەوە.

ئەوجا دەڵێته برادەرەکانی: ئەرێ دەمناسنەوە؟ دەڵێن: نەخێر تۆ کێی ئاوەها پەرێشانی؟ دەڵێ: من فلانی کوڕی فلانم، هەموتان وەکو منتان لێ دێت.

ئەوەی کارنامەکەی لە پشتەوەڕا وەردەگرێ، شانی چەپەی هەڵدەکێشرێ و دەستی خۆی دەباتە پشتەوە ئینجا وەریدەگرێ. موجاهید دەڵێ ڕوی دێتە پشتی سەری، کارنامەکەی ئاوەها دەخوێنێتەوە.

ئەوجا تۆش بیر بکەوە گەر لە ئاسودەمەندان بی، لە نێو ئەو هەمو خەڵکەدا شادمان و ڕوگەش و جوان و ڕێك و پێك و شۆخ و شەنگی و کارنامەکەت لە دەستی ڕاستە و فریشتەیەك جاڕ دەدات ئەوە فلانی کوڕی فلانە کە وا بەختەوەر بوەو هەرگیز بەدبەدخت نابێ. بەلام ئەگەر لە بەدبەختەکان بیت ڕوخسارت ڕەش هەڵگەڕاوەو لە ناو خەڵکدا کارنامەکەت لە دەستی چەپە یان لە پشتەوەتە، فیغان و هاوارن دەکەی و فریشتەیەکیش قۆڵی گرتیو جاڕ دەدات، ئەوە فلانی کوڕی فلانە کە وەها بەدبەخت بوە هەرگیز بەختەوەر نابێ)).[1]

---

[1] تذكرة القرطبي: (٢٥٥).

# بەندی یازدەم

# تۆڵەوەرگرتنەوە

**خوای دادگەر لەڕۆژی قیامەتدا تۆڵەی هەمو ستەمدیدەیەك وەردەگرێتەوە تا هەمو کەس پاك لە پاك دەبێ و کەس مافی لەسەر کەس نامێنێ تەنانەت ئاژەڵانیش تۆڵە لە یەکدی وەردەگرنەوە. تەنانەت ئەگەر بزنێکی قۆچدار قۆچێکی لە بزنێکی بێ قۆچ دابێ تۆڵەی لێ وەردەگیرێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:**

((لتؤدن الحقوق إلى أهلها يوم القيامة، حتى يقاد للشاة الجلحاء من الشاة القرناء)).[1]

**ئەو کەسەی بە ناهەق یەکێك داپڵۆسێنیو دارکاری بکات، لە ڕۆژی قیامەتدا دارکاری دەکرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:**

((من ضرب بسوط ظلماً اقتص منه يوم القيامة: **هەر کەسێك بەستەم یەکێك بداتە بەر قامچیان، لە ڕۆژی دواییدا تۆڵەی لێ وەردەگیرێتەوە**)).[2]

**هەروەها دەفەرموێ:** ((من ضرب مملوكه ظالماً أقيد منه يوم القيامة: **هەر کەسێك بەستەم لە بەندەکەی بدات، لە ڕۆژی قیامەتدا تۆڵەی لێوەردەگیرێتەوە**)).[3]

**ئەگەر یەکێك بوختانی زینا بە بەندەکەی هەڵبەستێ لە ڕۆژی قیامەتدا حەددی لێ دەردەکرێ. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:**

((من قذف مملوكه بالزنا يقام عليه الحد يوم القيامة إلاّ أن يكون كما قال)).[4]

---

[1] رواه مسلم عن أبي هريرة. صحيح مسلم: (١٩٩٧/٤) ژمارە (٢٥٨٢).

[2] رواه البخاري في الأدب المفرد والبيهقي في السنن عن أبي هريرة. صحيح الجامع الصغير: (٣١٩/٥) ژمارە (٦٢٥٠).

[3] لە موعجەمی کەبیری طەبەرانی لە عەمماری گێراوەتەوە. صحيح الجامع الصغير: (٣١٩/٥) ژمارە (٦٢٥٢).

[4] رواه مسلم عن أبي هريرة. صحيح مسلم: (١٢٨٢/٣) ژمارە (١٦٦٠).

## خوازگەی یەکەم

# تۆڵە وەرگرتنەوەی ڕۆژی قیامەت چۆنە؟

لە ڕۆژی قیامەتدا سامان و سەرمایەی مرۆڤ (چاکە)یە، جا ئەگەر ستەمی لە خەڵکی لەسەر بێ ئەوا بە ئەندازەی ستەمەکەی چاکەی لێ دەدرێتە ستەمدیدەکە، ئەگەر چاکەشی نەبو یان چاکەکانی ببوە بڵقی سەر ئاو ئەوا بە ئەندازەی ستەمەکەی گوناحی ستەمدیدەی دێتە سەر شان.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((من كانت له مظلمة لأخيه من عرضه أو شيء، فليتحلل منه اليوم، قبل أن لا يكون دينار و لا درهم، إن كان له عمل صالح أخذ منه بقدر مظلمته، وإن لم يكن له حسنات أخذ من سيئات صاحبه فحمل عليه: هەر کەسێك ستەمی کردوەو مافی برایەکەی لەسەرە با ئەمڕۆ گەردەنی خۆی پێ ئازاد بکات، بەر لەوەی بگاتە ئەو ڕۆژەی کە دینار و درهەمی تێدا نیە، چونکە لەو ڕۆژیدا ئەگەر کردەوەی چاکی هەبێ ئەوا بە ئەندازەی ستەمەکەی چاکەی لێدەدرێتە ستەمدیدەکە، ئەگەر چاکەشی نەبێت خراپەی ستەمدیدەکەی دەخرێتە ئەستۆ))[1].

هەڵبەت ئەو جۆرە کەسانەی چاکەیان لێ وەردەگیرێو دەخرێتە باری کەسانیتر و گوناحی کەسانی ستەمدیدەی دەخرێتە ئەستۆ، مایەپوت و بێ سەرمایەن.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((أتدرون من المفلس؟ قالوا: المفلس فينا من لا درهم له و متاع. فقال: إن المفلس من أمتي، من يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام وزكاة، ويأتي و قد شتم هذا، وقذف هذا، وأكل مال هذا، وسفك دم هذا ، وضرب هذا، فيعطي هذه من حسناته، وهذا من حسناته، فإذا فنيت حسناته، قبل أن يقضي ما عليه، أخذت من خطاياهم فطرحت عليه، ثم طرح في النار:

---

[1] صحيح البخاري، كتاب المظالم. فتح الباري (١٠١/٥).

دەزانن کێ مایەپوت و بێ دەسمایەیە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پێمان وایە مایەپوت ئەو کەسەیە کە پارەوماڵی نەبێ. فەرموی: ((مایەپوتی نەتەوەی من ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بە خۆ بە نوێژو زەکات و ڕۆژوەوە دێت، بەڵام جوێنی بەوێهێ داوە، بوختانی بەو هەڵبەستاوە، ماڵی ئەمی خواردوە، خوێنی فلانی ڕشتوە، لە فیساری داوە.. ئەوجا هەر کەسەو دێت بایی ستەمەکەی خۆی چاکەی لێ دەبات تا هەگبەی گوناحبارەکە بەتاڵ دەبێت و بێ چاکە دەمێنێتەوە، ئینجا کە چاکەکانی نەما خراپەکانیان دەخەنە ئەستۆی، پاشان تور دەدرێتە ناو ئاگر))[1].

ئەو کەسەی قەردی خەڵکی لە مل بێو نەیدابێتەوە لەڕۆژی قیامەتدا خاوەن قەردەکان بەقەد پارەو ماڵەکەیان چاکەی لێ دەبەن.

ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((من مات وعليه دينار أو درهم قضي من حسناته ليس ثَمَّ دينار و درهم: هەر کەسێك بمرێو دینارو درهەمی خەڵکی قەردار بێ، لە ڕۆژی دواییدا چاکەی لەباتی وەردەگرن، چونکە ئەو ڕۆژی دینار و درهەم لە ئارادا نیە))[2].

ئەگەر دو کەس بە ئەندازەی یەکتری ستەمیان لە یەکدی کردبێ ئەوا کەس لە کەس و پاك لە پاك، بەڵام ئەگەر هی یەکێکیان زیاتر بێ ئەوا بەقەد زیادەکە چاکەی لێ وەردەگیرێو دەدرێتە ستەمدیدەکە.

خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: جارێکیان پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و لەبەر دەستی دانیشت و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دو بەندەم هەیە درۆم لەگەڵدا دەکەن و گزیم لێدەکەن و فەرمانم دەشکێنن منیش: جوێنیان پێدەدەم و دارکاریان دەکەم حاڵم چۆنە؟

فەرموی: ((إذا كان يوم القيامة يحسب ما خانوك وعصوك وكذبوك، وعقابك إياهم، فإن كان عقابك إياهم بقدر ذنوبهم كان كفافاً لا لك، ولا عليك، وإن كان عقابك إياهم دون ذنبهم

[1] صحيح مسلم: (٤/١٩٩٧) ژمارە (٢٥٨١).

[2] رواه ابن ماجة باسناد صحيح عن ابن عمر. صحيح الجامع الصغير: (٥/٥٣٧) ژمارە (٦٤٣٢)

كان فضلا لك، وإن كان عقـــابك إيـــاهم فـــوق ذنوبهـــم، اقتـــص لهـــم منـــك الفضـــل:
**له ڕۆژی قیامەتدا گزیو نافەرمانی و درۆیەکانی ئەوان و دارکاری و جنێوەکانی تۆ هەردوکیان دەکێشرێن ئەگەر بەقەد یەك بون ئەوا کەس لەکەس، ئەگەر تەمبێ کردنەکەی تۆ کەمتر بو ئەوا چاکەت بۆ دەنوسرێ، بەڵام ئەگەر زۆر تربو ئەوا چاکەت لێوەردەگیرێ))[1] پاشان پیاوەکە لەوێ هەڵساو دایە پرمەی گریان و فیغان.**

**پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: ئەدی نەتخوێندۆتەوە خوا دەفەرموێ:**

﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّـــةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾ الأنبياء: ٤٧.

**ئەمەیە ڕەوشی ستەمکاران بۆیە پێویستە مرۆڤ لەو ڕۆژە بترسێو خۆی نەخاتە ئەم گەرداوە. پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێ:**

((الظلم ظلمات يوم القيامة: **ستەم لە ڕۆژی قیامەتدا تاریکاییە))[2].**

**هەروەها دەفەرموێ:**

((اتقوا الظلم فان الظلم ظلمات يوم القيامـــة: **خۆتان لە ستەمکاری بپارێزن چونکە ستەم تاریکایی ڕۆژی دواییە))[3].**

---

[1] لە سوننەنی تیرمذیدایە. مشكاة المصابيح: (٣/٦٦) ژمارە (٥٥٦١) وأورده في صحيح الجـــامع: (٦/٣٢٧) ژمارە: (٧٨٩٥) وعزاه الى أحمد والترمذي.

[2] رواه البخاري ومسلم عن عبدالله بن عمر. صحيح البخاري: كتاب المظـــالم. فتـــح البـــاري: (٥/١٠٠) وصحيح مسلم: (٤/١٩٦٩) ژمارە (٢٥٧٩).

[3] صحيح جامع الصغير: (٦/٣٢٤) ورقم الحديث ٧٨٨٥.

## خوازگەی دووەم

# گەورەیی تاوانی کوشتن

یەکێك لەو تاوانانەی لە لای خوا زۆر گەورەو ناقۆلایە کوشتنی بە ناڕەوایە. ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((يجيء الرجل آخذا بيد الرجل، فيقول: يا رب، هذا قتلني، فيقول: لم قتلته؟ فيقول: قتلته لتكون العزة لك، فيقول: فاها لي.. ويجيء الرجل آخذا بيد الرجل، فيقول: أي رب، إن هذا قتلني، فيقول الله: لم قتلته، فيقول: لتكون العزة لفلان، فيقول: اها ليست لفلان، فيبوء بإثمه: لە دادگای ڕۆژی قیامەتدا پیاو هەیە دەستی پیاوێکیتری گرتوەو دەڵێ: خوایە! ئەو کابرایە منی کوشتوە. خوا دەفەرموێ: بۆ چی کوشتت؟ دەڵێ: تا عیززەت بۆ تۆ بێ. دەفەرموێ: بۆ منە. پیاوێکیتر دەستی یەکێکیتری گرتوەو دەڵێ: خوایە! ئەو پیاوە بو منی کوشت. خوا دەفەرموێ: بۆ چی کوشتت ؟ دەڵێ: تا عیززەت بۆ فلانە کەس بێ. دەفەرموێ: بۆ وی نیە، ئەوجا گوناحی کوژراوەکەی دەخرێتە سەر شان)).[1]

ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((يجيء المقتول بالقاتل يوم القيامة، ناصيته و رأسه بيده، وأوداجه تشخب دماً، فيقول: يا رب، سل هذا فيم قتلني؟ حتى يدنيه من العرش: لە ڕۆژی قیامەتدا کوژراو پەرچەمی بکوژی گرتوەو خوێن بە لا ملیدا دێتە خوارەوە، دەڵێ: خوایە! لەو کابرایە بپرسە بۆچ منی کوشتوە؟ دەیباتە پێش تا لە بارەگای نزیك دەکاتەوە)).[2]

خوێن ڕشتنی بە ناڕەوا هێند گەورەو نەقۆلایە بۆیە یەکەمین شتە کە خوا لێی دەپرسرێتەوە:

---

[1] رواه الترمذي. صحيح الجامع الصغير: (٣٢٤/٦) ژمارە (٧٨٨٥).

[2] لە سونەنی تیرمذیو أبو داود و ابن ماجه دایە. صحيح الجامع الصغير: (٣٢٤/٦) ژمارە (٧٨٨٧)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((أول ما يقضى بين الناس يوم القيامة في الدماء: یەکەمین شت کە خوا دادگایی خەڵکی لەسەر دەکات خوێن ڕشتنە))[1].

ئیبنو حەجەر لە راڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ: ((لەم فەرمودەیەدا گەورەیی تاوانی کوشتن دەردەکەوێ چونکە شتی لە هەموان گرنگتر یەکەمجار دەست پێدەکرێ. گوناحیش بەگوێرەی گەورەیی ئاسەواری خراپ و وێرانکردنی بەرژەوەندی گەورە دەبێ، شیرازەو بونیادی مرۆڤایەتیش بە کوشتن وێران دەبێ)).[2]

لە نێوان ئەم فەرمودە و فەرمودەیەکیتردا کە دەفەرموێ یەکەمین شت پرسیاری لێ بکرێ نوێژە، هیچ ناسازیو ناکۆکی نیە.

ئیبنو حەجەر دەڵێ: ((ئەم فەرمودەیە لەگەڵ فەرمودەکەی بێژانەوەی ئەبوهورەیرەدا ((ان أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة الصلاة)) نیە کە خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە، چونکە فەرمودەکەی یەکەم پەیوەستە بە ئاڵوێرو رەفتاری نێوان خەڵك، بەڵام هی دوەم پەیوەستە بە پەرستنی خوا.

نەسائیش لە فەرمودەیەکی بێژانەوەی ئیبنو مەسعوددا هەردوکیانی کۆکردۆتەوە:

((أول مايحاسب العبد عليه الصلاة. وأول ما يقضى بين الناس في الدماء))[3]

---

[1] رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي. جامع الأصول: (١٠: ٤٣٦) ژمارە (٧٩٦٨).

[2] فتح الباري: (١١/٣٩٧).

[3] فتح الباري: (١١/٣٩٦).

## خوازگەی سێیەم

## تۆڵە وەرگرتنەوەی نێوان ئاژەڵان

**(خوا دادگایی لەگەڵ بەدیهێنراوانی دەکات: جنۆکە، مرۆڤ، ئاژەڵ، تەنانەت بێقۆچی ستەمدیدەش تۆڵەی خۆی وەردەگرێتەوە، ئینجا دوای ئەوەی کە هەمو ئاژەڵ و گیانلەرێك دادگایی کران و تەواو بو، خوا هەرهەمویان دەکاتەوە خۆڵ و دەفەرموێ: ببن بەخۆڵ. بێبڕواکان کە ئەمە دەبینن دەڵێن خۆزگە ئێمەش دەبوینە خۆڵ: ﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَالَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾النبأ: ٤٠)[1].**

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکیتردا دەفەرموێ:**

((إن الله يحشر الخلق كلهم، كل دابة وطائر وانسان، يقول للبهائم والطير: كونوا ترابا، فعند ذلك يقول الكافر: ﴿يَالَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾))[2].

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دەڵێ: ((کە ڕۆژی قیامەت دادێت پێست ڕادەکشێ[3]، جڕوجانەوەر و ئاژەڵو دڕندەکان هەر هەمو کۆدەکرێنەوە، پاشان تۆڵەکاری سازدەکرێ تەنانەت بزنی بێقۆچی ئەنگاوتراویش[4] تۆڵەی خۆی لەبزنی قۆچدار وەردەگرێتەوە، کە تۆڵەکاری تەواو بو، خوا پێیان دەفەرموێ: ببنە خۆڵ. بێبڕواکان لەو وەختەدا دەڵێن: خۆزگە ئێمەش دەبوینە خۆڵ:**

﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَالَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾[5]

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

[1] ئەمە فەرمودەیەکی پێغەمبەرﷺـە ئیبنو جەریر بەئیسنادی خۆی تا ئەبو هورەیرە بەمەرفوعی دەیگێڕێتەوە.

[2] گێڕانەوەیەکیترە هەمدیسان ئیبنو جەریر لە ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە.

[3] ئەم تەعبیرە ئیدیۆمێکە بەمەبەستی یەکلابونەوەو ساغکردنەوەی ناکۆکیو ململانێ دێت. وەرگێڕ-.

[4] ئەنگاوتراو: پێکراو، نیشانەی لێدراو

[5] رواه ابن جرير.

((لتؤدن الحقوق إلى أهلها يوم القيامة، حتى يقاد للشاة الجلحاء من الشاة القرناء)).[1]

**دیسان ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((يقتص الخلق بعضهم من بعض حتى الجماء من القرناء وحتى الذرة من الذرة:

**لە ڕۆژی قیامەتدا هەمو بەدیهێنراوێك تۆڵەی خۆی وەردەگرێتەوە: بزنی بێ قۆچ لە قۆچدار، تەنانەت گێرکە لە گێرکە))[2].**

**هەمدیسان ئەبو هورەیرە ﷺ بە مەرفوعی دەگێڕێتەوە:**

((ألا والذي نفسي بيده ليختصمن كل شيء يوم القيامة حتى الشاتان فيما انتحطتا)).[3]

**ئەبو ذەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((جارێکیان پێغەمبەر ﷺ دو بزنی دیت شەڕە قۆچیان دەکرد، فەرموی ئەبو ذەر دەزانی لەسەر چ بەشەڕ دێن؟ گوتم: نەخێر. فەرموی: بەڵام خوا دەزانێ‌و لە ڕۆژی قیامەتدا دادگاییان لە نێودا دەکات)).[4]**

## چۆن ئاژەڵان تۆڵە لەیەکتر وەردەگرنەوە کە ئەرکباریش نین؟

**زۆر لە زانایان لە ئاست ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ توشی بەرچاو لێڵی بونە کە لەبارەی زندوکردنەوەو تۆڵە وەرگرتنەوەی ئاژەڵان دەدوێ. بەڵام ئەوەوی لە ڕاڤەی صەحیحی موسلیمدا ئەو بابەتەی رون کردۆتەوەو دەڵێ:**

**(ئەم فەرمودەیە بە ڕاشکاوی دەڵێ: گیانلەبەران زندو دەکرێنەوەو وەکو ئادەمیە ئەرکبارەکان و منداڵ‌و شێت و ئەوانەی بانگەوازیان پێ نەگەیشتوە دوبارە دەبنەوە. بەڵگەکانی قورئان و سوننەت لەم بارەوە فرەن.**

---

[1] رواه مسلم في صحيحه.

[2] أخرجه أحمد في مسنده بإسناد رجاله رجال الصحيح.

[3] رواه أحمد في مسنده.

[4] رواه أحمد بإسناد صحيح. شيخ ناصرالدين الألباني هەمو ئەو فەرمودانەی بەئیسنادەوە هیناوەتەوەو قسەی لەبارەی ئیسنادەکانەوە کردوە، تەماشای سلسلة الأحاديث الصحيحة بکە (٤/٦٠٦ ٦١١).

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْوُحُوش حُشِرَتْ﴾ التكوير: ٥.

ئەگەر شەرعیش وتەیەکی فەرمو و هیچ بەربەستێکی عەقڵی و شەرعی نەبو ڕواڵەتەکەی بگۆڕێ ئەوا واجبە وەکو خۆی بە ڕواڵەتەوە وەربگیرێ.

زانایان وتویانە: زندو کردنەوەو دوبارە کردنەوە مەرج نیە بۆ سزاو پاداشت و تۆڵە دانەوە بێت. هەرچی تۆڵە وەرگرتنەوەی بێقۆچە لەقۆچدار ئەوە تۆڵە وەرگرتنەوەی ئەرکبارێتی نیە، چونکە ئەرکی لەسەر نیە، بەڵکو لەجۆری تۆڵە وەرگرتنەوەی بەرامبەرکاریە. خواش زاناترە).

شێخ ناصر دوای هێنانەوەی ئەم بڕگە لە وتەی نەوەوی دەڵێ:

ئیبنولمەلیك لە (مبارق الأزهار ٢/٢٩٣) بە کورتی شتێکی وا دەڵێ. شێخ عەلیلقاریئیش وتەکەی بۆ پەرتوکی (المرقاة ٤/٧٦١) ڕاگواستۆتەوەو دەڵێ: ((ئەگەر وترا بزن ئەرکبار نیە چۆن تۆڵەی لێوەردەگیرێتەوە؟ دەڵێین خوا هەرچیەکی بیەوێ دەیکات و کەس ناتوانێ و بۆی نیە بپرسێ بۆچی؟ مەبەست لەوەدا ئاگادارکردنەوەی بەندەکانە کە خوا هیچ مافێك نافەوتێنێ، بەڵکو تەواوی مافی ستەمدیدان لە ستەمکاران وەردەگرێتەوە)).

ئەلقاریئ دەڵێ: لێکدانەوەیەکی جوان و بۆچونێکی چاکە، بەڵام دەبوایە لە باتی وشەی (مەبەست: الغرض) وشەی حیکمەتی بەکارهێنابا. بە تێکڕایی ئەو بابەتە لە بارەی ئەوەیە کە دادگەری خوا تەواوە و تەواوی ئەرکبارەکان دەگرێتەوە. جا ئەگەر ڕەوشی ئاژەڵان وابێ کە ئەرکبار نین ئاخۆ ڕەوشی عاقڵی ناودارو بێناو و بەهێز و بێهێزن چۆن بێ؟)).

شێخ ناصر پاش ئەم وتانە خۆی دەڵێ: ((جێی داخە کە کەلامناسان تەنها لەبەر ڕاو بۆچونێك ئەم هەمو فەرمودانە ڕەت بکەنەوە! لەوەش عەنتیکەتر ئالوسی فرەزانیش وای بۆچوە! چونکە دوای ئەوەی فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە بە گێڕانەوەی موسلیم و بەگێڕانەوەی ئەحمەد دێنێتەوە لە تەفسیرەکەی (روح المعاني ٩/٣٠٠٦)دا لە تەفسیری ﴿وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ دەڵێ: (ئەلغەزالی

حوجەتولئیسلام و کۆمەڵە زانایەکی تر وای بۆ چونە کە جگە لە مرۆڤ و جنۆکە هیچ شتێکیتر زندو ناکرێنەوە، چونکە نە ئەرکبارن و نە شایەنی ڕێزلێنانن. لە قورئان و سوننەتیشدا هیچ دەقێك نیە ئاماژەی زندو کردنەوەی گیانلەبەریتر بدات. فەرمودەکەی موسلیم و تیرمذیش ئەگەرچی صەحیحە بەڵام لە دەروازەی ئایەتەکە تێنەپەڕیوە، ڕێی تێدەچێ گوزارشت بێ لە دادگەریەکی تەواو و بێ کەموکوڕی، منیش لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیە دام، بەڵام ئەوانەی یەکەمیش بە هەڵە دانانێم، چونکە بەشێوەیەکی تێکڕایی بەڵگەیان بەدەستەوەیە. خوای بەرزیش زاناترە).

دەڵێم[1]: خوا بیبورێ کە ئاوەها دەڵێ. زۆر سەیرە چونکە لەو تەفسیرەدا وامان نەناسیوە بەڵکو لە تەفسیری هەمو ئایەتەکاندا ڕیبازی پێشینانی گرتۆتە بەر بێئەوەی پەیرەو لە واتاوێڵ(تأویل)ی یان لە کارخستن(تعطیل) بکات، بەڵام ئاخۆ بۆچی تەفسیری ئەم فەرمودەیەی بە پێچەوانەی ڕواڵەتەکەی کردوەو بە دادگەریەکی تەواو و بێ کەموکوڕی لێکداوەتەوە، ئایا ئەم لێکدانەوەیە ئەم فەرمودە راشکاوە بەدرۆ هەژمار ناکات کە دەفەرموێ: بزنی بێ قۆچ تۆڵەی خۆی لە بزنی قۆچدار دەکاتەوە. ئەویش وەکو کەلامناسەکان دەڵێ: گوزارشتە! .. واتە بزنی بێ قۆچ تۆڵە وەرناگرێتەوە، ئەم هەمو قسەو باسە لەدیداری فەرمودەکەی موسلیمدایە، خۆ ئەگەر بچینە دیداری بێژانەوەکانیتر وەکو فەرمودەکەی تەرجەمەو فەرمودەکەی ئەبو ذەرو ئەوانیتر ئەوا بەشێوەیەکی یەکلاکەرانەوەو بە هەقیقی تۆڵەکە باس دەکات نەك گوزارشت بێ.

هەر میهرەوەر بێ نەوەوی پێشەوا کەوا لە وتەکەی پێشویدا وتویەتی: (ئەگەر شەرع وتەیەکی فەرموبێ و هیچ بەربەستێکی عەقڵیو شەرعیشی بۆ نەبێ ڕواڵەتەکەی بگۆڕێ ئەوا واجبە وەکو خۆی بەڕواڵەتەوە وەربگیرێ).

دەڵێم: بەم وتەیە واتاوێڵیەکەی رەت کردۆتەوە، هەر بەمەرەدی ئەو واتاوێڵییە بو فەلسەفەزان و زۆرینەی کەلامناسەکانی وەکو موعتەزیلەو کەسانیتر، ئەمانەش رەت دەکەنەوە؛ بڕواداران لە ڕۆژی دواییدا خوا دەبینن، بەرزبونەوەی سەر بارەگا،

---

[1] واتە شێخ ناصر خۆی وا دەڵێ.

دابەزینی بۆ ئاسمانی دنیا لە هەمو شەوێك، هاتنی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا، چەندین ئایەت و فەرمودەی تر کە لە بارەی سیفەتەکانی خواوە دەدوێن.

بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی بڵێ گیانلەبەران زندو دەکرێنەوەو تۆڵەیان لێ دەسێندرێتەوە ئەوە راستە و جگە لەمە دروست نیە. هەڵبەت جەماوەری زانایانیش بۆچونیان وایە هەروەکو ئالوسی خۆی لە شوێنێکیتری تەفسیرەکەیدا (٢٨١/٩) ئەم کۆدەنگیەی نوسیوە، هەروەها شەوکانیش لە تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی تەکویردا لە تەفسیری (فتح القدیر ٣٧٧/٥) ئەمەی دوپات کردۆتەوەو دەڵێ: (الوحوش: هەمو گیانلەبەرەکانی وشکانی دەگرێتەوە. حشرت: واتە زندو بۆوە، تەنانەت هەمویان تۆڵە وەردەگرنەوە بە جۆرێك بێقۆچ مافی خۆی لە قۆچدار وەردەگرێتەوە).[1]

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة، للشيخ ناصرالدين الألباني: (٦١٢/٤).

## خوازگەی چوارەم

## کەنگێ بڕواداران تۆڵە لە یەکتر وەردەگرنەوە؟

**ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((إذا خلص المؤمنون من النار، حبسوا بقنطرة بين الجنة والنار، فيتقاصون مظالم كانت بينهم في الدنيا، حتى إذا نقوا وهذّبوا، أذن لهم بدخول الجنة، فوالذي نفس محمد بيده، لأحدهم بمسكنه في الجنة أدل بمنزله كان في الدنيا: **بڕوادارەکان کە لە پردی دۆزەخ دەپەڕنەوەو لە ئاگر رزگار دەبن لە بوارگەی نێوان دۆزەخ وبەهەشتدا گیرۆدە دەکرێن، تا مافەکان پاك لە پاك دەکرێ، ئینجا کە پاك بونەوەو مافی کەس لەسەر کەس نەما ڕێ دەدرێن بچنە بەهەشت. بەو خوایەی گیانی منی لە دەستە خانوەکانی نێو بەهەشتیان لە هی دنیا باشتر دەناسنەوە))** [1].

[1] صحيح البخاري: كتاب المظالم باب قصاص المظالم. فتح الباري (٥/٩٦).

بەندی دوازدەم

# تەرازو

## خوزاگەی یەکەم

## پێناسەی تەرازو

لە ئاخر و ئۆخری ئەو ڕۆژەدا بۆ کێشان و هەڵسەنگاندنی کردەوەکان (تەرازو) دادەنرێ. قورتوبی دەڵێ: ((کە لێپرسینەوە تەواو دەبێ کێشانی کردەوەکان دەست پێدەکات. هەڵسەنگاندن بۆ دیاریکردنی پاداشت و سزایە، بۆیە هەر دەبێ دوای لێپرسینەوە بێ، چونکە لێپرسینەوە بۆ خەملاندنی کردەوەکانە بەلام کێشان بۆ دەرخستنی بڕ و ئەندازە و چەندێتیە تا سزاو پاداشتی پێ دیار بکرێ))[1].

ئایەت و فەرمودەکان ڕونیان کردۆتەوە کە تەرازوەکە تەرازوێکی ڕاستەقینەیە و جگە لە خوا هیچ کەسێکیتر نازانێ چۆنە.

سەلمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((یوضع المیزان یوم القیامة، فلو وزن فیه السموات والأرض لوسعت. فتقول الملائکة: یا رب لمن یزن هذا؟ فیقول الله تعالى: لما شئت من خلقي. فتقول الملائکة: سبحانك ما عبدناك حق عبادتك: لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازو دادەمەزرێ و ئەگەر ئەرزو ئاسمانەکانیشی تێدا بکێشرێ جێی دەبێتەوە. فریشتەکان دەڵێن: خوایە! ئەم تەرازوە بۆ کێ دەکێشێ؟ خوا دەفەرموێ: بۆ ئەو بەندانەی خۆم مەبەستمن. فریشتەکان دەڵێن: پاکی بۆ تۆ

[1] تذکرة القرطبي: ٣٠٩.

**خوایە وەکو پێویست و شایەن بەخۆت نەمانپەرستوی))**[1].

**تەرازوەکە زۆر وردکارەو ئاستەمێکیش بە کەم و زیاد ناکێشێ:**

﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلاَ تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّـــةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ: **لەڕۆژی دواییدا تەرازوە دادگەرو ڕاستەکان دادەمەزرێنن تا کردەوەکانی پێ هەڵسەنگێنین، هیچ کەسێك تۆزە ستەمێکی لێناکرێ، ئەگەر هێندەی تۆزقاڵێك چاکەو خراپەشی هەبێ دەیکێشین، ئێمە بەسین بۆ ژماردن و لێپرسینەوە**﴾ الأنبياء:٤٧.

**زانایان ڕا و بۆچونیان لەبارەی تەرازوەوە جیاوازە ئاخۆ یەك دانەیە یان ژمارەیان زۆرە، هەندێ زانا پێیان وایە هەمو مرۆڤێك تەرازوێکی تایبەتی هەیە یان هەر جۆرە کردەوەیەك تەرازوێکی تایبەتی هەیە:**

﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾.

**هەندێ زانای‌تر وای بۆ چونە کە تەرازوەکە یەك دانە بێ، کە لە ئایەتەکەشدا بە کۆ هاتوە بەگوێرەی زۆری جۆری کردەوەکانە یان بەگوێرەی جۆری مرۆڤەکانە.**

**ئیبنو حەجەر دوای گێڕانەوەی ئەم هەمو ڕا و بۆچونە جیاوازانە ئەوەی تاسەنگ(ترجیح) داوەتەوە کە تەرازو یەك دانەیە و دەڵێ: (بەوەش تێکناچێ کە کردەوەی کەسانێکی زۆر دەکێشێ، چونکە ڕەوشی ژیانەوە لەگەڵ ڕەوشی ژین جیاوازە)**[2].

**سەفارینی دەڵێ: (حەسەنی بەسرایی دەڵێ: هەر ئەرکبارێك تەرازوێکی هەیە. هەندێك دەڵێن: ڕاسترەکەی وا دەردەکەوێ کە کۆمەڵە تەرازوێك بن نەك یەك دانە تەرازو. لەبەر ئەوەی خوا دەفەرموێ:**

---

[1] رواه الحاكم. سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٦٥٦/٢) ژمارە (٩٤١)

[2] فتح الباري: (٥٣٧/٣).

﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ﴾. ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ﴾الأعراف: ٨،

دەڵێ: بەگوێرەی ئەم ئایەتانە دور نیە کردەوەکانی دڵ جۆرە تەرازوێکیان بۆ تەرخان کرابێ، کردەوەکانی جەستە جۆرێکی تری بۆ تەرخان بێ، کردەوەکانی زمان جۆرە تەرازوێکی‌تری پێ تایبەت بێ. ئیبنو عەطییەش ئەمەی هێناوەتەوەو دەڵێ: خەڵك لەم بابەتەدا را و بۆچونیان جیاوازە، بەلاّم پێم وایە هەر کەسێك جۆرە سەنگێکی تایبەت بە خۆی هەبێ و تەرازوش یەك دانەیە. هەندێکی‌تر دەڵێن کە لە ئایەتەکەدا (موازین) بە کۆ هاتوە لەبەر ئەوەیە کە کردەوەی کەسانێکی زۆر دەکێشرێن. ئەمەیان لێکدانەوەیەکی چاکە).[1]

[1] لوامع الأنوار البهية: (٢/١٨٦).

## خوازگەی دووەم

# تەرازو لەتێگەیشتنی یارانی ڕێبازو کۆمەڵدا

یـارانی ڕێبـازو کۆمـەڵ(السـنة والجماعـة) پێیـان وایـە تـەرازو، تـەرازوێکی ڕاستەقینەیە و کردەوەی بەندەکانی پێ هەڵدەسەنگێندرێ، موعتەزیلەو ژمارەیەکی زۆر کەمیش لە ئەهلی سوننەت بۆچونیان جیاوازە.

ئیبنو حەجەر دەڵێ: (ئەبو ئیسحاقی زوجاج دەڵێ: یارانی ڕێبازو کۆمەڵ لەوەدا یەکدەنگن کە بڕوایان بە تەرازو هەیەو کردەوەی بەندەکان لە ڕۆژی قیامەتدا بەو تەرازوە دەکێشرێن، هەروەها تەرازوەکە زمانەیەك و دو (تا)ی هەیە و لە کێشانی کردەوەکاندا دادەکەوێ. بەڵام موعتەزیلە ئینکارییان لە بونی تەرازو کردوەو دەڵێن تەرازو گوزارشتە لە داد و دادگەری، پێچەوانەی قورئان و سوننەتیان وتوە. چونکە خوا خۆی پێی ڕاگەیاندوین تەرازو دادەمەزرێنێ تا کردەوەکانی پێ هەڵسەنگێنێ بۆ ئەوەی بەندەکان کردەوەکانی خۆیان ببیننەوە و ببنە گەواهیدەری سەر نەفسی خۆیان.

ئیبنو فورەك دەڵێ: موعتەزیلەکان نکوڵیان لە تەرازو کردوە چونکە پێیان وایە مەحاڵە خودی نیشان و ڕەنگدانەوە بکێشرێ.

دەڵێ: هەندێ کەلامناس لە ئیبنو عەبباسیان گێڕاوەتەوە وتویانە خوا نیشانەو ڕەنگدانەوەکان (واتە کردەوەکان) دەکاتە سەنگ و دەیانکێشێ. تەواو.

هەندێ لەپێشینەکانیش وای بۆ چونە کە تەرازو بە واتای دادگەری هاتبێ، طەبەری ئەم وتەیەی بۆ موجاهید گەڕاندۆتەوە.

رای پەسەند ئەوەیە کە جەماوەری زانایان بۆی چونە.

جارێکیـان لـەلای حەسـەنی بەسراییدا باسـی تـەرازویان کـرد، ئەویش گوتـی

زمانەیەك و دو تای هەیە).[1]

قورتوبی دەڵێ: موجاهید و زەححاك و ئەعمەش تەرازویان بە داد و دادگەری تەفسیر کردوە.[2]

ئەو تەفسیرزانانە رەنگە تەرازوی ئەم ئایەتەیان بە داد و دادگەری تەفسیر کردبێ:

﴿وَالسَّمَاء رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ أَلاَّ تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ. وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾ الرحمن: ٧-٩.

راستە لێرەدا تەرازو واتە داد، خوا فەرمانیشی بە بەندەکان کردوە لە نێو یەکتریدا رەفتاری پێبکەن، بەڵام ئەو تەرازوەی لەرۆژی قیامەتدا دادەمەزرێ تەرازوێکی راستەقینەیەو چەندین فەرمودەی لەبارەوە هاتوە، رواڵەتی قورئانیش وای دەردەخات.[3]

پێشەوا ئەحمەد وەڵامی ئەوانەی بەو ئایەتە دەدایەوە کە بڕوایان بە تەرازو نەبو:

﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾.

هەروەها پێغەمبەر ﷺیش باسی تەرازوی رۆژی قیامەتی کردوە، جا هەر کەسێك وتەی پێغەمبەر ﷺ رەت کاتەوە واتە وتەی خوای رەت کردۆتەوە.[4]

شێخلئیسلام بەڵگەی هێناوەتەوە کە تەرازوی رۆژی قیامەت تەرازوێکی راستەقینەیەو مەجاز نیە بۆ دادو دادگەری، کردەوەکانیشی پێدەکێشرێ، دەڵێ:

---

[1] فتح الباري: (٥٣٨/١٣) بە دەسکاریەکی کەمەوە.

[2] تذكرة القرطبي: ٣١٣.

[3] النهاية لابن كثير: (٣٤/٢).

[4] فتح الباري: (١٣/ ٥٣٨).

((تەرازو: ئەوەیە کە کردەوەکانی پێ دەکێشرێ و گوزارشت نیە لە داد، لە قورنان و سوننەتیشدا ئاماژەی پێکراوە، وەکو دەفەرموێ: ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ﴾، ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾.

لە هەردو صەحیحانیشدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((کلمتان خفیفتان على اللسان، ثقیلتان في المیزان، حبیبتان إلى الرحمن: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظیم: دو وتە هەن لەسەر زمان سوك و هاسانن، بەلام لەسەر تەرازودا قورس و گرانن و لە لای خواش زۆر خۆشەیستن: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظیم)).

هەروەها لەبارەی قاچەکانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ فەرمویەتی:

((لهما في المیزان أثقل من أحد: قاچەکانی لەسەر تەرازودا لەچیای ئوحد گرانترن)).

لەو فەرمودەیەی کە باسی پسولە دەکات کە تیرمذیو ئەلحاکم و زانای تریش بە صەحیحیان داناوە کە لە ڕۆژی دواییدا پیاوێك دێنن نەوەت و نۆ لیستی بۆ دەردێنن هەر لیستێکی بگری تا چاو بڕ دەکات درێژە، دەیانخەنە سەر یەکێك لە (تا)کانی تەرازو، هەروەها پسولەیەکیش دێنن شایەدی (لا إله إلا الله)ی تێدایە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((فطاشت السجلات وثقلت البطاقة: ئیتر هەمو لیستەکان سوك و هەڵسەنگ دەبن و پسولەکەش قورس و داسەنگ دەبێ)).

ئەم فەرمودانەو فەرمودەی تریش ئەوەمان بۆ ڕون دەکەنەوە کە کردەوەکان بەهۆی سەنگ و قورساییەوە دەکێشرێن و چاکە و خراپەی پێ سەنگ و سوك دەبێ. بەم جۆرە دادگەریەکە دێتە دی، مەبەستیش لە (الوزن) دادگەریە وەکو تەرازوەکانی دنیا.

بەلام چۆنیەتی ئەم تەرازوانە سای هەمو پەنامەکیەکانیتر کارێکی پەنامەکیە و

سەرەدەری لێ دەر ناکەین)).[1]

قورتوبی وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە کە نکوڵیان لە تەرازو کردوەو دەقەکانی ئەو بوارەیان واتاویڵ کردوە، دەڵێ:

((زاناکانمان دەڵێن: ئەگەر وابێ و تەرازو بەوە لێکدەینەوە کە دەیڵێن، ئەوا دروستە پردی دۆزەخیش بە ئایینی ڕاست راڤە بکرێ، بەهەشت و دۆزەخیش بە شادی و پەژارەی گیانەکان و شەیتان و جنۆکەش بە رەفتارو ڕەوشتی بەدو فریشتەش بە هێزی چاك لێکدرێتەوە، کە ئەمانە هیچێکیان وانین و لێکدانەوەی نادروست و نابەجێن و فریان بەڕاستیەوە نیە. چونکە وەڵامی هەمو فەرمودەکانی خواو پێغەمبەر دەدەنەوە. خۆ لە صەحیحەکاندا هاتوە، دەفەرموێ: ((فیعطي صحیفة حسناته)). ((فیخرج له بطاقة)) ئەمانە بەڵگەن بۆ ئەوەی تەرازوەکە ڕاستەقینە بێ، کێشراوەکانیش کارنامەکان بن، هەروەکو لە پێشتردا ڕونمان کردۆتەوە. خواش زاناترە)).[2]

---

[1] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٤ .٢ .٣).

[2] تذكرة: ٣١.

## خوازگەی سێیەم

## تەرازو چ دەکێشێ؟

زانایان لەمەشدا ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەیە.

**یەکەم: خودی کردەوەکان دەکێشرێن:**

**بەو جۆرەی کە کردەوەکان دەبنە تەن(جسم) و دەخرێنە سەر تەرازو. ئەم فەرمودەیەی کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە بۆ ئەم بۆچونە بەڵگەیە:**

((كلمتان حبيتان إلى الرحمن، خفيفتان على اللسان، ثقيلتان في الميزان: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم: **دو وتە هەن لەسەر زمان سوك و هاسانن، بەڵام لەسەر تەرازودا قورس و گرانن و لە لای خواش زۆر خۆشەیستن: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم)).**[1]

**زۆر دەقی تریش هەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا کردەوەکان لە وێنەو شێوەی وا دێن کە بەس خوا دەیانزانێ چۆنن. بە نمونە: لەڕۆژی قیامەتدا قورئان دێت تکاخوازی بۆ قورئانخوێن دەکات، سورەتی بەقەرەو ئالی عیمران وەکو دو پەڵە هەور یان دو نیمچە پەلەهەور دێن یان وەکو دو چینە باڵندە دێن و داکۆکی لە قورئانخوێنەکە دەکەن.**

**ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:**

((إقرأوا القرآن، فإنه يأتي يوم القيامة شفيعاً لأصحابه. إقرأوا الزهراوين: البقرة وسورة آل عمران. فإنهما تأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان، أو غيابتان، أو فرقان من طير صواف تحاجان عن أصحابهما: **قورئان بخوێننەوە چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە تکاخوازی**

---

[1] صحيح البخاري، كتاب التوحيد، باب (ونضع الموازين القسط ليوم القيامة). فتح الباري (١٣/٥٣٧).

قورئانخوێنەکە. زەهراوەین -کە بەقەڕە و ئالی عیمرانە- بیانخوێننەوە، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو دو پەلە هەور یان وەکو دو سابات یان وەکو دو ڕەوە باڵندەی ڕیزبو دێن و داکۆکی لە قورئانخوێنەکە دەکەن تا نەچێتە دۆزەخ)).[1]

نەواسی کوڕی سەمعان دەڵێ: لە پێغەمبەرم گوێ لێبو دەیفەرمو:

((یؤتی بالقرآن یوم القیامة وأهله الذین یعملون به، تقدمه سورة البقرة وآل عمران. کأنهما غمامتان، أو ظلتان بینهما شرق، أو کأنهما فرقان من طیر صواف تحاجان عن صاحبهما: لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان و قورئانخوێنەکان دێنن؛ ئەوانەی کە ڕەفتاریان پێکردوە، سورەتی بەقەڕەو ئالی عیمران لە پێشەوەن وەکو دو پەلە هەورن یان وەکو دو ساباتن و شەوقێکیان لە نێوانە، یان وەکو دو ڕەوە باڵندەن و ڕیزیان بەستوە، دێن داکۆکی لە قورئانخوێنەکان دەکەن تا نەچنە دۆزەخ)).[2]

ئیبنو حەجەریش تاسەنگی داوەتە ئەم وتەیە و پشتیوانی خۆی بۆ دەربڕیوەو دەڵێ: ((صەحیح ئەوەیە کە کردەوەکان دەکێشرێن، ئەبو داود و تیرمذی تەخریجیان کردوە، ئیبنو حیببانیش لە ئەبو دەردا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ما یوضع فی المیزان أثقل من حسن الخلق: لەسەر تەرازودا هیچ شتێك لە ڕەوشت چاکی قورستر نیە)).

**دوەم: خودی کابرا دەکێشرێ:**

لەم بارەوە دەق هەیە کە بەندەکان دەخرێنە بەر تەرازو و بەگوێرەی بڕوایان سوك و قورس دەبن، نەك بە گوێرەی زەبەلاحی و لەڕو لاوازی. لە صەحیحی بوخاریدایە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((إنه لیأتي الرجل العظیم السمین یوم القیامة لا یزن عند الله جناح بعوضة، وقال: اقرأوا ﴿فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً﴾الكهف:١٠٥: لە ڕۆژی قیامەتدا پیاو هەیە کە دەیهێنن

---

[1] رواه مسلم. مشکاة المصابیح. (١/٦٥٦) ژمارە (٢١٢٠).

[2] رواه مسلم. مشکاة المصابیح: (١/٦٥٦) ژمارە (٢١٢١).

**هێند قەڵەو و زەبەلاحە کەچی لە لای خوا سەنگی باڵە پێشکەیەکیشی نیە، فەرموی: ئەم ئایەتە بخوێننەوە -واتاکەی:- هیچ سەنگ و کێشێکیان لە رۆژی قیامەتدا پێ نادەین)).[1]**

**پیاوی لاوازی قاچ باریکیش دێنن بەقەد شاخ و چیا قورسە.**

**ئیبنو مەسعود قاچی زۆر باریك بو، با لێی داو وەدەری خست، خەڵکەکە پێکەنین پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((بە چ پێدەکەنن؟)) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بە باریکی قاچەکانی.**

**فەرموی: ((بەو خوایەی گیانی منی لە دەستە لە سەر میزاندا لە شاخی ئوحد قورسترە)).[2]**

**شاعیریش جوانی وتوە:**

**تـــرى الرجـــل النحيـــف فتزدريـــه وفي أثـــوابه أســـد هـريـــــــر**
**ويعجبـــك الطـريـــر فتبتليـــه فيخلـف ظنـــك الرجـــل الطريـــر**

### سێیەم: کارنامەکان دەکێشرێن:

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:**

**((إن الله سيخلص رجلاً من أمتي على رؤوس الخلائق يوم القيامة، فينشر له تسعة وتسعين سجلاً، كل سجل مثل مدّ البصر، ثم يقول: أتنكر من هذا شيئاً؟ أظلمـــك كتبتي الحافظون؟ فيقول: لا يارب، فيقول: ألك عذر؟ فيقول لا يا رب. فيقـــول الله تعالى: بلى، إن لك عندنا حسنة، فإنه لا ظلم اليوم، فتخرج بطاقة فيها أشـــهد أن لا إله إلاّ الله، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، فيقول: احضر وزنك فيقول: يارب مـــا هذه البطاقة مع هذه السجلات؟ فيقول: فإنك لا تظلم، فتوضع السجلات في كفـة والبطاقة في كفّة، فطاشت السجلات، وثقلت البطاقة، ولايثقل مع اسم الله شـــيء:**

---

[1] صحيح البخاري. كتاب التفسير: فتح الباري: (٨/٤٢٦).

[2] رواه أحمد في مسنده عن زر بن حبيش عن ابن مسعود قال ابن كثير: تفرد أحمد وإسناده جيد قويّ. النهاية لابن كثير: (٢/٢٩).

خوا لە ڕۆژی قیامەتدا لەنێو سەرجەم خەڵکاندا پیاوێکی نەتەوەی من دێنێ کە نەوەت و نۆ لیستی بۆ دەخاتە رو هەر لیستێکی تا چاو بڕ دەکات دور و درێژە، خوا دەفەرموێ: تۆ ئەم هەمو تاوانەت هەیە ئایا نوسەرەکانی من ستەمیان لێکردوی؟ دەڵێ: نەخێر خوایە، دەفەرموێ: ئایا بیانو و پاساوت هەیە؟ دەڵێ: نەخێر. خوا دەفەرموێ: بەڵێ، چاکەیەکت لە لای ئێمەدا هەیە، چونکە ئەمڕۆ کەس ستەمی لێناکرێ، پاشان پسولەیەکی بۆ دەردەهێنن لە سەری نوسراوە (أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله) پێی دەفەرموێ: بۆ تەرازو ئامادە بە. دەڵێ خوایە ئەم پسولەیە چیە کە لەگەڵ ئەم لیستە دایە. دەفەرموێ: ستەمت لێناکرێ. ئینجا سەرجەم لیستەکان دەخرێتە تایەك و پسولەکەش دەخرێتە تایەکەی تر. ئیتر تای لیستەکان سوك دەبێ و تای پسولەکەش قورس و گران، چونکە هیچ شتێك لەگەڵ ناوی خوادا ناکێشرێ))[1].

قورتوبیش بۆ ئەم بۆچونە چوەو دەڵێ: (تەرازو کارنامەکان دەکێشێ و سوك و گران دەبێ... ئیبنو عومەر دەڵێ: ڕوپەری کردەوەکان دەکێشرێن، ئەگەر ئەوە بە ڕاست بسەلمێ ئەوا ڕوپەرەکان تەن(جسم)ن، خواش سەنگ و سوکی تایەکان بە گوێرەی زۆری کردەوەکانی ناو کارنامەکە دەکات کە دەبێتە مایەی بەهەشت و دۆزەخ))[2].

سەفارینی دەڵێ: ڕاستەکەی ئەوەیە کە کارنامەکان هەڵدەسەنگێنرێن، ئیبنو عبدالبّر و قورتوبیو زانای تریش ئەوەیان بە ڕاست داناوە، شێخ مەرعیش لە (بەهجەتەکەیدا) ئەوەی بە ڕاست داناوە، کۆمەڵە تەفسیرزانێکیش هەر وای بۆ چونە؛ ئیبنو عەطییەش لە ئەبیلمەعالی دەگێڕێتەوە..))[3].

---

[1] رواه الترمذي في سننه عن عبدالله بن عمر بن العاص. جامع الأصول: (٤٥٩/١٠) ژمارە (٧٩٨١) وقـال محقق الجامع: اسناده صحيح ورواه ابن ماجه وابن حبان في صحيحه والحاكم والبيهقي وغيرهم. لوامع الأنوار البهية: (١٨٧/٢).

[2] تذكرة القرطبي: ٣١٣.

[3] لوامع الأنوار البهية: (١٨٧/٢).

ڕەنگــە ڕاســتەکەی ئــەوەبێ هەرســێکیان بکێشــرێن، واتــە: کــابراو کــردەوەو کارنامەکــە، چونکــە هەرسێکیان بەڵگــەیان هەیــە، هــەروەکو لــە پێشــودا هێنامانــەوە، هیچ دەقێکیش نیە بڵێ یەك لەو سێیانە ناکێشرێن. کەواتە کــۆی هــەمو دەقــەکان ئەوەیە کە هەرسێکیان دەکێشرێن.

حافظلحەکەمیش ئەودی تاسەنگ داوەتەوەو دەڵێ: (خـوا زاناتـرە بــەڵام ئــەوەی لەســەرجەم دەقەکانــەوە بــۆ مــن دەرکــەوتوە خــودی کــابراو کــردەوەو کارنامەکــەی. هەرســێکیان دەکێشــرێن چونکــە ئــەو فەرمودانــەی لــەم بــارەوە هــاتون هەرســێکیانی ســەلماندوە. هیــچ نــاکۆکی و ناســازیەکیش لــەنێوانیاندا نیــە، هــەروەها ئــەو فەرمودەیــەی ئەحمــەد ﷺ لــە عــەبدوڵڵای کــوڕی عــەمری کــوڕی عــاص دەیگێڕێتــەوە بەڵگەیە بۆ ئەم بۆ چونە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((توضع الموازين يوم القيامة، فيؤتى بالرجل، فيوضع في كفة، ويوضع مــا أحصــى عليــه، فيمايل به الميزان. قال: فيبعث به إلى النار. قال: فإذا أدبر، إذا صائح من عند الرحمن ﷻ يقــول: لا تعجلوا، فإنه قد بقي له، فيؤتى ببطاقة فيها لا اله الا الله، فتوضع مع الرجل في كفه، حتى يميــل به الميزان: واتە تەرازو دادەمەزرێ، پیاوێك دێنن لە تایەکی دادەنێن و کردەوەکانیشی لە تایەکەیتر بەڵام لای ئەو سوك دەبیێو بەرەو دۆزەخ ڕاپێچی دەکەن. کە دەیبەن، بانگــهێژێك لــە لای خــواوە بــانگ دەکــات و دەڵــێ: پەلــە مەکــەن شــتێکی مــاوە، پسولەیەکی بۆ دێنن لە ســەری نوســراوە لا إلـه إلاّ الله، لەگەڵ پیاوەکە دەیخەنە بەر تەرازو ئەم جارە لای ئەو قورس دەبێ)).

ئەم فەرمودەیــە بەڵگەیــە بۆ ئــەوەی هــەم کــابراو کردەوەکــانی هــەم کارنامەکەشــی دەخرێنە بەر تەرازو و دەکێشرێن، بەم جۆرە هەمو فــەرمودەکان پێکــەوە کۆدەبنــەوە. سوپاس و ستایش بۆ خوا).[1]

[1] معارج القبول: (٢/٢٧٢).

## خوازگەی چوارەم

## ئەو کردەوانەی لە تەرازودا زۆر قورسن

**گرانترین کردەوە لەسەر تەرازو رەوشت باشیە:**

**لە ئەبو دەرداء ﷺەوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((إن أثقل شيء يوضع في ميزان العبد يوم القيامة خلق حسن، وان الله يبغض الفاحش البذيء: **قورسترین کردەوە لە تەرازوی رۆژی قیامەتدا رەوشتی چاکە، خوا مرۆی بەدکار و هیچ و پوچی خۆش ناوێت**))[1].

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((كلمتان حبيبتان إلى الرحمن، خفيفتان على اللسان، ثقيلتان في الميزان: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم: **دو وتە هەن لەسەر زمان سوك و هاسانن، بەلاّم لەسەر تەرازودا قورس و گرانن و لە لای خواش زۆر خۆشەیستن: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم**))[2].

**ئەبو مالیكی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((الطهور شطر الإيمان والحمد لله تملأ الميزان وسبحان الله والحمد لله تملآن (أو تملأ) ما بين السماء والأرض))[3].

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

---

[1] رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح وروى أبو داود الفصل الأول. مشكاة المصابيح:(٦٣٠/٢)ژمارە(٥٠٨١).

[2] رواه البخاري ومسلم والترمذي. جامع الأصول: (٣٩٧/٤) ژمارە (٢٤٦٢).

[3] صحيح مسلم: (٢٠٣/١) ژمارە (٢٢٣).

((من احتبس فرساً في سبيل الله، إيماناً بالله، وتصديقاً بوعده، كان شبعه وريُّه، وروثه، وبوله، حسنات في ميزانه يوم القيامــة: **هـەر كەسـێك بڕوای بـە خـواو بـە بەڵێنـەكانی هـەبێ و لـە پێناو جیهادی ڕێی خوا ئەسپێك ڕاگریۆ نان و ئاوی بداتێ و مۆڵگە پاك بكاتەوە لـە تەرازوی ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە چەندین چاكە))**.[1]

---

[1] رواه البخاري والنسائي وأحمد. صحيح الجامع الصغير: (٢٢٩/٥) ژمارە (٥٨٤٣).

## بەندی سێزدەم

# کانیاوی کەوسەر

خـوا لـە کۆبونـەوە هـەرە فردوانەکـەی ڕۆژی قیامـەتدا ڕێـز لـە موحەممـەدی پێغەمبەرﷺ دەنێ و کانیاوێکی پان و پۆڕ و بەرینی پێ دەبەخشێ. کە ئاوەکەی لە شیر سپیترەو لە هەنگوین شیرنترەو بۆن و بەرامەکەی لە میسک و گولاو خۆشترە و پەرداخ و کاسەکانیشی وەکو ئەستێرەکان زۆر و بریسکەدارن، ئەم کانیاوە لە ئاوی روباری کەوسەرەوە سەرچاوەی گرتوە کە خوا لە بەهەشتێدا بە پێغەمبەر ﷺی بەخشیوە. نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ دەچنە سەر ئەم کانیاوەو لێی تێراو دەبن و هەرکەسێك قومێکی لێبخواتەوە بۆ هەمیشە تێنوی نابێ.

زانایان لە شوێنەکەیدا را و بۆچونیان جیاوازە. غەزالی و قورتوبی پێیان وایە لە گۆڕەپانی کۆبونەوە دایە بەر لە پەڕینەوەی پردی دۆزەخ، ئەوە بە بەڵگە دێننەوە کە هەندێ کەس دوای ئەوەی دەگەنە کانیاوەکە بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن. جا ئەگەر کانیاوەکە لە دوای پردی دۆزەخ بوایە ئەوا دۆزەخیەکان نەیدەگەیشتنێ.[1]

ئیبنو حەجەریش پێی وایە بوخاری پێی وابوە لە دوای پردی دۆزەخدایە چونکە فەرمودەکانی کانیاوی کەوسەری لە دوای فەرمودەکانی تکاخوازیو چەسپ کردنی پردی دۆزەخ هێناوەتەوە.[2]

بەڵام ئەوەی قورتوبی بۆی چوە پەسەندترە. ئیبنو حەجەر بەڵگەکانی هەردو چینی لە پەرتوکە نایابەکەیدا (فتح الباري) نوسیوە.[3]

---

[1] سەرچاوە تذكرة القرطبي ٣٠٢.

[2] سەرچاوە فتح الباري (١١/٤٦٦).

[3] فتح الباري (١١/٤٦٦).

## جێباسی یەکەم

### ئەو فەرمودانەی لەم بارەوە هاتون

**فەرمودەکانی لەم بابەتەوە هاتون پلەی تەواتوریان هەیە، زانایان گومانیان لەم تەواتورەدا نیە، پتر لە پەنجا یاوەر ﷺ فەرمودەیان لەم بارەوە گێڕاوەتەوە، ئیبنو حەجەر ناوی هەمو یاوەرە بێژەرەکانی یاد کردوە.**[1]

**ئێمەش لێرەدا چەند فەرمودەیەك دێنینەوە کە خەطیبی تەبریزی لە میشکاتەکەیدا نوسیویەتی:**[2]

**١- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر کە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((حوضي مسيرة شهر، وزواياه سواء، ماؤه أبيض من اللبن، وريحه أطيب من المسك، وكيزانه كنجوم السماء، من يشرب منها فلا يظمأ أبداً: **کانیاوەکەم درێژیەکەی یەك مانگە رێیە، گۆشەو سوچەکانی لە پانیو درێژیدا وەکو یەکن، ئاوەکەی لە شیر سپیترە، بۆنی لە میسك خۆشترە، گۆزە و جامی قەراخەکانی وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان زۆر و بریسکەدارن، هەر کەسێك لێی بخواتەوە بۆ هەمیشە تێنوی نابێت)).**[3]

**٢-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((إن حوضي أبعد من أيلة من عدن لهو أشدُّ بياضاً من الثلج. وأحلى من العسل باللبن، ولآنيته أكثر من عدد النجوم، وإني لأصد الناس عنه كما يصد الرجل إبل الناس عن حوضه. قالوا: يا رسول الله! أتعرفنا يومئذ؟ قال: نعم، لكم سيماء ليست لأحد من الأمم، تردون علي غراً محجلين من أثر الوضوء:

---

[1] فتح الباري: (١١/٤٦٨).
[2] مشكاة المصابيح: (٣/٦٨).
[3] متفق عليه.

پانی کانیاوەکەم لە ماوەی نێوان ئەیلەو عەدەن دورترە، ئاوەکەی لە بەفر سپیترە، تامەکەی لە هەنگوین و شیر شیرنترە، جام و پەرداخەکانی لە ژمارەی ئەستێرەکان زۆرترە، هەروەك چۆن ئەو کابرایەی وشتری خەڵك لە ئاوی حەوزەکەی پاس دەکات منیش خەڵکی‌تر لە کانیاوەکەم پاس دەکەم. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! لەو رۆژیدا دەماننناسیەوە؟ فەرموی: بەڵێ، ئێوە نیشانەیەکتان هەیە هیچ نەتەوەیەکی‌تر نیەتی. ئێوە بە دەست و پێ و نێو چەوانێکی گەش و روناك و سپی دێنە سەر کانیاوەکە کە بە ئاسەواری دەستنوێژەوە وا سپی دەبن)). موسلیم گێڕاویەتەوە.

لە بێژانەوەیەکی تریدا ئەنەس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((ترى فيه أباريق الذهب والفضة كعدد النجوم: کاسەو جامی زێڕو زیوینی تێد دەبینی کە هێند زۆرن بەقەد ژمارەی ئەستێرەکان دەبن)).

هەر موسلیم لە بێژانەوەیەکی‌تردا لە ثەوبان ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺیان پرسی ئاوی کانیاوەکەی چۆنە؟ فەرموی:

((أشد بياضاً من اللبن. وأحلى من العسل يغت، فيه ميزابان يُمدَّانه من الجنة، أحدهما من ذهب والآخر من ورق: رەنگی لە شیر سپیترە، چێژی لە هەنگوین شیرینترە، دو پلوسکی لە بەهەشتەوە تێدا هەڵدەقوڵێ یەکێکیان لە ئاڵتونە و ئەوەی تریشیان لە زیوە)).

## جێباسی دووەم

### ئەوانەی لەکانیاوەکە فەرمویان لێدەکرێو ئەوانەی پاس دەکرێن

زۆر فـەرمودە لـەم بـارەوە هـاتون، ئێمـەش لـێرەدا هـەندێکیان دێنینـەوە کـە ئیبنولئەثیر لە (جامع الأصول)دا نوسیویە:[1]

١-پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أنا فرطكم على الحوض، وليرفعن إلى رجال منكم، حتى إذا أهويت إليهم لأناولهم اختلجوا دوني، فأقول: أي رب، أصحابي، فيقال: إنك لا تـدري مـا أحدثوا بعـدك؟: من پێشڕەوتانم بۆ سەر کانیاوی کەوسەر، فریشتەکان هەندێکتان دەگێڕنەوەو من دەچم بیانهێنمەوە بەڵام ئەوان خێرا دەیانبەن دەڵێم: خوایە ئەوانە یاوەری منن. دەفەرموێ: تۆ نازانی لە دوای تۆدا چیان کردوە؟!)).[2]

٢- دەفەرموێ: ((ليردن على الحوض رجال ممن صاحبني، حتى إذا رأيتهم، ورفعـوا إلي، اختلجوا دوني، فلأقولن: أي رب، أُصَيْحَابِي أُصَيْحَابِي، فَلَيُقَالَنَّ لِي: إنك لا تدري مـا أحدثـوا بعدك. -وفي رواية- ليردن علي ناس من أمتي... الحديث، وفي آخره: فأقول: سحقاً لمن بـدل بعدي)).[3]

٣- دەفەرموێ: ((انا فرطكم على الحوض، من ورد شرب ومن شـرب لم يظمـأ أبـداً، وليردن على أقوام أعرفهم ويعرفوني ثم يحـال بيـني وبينـهم: من بۆ سەر ئاوی کەوسەر پێشڕەوتانم، ئەوەی بێتە ئەوێ دەیخواتەوە، ئەوەی بیخواتەوە بۆ هەمیشە تێنوی نابێ، بەڵام هەندێ کەسم لە گەڵدان چاك دەیا... دەمناسن لێم جودا دەکرێنەوە)).

---

[1] جامع الأصول: (١٠/٤٦٨).

[2] رواه البخاري ومسلم عن عبد الله بن مسعود ﷺ.

[3] رواه البخاري ومسلم عن أنس بن مالك ﷺ.

ئەبو حازم دەڵێ کە من ئەو فەرمودەیەم دەگێڕایەوە، نوعمانی کوڕی ئەبی عەییاش گوتی: بە خۆت لە سەهلت گوێ لێبو؟ گوتم: بەڵێ، دەنا منیش گەواهی دەدەم کە ئەبو سەعیدی خودری ئەوەندەی پتر گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((فاهم مني فيقال: انك لا تدري ما احدثوا بعدك فاقول سحقا سحقا لمن بدل بعدي: دەڵێم ئەوانە لە نەتەوەی منن. پێم دەڵێن: تۆ نازانی لە پاش تۆ چیان کردوە! دەڵێم: هەی تونا وتون بێ، هەی تونا وتون بێ ئەو کەسەی لە دوای من هەڵگەڕاوەتەوە)).[1]

٤- دەفەرموێ: ((يرد علي يوم القيامة رهط من أصحابي – أو قال من أمتي – فَيُحَلَّؤون عن الحوض، فأقول: يارب، أصحابي، فيقول: إنه لا علم لك بما أحدثوا بعدك إنهم ارتدوا على أدبارهم القهقري. وفي رواية فيجلون: کۆمەڵێك لە یاوەرانم یان کۆمەڵێك لە نەتەوەکەم بەرەو سەر کانیاوێ دێن بەلاّم بەرهەڵستی دەکرێن و پاڵەستۆ دەدرێن، دەڵێم خوایە ئەوانە یاوەری منن، دەفەرموێ: تۆ نازانی لە دوای تۆدا چیان کردوە ئەوانە لە دین پاشگەز بوینەوە)).[2]

بوخاریش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((بينما أنا قائم على الحوض، إذا زمرة، حتى إذا عرفتهم خرج رجل من بيني وبينهم، فقال: هلم، فقلت: إلى أين؟ فقال: إلى النار والله، فقلت: ما شأنهم؟ فقال: إنهم قد ارتدوا على أدبارهم القهقري، ثم إذا زمرة أخرى، حتى عرفتهم خرج رجل من بيني وبينهم فقال لهم: هلم، قلت إلى أين؟ قال: إلى النار والله، قلت: ما شأنهم؟ قال: إنهم قد ارتدوا على أدبارهم، فلا أراه يخلص منهم إلاّ مثل همل النعم: لەو وەختەدا کە لە سەر کانیاوەکەم راوەستابوم کۆمەڵە خەڵکێك و هاتن لێم نزیك بونەوە تا ناسیمن، کە ناسیمن فریشتەیەك لە نێوان من و ئەواندا چوە دەرێ و پێی وتن: دەی بیانهێنن، وتم بۆ کوێ؟ وتی بۆ ئاگر. گوتم

[1] رواه البخاري ومسلم عن ابي حازم – رحمه الله – عن سهل بن سعد ﷺ.
[2] رواه البخاري ومسلم عن أبي هريرة ﷺ.

چیان کردوه؟ وتی: له پاش تۆدا لـه دیـن هەڵگەڕانەوه پاشـان کۆمەڵێکیتر هـاتن بە هەمان شێوه بۆ ئاگر ڕاپێچ کران. پێم وانیه ئەم کۆمەڵانە رزگاریان ببیٚ مەگەر وەك وشتریٚ کە لە گەلە وشتری خاوەنەکەی بزر بوبیٚ، واتە کەمیان رزگاریان دەبیٚ)).

موسلیمیش دەگێڕێتەوه کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((ترد علي أمتي الحوض، وأنا أذود الناس عنه، كما يذود الرجل إبل الرجل عن إبله، قـالوا: يا نبي الله تعرفنا؟ قال: نعم، لكم سيما ليست لأحد غيركم، تردون غراً محجلين من آثار الوضوء وليصدن عني طائفة منكم، فلا يصلون، فأقول: يا رب، هؤلاء من أصحـابي، فيجـيء ملـك، فيقول: وهل تدري ما أحدثوا بعـدك؟: خەڵك دێـن بـۆ سـەر كانیاوەكـەم منیش غـەوارەو بێگانـان پـاس دەكـەم وەك چـۆن كابرایـەك وشـتری خـەڵكی لــە ئـاوی حەوزەكـەی دەردەكـات، پرسیان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا دەماننـاسـیەوه؟ فـەرموی: بـەڵیٚ، ئێـوه نیشـانەیەكی واتـان هەیـه هیـچ نەتەوەیـەكیتر نیـەتی، دەسـت و پـیٚو نێوچـەوانتان لەبـەر ئاسـەواری دەسـنوێژ گـەش و ڕونـاك و سـپیه. بـەڵام كۆمــەڵێكیتر دێــن فریشتەكان بەرهەڵستیان لێدەكەن و لێناگەڕێن بێـن. دەڵێم: خوایـە! ئەوانـه یـاوەری منن. فریشتەیەك دێت و دەڵیٚ: جا دەزانی لە دوای تۆدا چیان كردوه؟)).

هەر لەبێژانەوەیەكی تری موسلیمدا دەڵیٚ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((إن حوضي أبعد من أيلة من عدن، لهو أشد بياضاً من الثلج، وأحلى من العسـل بـاللبن، ولآنيته أكثر من عدد النجوم، وإني لأصد الناس عنه كما يصد الرجل إبل الناس عن حوضـه، قالوا: يا رسول الله، اتعرفنا يومئذ؟ قال: نعم، لكم سيماً ليست لأحد من الأمم، تـردون علـيَّ غراً محجلين)).

قورتوبی لـه تەذكیرەكـەیدا هـەندێكی لـەو فەرمودانـه هێناوەتـەوەو پاشـان دەڵـیٚ: ((زانایانمان (بەر میهری خوا بن) دەڵێن: هەمو ئەوانەی لە دین هەڵگەڕاینەوه یاخود شتی وایان هێناوەتە ناو دین كە خوا پێی رازی نیەو ڕێی پیٚ نەداوه، لە كانیاوەكە پاس دەكرێن و لێی دور دەخرێنەوه، ئەوانەی لە كۆمەڵی موسڵمانان لاڕیٚ بونە و لە

ڕێبازکەیان دەرچونە بە توندتر دور دەخرێنەوە وەکو چینەکانی خەواریج و ڕەوافیزەکان و موعتەزیلەکان.

هەروەها ستەمکارە تاوانکارەکانیش کە ستەم و زۆرداریان کردوەو هەقیان فەوتاندوەو هەقپەروەرانیان کوشتوە و زەبونیان کردون، هەروەها ئەوانەی بە ئاشکرا پەیڕەو لە گوناحە گەورەکان دەکەن و گاڵتە بە گوناح دەکەن و پێیان وایە ئاویان خواردۆتەوە. هەروەها ئەوانەش کە وەدوای ئارەزو بیدعەکارکای کەوتون.

ڕەنگە گوناحبارەکان لە سەرەتادا دور خرێنەوە، بەڵام ئەگەر خوا لێیان خۆش بێ‌و خراپەکانیان بۆ بکاتە چاکە ئەوا پاشان ڕێیان پێ بدرێ بچنە سەر کانیاوەکە و لێی بخۆنەوە، بەو مەرجەی لە بیروباوەڕ لایان نەدابێ. بەم جۆرە بە سای روناکی دەسنوێژەوە دەناسرێنەوە و پاشان پێیان دەوترێ تونا و تون بن. ئەگەر مەبەست دوڕوەکانیش بێ کە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺدا خۆیان بە موسڵمان نیشان دەدا بەڵام لە دڵەوە بێبڕوا بون، ئەوا تەماشای ڕواڵەتیان دەکرێ پاشان پەردەیان لەسەر دەپێچرێتەوەو هەقیقەتیان دەردەکەوێ ئینجا پێیان دەوترێ: هەی تونا و تون بن، هەی توناو تون بن.

هیچ کەسێکیش بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا نامێنێتەوە مەگەر ئەوانەی بێبڕواو هاوبەشپەرست بون. کە بەقەد گەردێکیش بڕوایان لە دڵدا نیە)).[1]

[1] تذكرة القرطبي: ٣٠٦.

بەندی چواردەم

# بەرەوهەواری هەمیشەیی: بەهەشت یان دۆزەخ

## جێباسی یەکەم

### هەمو نەتەوەیەك داوای لێدەكرێ وەدوای پەرستراوەكەی بكەوێت

لە کۆتایی ئەم رۆژەدا بەندەکان بەرەو سەرەنجامی هەمیشەیی دەچن، جا یان بۆ بەهەشتی نەمری یان بۆ دۆزەخی بێکۆتا. کە ئەم دوانە دواهەمین سەقامگەی سەرجەم بەندەکانن.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەکانیدا پێی راگەیاندوین لە پایانی ئەم رۆژەدا فەرمان بە هەمو نەتەوەکان دەکرێ وەدوای پەرستراوەکانیان بکەون، جا ئەوانەی کە خۆریان پەرستوە وەدوای خۆر دەکەون، ئەوانەی مانگیان پەرستوە وەدوای مانگ دەکەون، ئەوانەی بتیان پەرستوە وەدوای بتەکانیان دەکەون، ئەوانەی فیرعەونیان پەرستوە وەدوای فیرعەون دەکەون، پاشان هەمو بەناو خواکان بۆ قولایی ئاگر تورِ دەدرێز شوێنکەوتوەکانیش بە دوایاندا بەردەبنەوە ناو ئاگری پرِ هورروژم، هەروەکو خوا لەبارەی فیرعەونەوە دەفەرموێ:

﴿ يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ: لە رۆژی قیامەتدا فیرعەون وەپێش شوێنکەوتوانی دەکەوێت و دەیانباتە ناو

دۆزەخەوە. بەڕاستی دۆزەخ خراپترین جێگایە بۆ چونە ژورەوە﴾هود:٩٨.

پاشان تەنها بڕوادارو نامەوەرەکان(اهل الکتاب) دەمێننەوە، لە نێو بڕوادارەکانیشدا دوڕو هەن. ئینجا خوا دەچێتە لایان و پێیان دەڵێ: چاوەڕێی چ دەکەن؟. دەڵێن چاوەڕێی پەروەردگارمانین، ئینجا خوا قاچی خۆی وەدەردەخات و دەیناسنەوە، کە ئەمە دەبینن یەکسەر سوژدە دەبەن، هەمو بڕوادارەکان سوژدەی خۆیان دەبەن تەنها دوڕوەکان نەبێ:

﴿ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلا يَسْتَطِيعُونَ: لەو ڕۆژیدا خوا قاچی خۆی وەدەردەخات، سەرجەمیان بانگ دەکرێن سوژدە ببەن بەڵام دوڕوەکان ناتوانن.﴾القلم:٤٢.

پاشان بڕوادارەکان وەدوای خوا دەکەون، پردی دۆزەخ رادەئەنگێورێ، بڕوادارەکان ڕوناکی خۆیانیان پێدەدرێ، لەبەر ڕۆشناییدا بەسەر پردی دۆزەخدا تێدەپەڕن، بەڵام روناکی دوڕوەکان دەکوژێتەوە و پێیان دەگوترێ: بگەڕێنەوە دنیا لەوێدا روناکی وەدەست بێنن. ئینجا شورەیەکیان لەنێودا بنیاد دەبێ و لە یەکتریان جیادەکاتەوە. ناوەوەی شورەکە کە لای بڕوادارەکانە پڕ لە میهرەبانی خوایە، دەرەوەشی کە لای دوڕوەکانە پڕ لە سزاو ئەشکەنجەیە. بڕوادارەکان بەپێی زۆرو کەمی بڕواو کردەوە چاکەکانیان بە خێرایی بەسەر پردەکەدا دەپەڕنەوە.

موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

((إذا كان يوم القيامة أذن مؤذن: لتتبع كل أمة ما كانت تعبد، فلا يبقى أحد كان يعبد غير الله سبحانه من الأصنام والأنصاب إلا يتساقطون في النار، حتى إذا لم يبق إلا من كان يعبد الله من بر وفاجر. وغُبّر أهل الكتاب، فيدعى اليهود فيقال لهم: ما كنتم تعبدون؟ قالوا: كنا نعبد عزير ابن الله. فيقال: كذبتم، ما اتخذ الله من صاحبة ولا ولد، فماذا تبغون؟ قالوا: عطشنا يا ربنا فاسقنا. فيشار إليهم: ألا تردون؟ فيحشرون إلى النار كأنها سراب يحطم بعضها بعضا،

فيتساقطون في النار..

ثم يدعى النصارى، فيقال لهم: ما كنتم تعبدون؟ قالوا: كنا نعبد المسيح ابن الله، فيقال لهم: كذبتم ما اتخذ الله من صاحبة ولا ولد، فيقال لهم: ماذا تبغون؟ فيقولون: عطشنا يا ربنا فاسقنا، قال: فيشار إليهم: ألا تردون؟ فيحشرون إلى جهنم كأنها سراب يحطم بعضها بعضا، فيتساقطون في النار.

حتى إذا لم يبق إلا من كان يعبد الله تعالى من بر وفاجر، أتاهم رب العالمين سبحانه وتعالى في أدنى صورة من التي رأوه فيها، قال: فماذا تنتظرون؟ تتبع كل أمة ما كانت تعبد. قالوا: يا ربنا، فارقنا الناس في الدنيا أفقر ما كنا إليهم ولم نصاحبهم، فيقول: أنا ربكم. فيقولون: نعوذ بالله منك لا نشرك بالله شيئا (مرتين أو ثلاثا) حتى إن بعضهم ليكاد أن ينقلب، فيقول: هل بينكم وبينه آية فتعرفونه بها؟ فيقولون: نعم فيكشف عن ساق، فلا يبقى من كان يسجد لله من تلقاء نفسه إلا أذن الله له بالسجود ولا يبقى من كان يسجد اتقاء ورياء إلا جعل الله ظهره طبقا واحدة كلما أراد أن يسجد خر على قفاه، ثم يرفعون رؤوسهم وقد تحول في صورته التي رأوا فيها أول مرة، فقال: أنا ربكم. فيقولون: أنت ربنا.

ثم يضرب الجسر على جهنم وتحل الشفاعة ويقولون: اللهم سلم سلم..

قيل: يا رسول الله، وما الجسر؟ قال دحض مزلة، فيه خطاطيف وكلاليب وحسك، تكون بنجد فيها شويكة يقال لها؛ السعدان، فيمر المؤمنون كطرف العين، وكالبرق وكالريح وكالطير وكأجاويد الخيل والركاب، فناج مسلم ومخدوش مرسل ومكدوس في نار جهنم

**لە ڕۆژی دواییدا بانگهێژێك بانگ ڕادەبێرێو دەڵێ: با هەمو نەتەوەیەك وەدوای پەرستراوەكەی بكەوێت، ئەوجا ئەوانەی بەناوخوا و بت و بەرد و داریان پەرستو لەگەڵ بەناوخواكانیان بەردەبنەوە ناو ئاگری دۆزەخ. تەنها بڕوادارانی چاك و خراپ و نامەوەران دەمێننەوە.**

**بانگی جولەكەكان دەكرێت و پێیان دەگوترێ: كێتان پەرستوە؟ دەڵێن: عوزەیری كوڕی خوا. پێیان دەڵێن: درۆتان كرد خوا ژن و منداڵی نیە، ئەدی چتان دەوێ**

دەڵێن: زۆرمان تێنوە، خوایە! ئاومان بدیٚ، ئامادەیان بۆ دەکریٚ بۆ ناچن ئاو بخۆنەوە. هەموویان کۆدەکرێنەوە تا بخرێنە ناو دۆزەخ، دۆزەخ چ دۆزەخ؟! دەڵێی سەرابە یەکتری تێکدەشکێنیٚ، پاشان هەموویان دەکەونە ناو ئاگرەکەوە.

فەلەکانیش بەهەمان جۆر دەخرێنە ناو دۆزەخ. ئەوجا تەنها ئەوانەی خوایان پەرستوە دەمێننەوە کە چاك و خراپیان تێدایە. خوا لە وەسفێکی نزیك لەو وەسفەی خوایان پیٚدیوە دەچێتە لایان، دەفەرمویٚ: ئێوە چاوەڕوانی چ دەکەن؟ خەڵك هەر کەس وەدوای پەرستراوەکەی خۆی کەوتوە. دەڵێن: پەروەردگار! لە وەختێکدا لە خەڵك جویٚ بوینەوە لە هەمو وەختان پتر پێویستمان پیٚ هەبون، برادەرایەتیو هاوڕێیەتیمان لەگەڵدا نەکردن جا چۆن ئەمڕۆ دەبینە هاوڕێیان؟ پێیان دەڵیٚ: من خواتانم. دەڵێن: پەنا بەخوا دەگرین لە تۆ، هاوبەش بۆ خوا پەیدا ناکەین (دو سیٚ جاران وا دەڵێن) تەنانەت هەندێکیان خەریك دەبیٚ وەربگەڕێن. پێیان دەڵیٚ: هیچ نیشانەیەك هەیە خوای پیٚ بناسنەوە؟ دەڵێن بەڵیٚ، قاچی خوا! ئیتر خوا قاچی خۆی وەدەر دەخات و دەسبەجیٚ سوژدەی بۆ دەبەن، تەنها ئەوانە دەتوانن سوژدە ببەن و ئیزن دەدرێن کە بە پاك و ئیخلاصیەوە سوژدەیان بۆ خوا بردوە بەلاّم ئەوانەی بۆ چاوڕای خەڵك و بۆ ناو و دەنگ و ڕیایی سوژدەیان بردوە ناتوانن، کە دوڕوەکانن، ئەوانە پشتیان وەك تەختی ڕەقی لێدێت و نانوشتێتەوە، هەر وەختیٚ تەمایان دەبیٚ سوژدە ببەن بەسەر پشتدا دەکەون، لە دواییدا بڕوادارەکان کە سەریان لە سوژدە قیت دەکەنەوە خوا چوەتە ئەو شێوەیەی کە لە یەکەمجار خوایان لەو شێوەیەوە دیتبو. ئەوجا دەفەرمویٚ من خواتانم. دەڵێن: بەڵیٚ تۆ خوامانی.

پاشان پردی دۆزەخ ڕادەنگێوریٚ و کاتی تکاخوازی دێت، تکاخوازەکان دەڵێن: خوایە سەلامەتی، خوایە سەلامەتی، نەکەونە ناو دۆزەخ.

لە پێغەمبەریان پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا پردی دۆزەخ چیە؟ فەرموی: خلیسکە، پێی لیٚ هەڵدەخلیسکیٚ، دڕك و قولاب و گازێکی زۆریشی تێدایە، دڕکی سەعدانی تێدایە کە لە نەجددا شین دەبیٚ. بڕوادار هەیە بە چاو تروکانێك گوزەر

دەكات، هی وا هەیە وەكو بروسك، هەیە وەكو با، وەكو باڵندە، وەكو ئەسپی چاك وەكو سوار... ڕادەبورێ. هەندێكیان ڕزگاریان دەبێ‌و بە ساغی دەردەچن و هەندێكیان لە گازو دڕكەكان گیر دەبن بەڵام ڕەها دەبن و دەردەچن، بەڵام هەندەكەی‌تر سەرەوژێر بەردەبنەوە ناو دۆزەخ))[1].

هەردیسان موسلیم لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمودەیەك لە بارەی چۆنیەتی گوزەركردنی سەر پردی دۆزەخدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((وترسل الأمانة والرحم، فتقومان على جنبتي الصراط يميناً وشمالاً، فيمر أولكم كالبرق، قال: قلت: بأبي أنت وأمي، أي شيء كالبرق؟ قال: ألم تروا إلى البرق كيف يمرُّ ويرجع في طرفة عين؟ ثم كمرّ الريح، ثم كمرِّ الطير وشدِّ الرحال، تجري بهم أعمالهم، ونبيكم قائم على الصراط يقول: رب ، سلم سلم. حتى تعجز أعمال العباد، حتى يجيء الرجل فلا يستطيع السير إلاّ زحفاً، قال: وعلى حافتي الصراط كلاليب معلقة مأمورة بأخذ من أمرت به. فمخدوش ناج، ومكدوس في النار:

ڕاسپاردە و میهریش دەنێردرێن لە هەردو لای ڕاست و چەپی پردی دۆزەخ ڕادەوەستن، یەكەمین كەستان وەكو بروسك تێدەپەڕێ. ئەبو هورەیرە، یان حوذەیفە لێی پرسی ئەی پێغەمبەری خوا دایك و باوكم بە قوربانت بێ چ شتێك وەكو بروسك ڕادەبورێ؟ فەرموی: نەتاندیوە بروسك چۆن لە چاو تروكانێكدا دێت و دەڕوات؟ پاش وەكو با پاشان وەكو باڵندە پاشان وەكو غاردانی پیاو ڕادەبورن، كردەوە دەیانڕوێنێ پێغەمبەریشتان لە سەر پردەكە ڕاوەستاوەو دەڵێ: خوایە سەلامەتی بكە خوایە سەلامەتی بكە با بپەڕێتەوە بەم جۆرە تا كردەوە دەسەوسان دەبێ و چیتر ناتوانێ بیانپەڕێنێتەوە، وای لێدێ پیاو بە چنگە كرێ نەبێ ناتوانێ بڕوا، لە هەردو لای پردەكە قولاب و گازی هەڵواسراو هەیە ئەگەر فەرمانی پێ بكرێ كەسێك بگرێ دەیگرێ، جا هەیە دەڕوشێ‌و ڕزگاری دەبێ هەشە دەكەوێتە ناو ئاگر. سوێند بەو خوایەی گیانی ئەبو هورەیرەی لە دەستە قوڵایی دۆزەخ حەفتا پایز دەبێ))[2].

---

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الإيمان، باب معرفة طريق الرؤية، (١٦٧/١) ژمارە (١٨٣).

[2] رواه مسلم في صحيحه. كتاب الإيمان. باب أدنى أهل الجنة (١٨٧/١) ژمارە (١٩٥).

**هەمدیسان موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە ئەبوزوبێر دەگێڕێتەوە کە گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا بو لە وەڵامی پرسیارێك دەربارەی چۆنیەتی پەڕینەوە بە سەر پردی دۆزەخدا ئەم فەرمودەیەی هێناوەتەوە:**

((نجيء نحن يوم القيامة عن كذا وكذا انظر إلى ذلك فوق الناس، قال: فتدعى الأمم بأوثانها وما كانت تعبد، الأول فالأول، ثم يأتينا ربنا بعد ذلك فيقول: من تنظرون؟ فيقولون: ننظر ربنا، فيقول: أنا ربكم، فيقولون: حتى ننظر إليك، فيتجلى لهم يضحك.

قال: فينطلق بهم ويتبعونه، ويعطى كل إنسان منهم، منافق أو مؤمن نوراً، ثم يتبعونه، وعلى جسر جهنم كلاليب وحسك، تأخذ من شاء الله ثم يطفأ نور المنافقين، ثم ينجو المؤمنون أول زمرة وجوههم كالقمر ليلة البدر، سبعون ألفاً لا يحاسبون، ثم الذين يلونهم كأضوأ نجم في السماء..:[1] **ئینجا دوای ئەوەی بڕوادارەکان لە پردەکە دەپەڕنەوە؛ دەچنە بەهەشت، یەکەمین کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشت ڕەنگ و ڕویان وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، حەفتا هەزار کەسن، پاشان کۆمەڵی دوەم ڕەنگ و ڕویان وەك ورشەدارترین ئەستێرە دەبریسکێتەوە))** [2].

**هەروەها بوخاری وموسلیم لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی یاوەراندا دەربارەی دیتنی خوا پرسیاریان کردبو فەرموی:**

((هل تضارون في القمر ليلة البدر ليس دونه سحاب؟ قالوا: لا يا رسول الله. قال فإنكم ترونه يوم القيامة كذلك، يجمع الله الناس فيقول: من كان يعبد شيئاً فليتبعه، فيتبع من كان يعبد الشمس، ويتبع من كان يعبد القمر، ويتبع من كان يعبد الطواغيت، وتبقى هذه الأمة فيها منافقوها. فيأتيهم الله في غير الصورة التي يعرفون، فيقول: ربكم، فيقولون: نعوذ بالله منك، هذا مكاننا حتى يأتينا ربنا، فإذا أتانا ربنا عرفناه، فيأتيهم الله في الصورة التي يعرفون، فيقول: أنا ربكم، فيقولون: أنت ربنا، فيتبعونه، ويضرب جسر جهنم، قال رسول الله ﷺ:

---

[1] واتای سەرەتای فەرمودەکە نەنوسراوە چونکە هەمان واتای فەرمودەکەی پێشووی هەیە. وەرگێڕ-

[2] رواه مسلم. كتاب الإيمان. باب أدنى أهل الجنة منزلة: (١/١٧٥) ژمارە (١٩١).

((فأكون أول من يجيز، ودعاء الرسل يومئذ: اللهمَّ سلّم سلّم، وبه كلاليب مثل شوك السعدان، أما رأيتم شوك السعدان؟ قالوا: بلى يا رسول الله، قال: فإنها مثل شوك السعدان، غير أنها لا يعلم قدر عظما إلاّ الله، فتخطف الناس بأعمالهم، منهم الموبق بعمله، ومنهم المخردل، ثم ينجو ..: ئایا له شەوی چواردەدا کە ئاسمان سامالْ بیّ لە دیتنی مانگدا چاوتان رەشکەو پێشکە دەکات؟ گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا. فەرموی: ئێ دەبزانن لە رۆژی قیامەتیشدا ئاوا بەبیّ ئەزیەت و ئەستەمی خوا دەبینن... [1]))[2].

ئەم فەرمودە صەحیحانە ئاماژەی راشکاو بۆ چەند شتێك دەکەن، باسی ئەوەی تێدا کراوە کە بێبڕواکان بەرەو دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە، چۆنیەتی گوزەرکردنی بڕوادارەکان بەسەر پردی دۆزەخ و چونە بەهەشتیان، هاوێر بونی دوڕوەکان، هەروەها بەشێوەیەکی تێکڕایی ئاماژەی بۆ واتای ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾ تێدایە.

بەیاریدەی خوا لە جێباسەکانی داهاتودا کەمێك بە درێژی باسیان دەکەین.

---

[1] ئەوەندەی تەرجەمە نەکراوە هەمان واتای هەیە لەگە فەرمودەکەی پێشتردا. وەرگێڕ-.

[2] رواه البخاري في صحيحه، كتاب الرقاق باب الصراط جسر جهنم. فتح الباري: (١١/٤٤٤) ورواه مسـ في صحيحه في كتاب الإيمان باب معرفة طريق الرؤية (١/١٦٣) ژماره (١٨٢) واللفظ للبخاري.

## جێباسی دووەم

## کۆکردنەوەی بێباوەڕان بەرەو دۆزەخ

**لـــە زۆر ئایـــەت و فـــەرمودەدا باســـی چۆنیـــەتی کۆکردنـــەوەی کـــافران و پەرستراوەکانیان کراوە کە چۆن بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن.**

**١- پۆل پۆل وەکو ولاخ کۆ دەکرێنەوەو بە توندی سەرکۆنە دەکرێن و خۆیان لێ توڕە دەکرێ و لەملاو لەولاڕا هاواریان لەسەر دەکرێ، وەك چۆن شوان و گاوان لە گاگەلەکەیان ڕادەخوڕن، ئەوانیش ئاوەها:**

﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَــــرًا: **بێبڕواکان دەستە دەستە بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن.**﴾الزمر ٧٣.

﴿يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَى نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّـــا: **لەو ڕۆژەدا بێبڕواکان بەتوندی بەرەو دۆزەخ پاڵەپەستۆ دەدرێن.**﴾ الطور ١٣.

﴿وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَــهُمْ يُوزَعُــونَ: **لەو ڕۆژەدا دوژمنانی خوا بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوە**﴾ فصلت ١٩.

**٢- وەکو دنیا بە پیادە ناڕۆن، بەڵکو لەسەر ڕو ڕادەخشێندرێن:**

﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلَى جَهَنَّمَ أُوْلَئِكَ شَرٌّ مَّكَانًــــا وَأَضَــلُّ سَــبِيلاً: **ئەو بێبڕوایانـەی لەسـەر ڕو ڕادەخشێندرێن و بـەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنـەوە، بێگومـان لـە شوێنێکی زۆر خراپ و ناهەمواردا دەبن و گومڕاترین ڕێگەشیان گرتۆتە بەر**﴾الفرقان ٣٤.

**ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پیاوێك پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا بێبڕواکـــان لـــە ڕۆژی قیامـــەتدا چـــۆن لەســـەر ڕو کۆدەکرێنـــەوە؟ فـــەرموی:**

**((ئەو خوایەی لەنیادا لەسەر دوقاچ دەیانڕوێنێ توانای هەیە لەرۆژی قیامەتیشدا لەسەر رو رایانخشێنێ)) قەتادە دەڵێ: سوێند بە عیززەتی خوا ڕاستە.**[1]

**جگە لەمەش کوێرو کەڕو لاڵیش دەکرێن:**

﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا مَّأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا: **لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ڕو و بەکوێرو کەڕو لاڵی کۆیان دەکەینەوە، هەوارگەیان دۆزەخە، هەر جارەی ئاگری دۆزەخ دادەمرکێتەوە، بە جۆشی دەخەینەوە**﴾ الإسراء ٩٧.

**٣- دەردیان بەوە گرانتر دەبێ کە لەگەڵ بەناوخوا و هاریکار و شوێنکەوتوان کۆدەکرێنەوەو دەخرێنە دۆزەخ:**

﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. مِن دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ: **بێبڕوایانی ستەمکار و هاوچون و پەرستراوەکانیان کۆبکەنەوەو بەرەو دۆزەخیان ببەن.**﴾ الصافات ٢٢-٢٣.

**٤- زەبون و سەرشۆڕ و ڕیسوان:**

﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمِهَادُ: **بڵێ بێبڕواکان لەمەودوا زەبون دەبن و بەرەو دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە، کە خراپترین لانەیە**﴾ آل عمران ١٢.

**٥- بەر لەوەی بگەنە ئاگری دۆزەخ گرمە و نرکە و ژاوە ژاوی دۆزەخ گوێیان کاس دەکات و دڵیان دادەخورپێنێ:**

﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا: **لە دورەوەڕا کە دۆزەخ دەیانبینێ گوێیان لە دەنگی کەفوکوڵ و نرکەی دۆزەخ دەبێ**﴾ الفرقان ١٢.

---

[1] رواه البخاري في كتاب الرقاق، باب الحشر، فتح الباري (٣٧٧/١١) ومسلم (٢١٦١/٤) ژمار (٢٨٠٦) واللفظ لمسلم.

٦- كـه دەگەنـه نزیـك دۆزەخ و ناخۆشـی و كارەسـاتەكانی دەبینـن خۆزگـه دەخوازن بگەڕێنەوە دنیا تا بڕوا بێنن:

﴿ وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِـنَ الْمُؤْمِنِيـنَ: ئەگـەر دەیـانبینی لـەو وەختـەی كـە لـە بەرامبـەر ئـاگری دۆزەخ ڕادەگیرێن، دەڵێن: خۆزگە بۆ ئەم جارەش دەگەڕاینـەوە دنیا، ئـەمجارە ئایەتـەكانی خوامان بەدرۆ نەدەزانی و بڕوامان دەهێنا﴾ الأنعام ٢٧.

بەڵام بێدەرەتانن و هیچ ڕزگارگەیەك نادۆزنەوە:

﴿وَرَأَى الْمُجْرِمُونَ النَّارَ فَظَنُّوا أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَـمْ يَجِـدُوا عَنْـهَا مَصْرِفًـا: تاوانكارەكـان ئـاگری دۆزەخ دەبینـن، دەزانـن تـازە دەچنـه نـاوی، هیـچ دەرەتـانێك نادۆزنەوە ڕزگاریان بێت ﴾ الكهف ٥٣.

٧- ئینجا فەرمان دەكرێ بە ڕیسوایی ڕاپێچ بكرێنە ناو ئاگری دۆزەخ:

﴿فَادْخُلُواْ أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَلَبِئْسَ مَثْـوَى الْمُتَكَـبِّرِينَ: لە دەرگاكانی دۆزەخ بڕۆنە ژورەوەو بە هەمیشەیی لەوێدا بمێننەوە، بەڕاستی جێگایـەكی بەدە بۆ فیزبەرزان ﴾ النحل ٢٩.

هەڵبـەت لـەو مرۆڤ و جنۆكانـه بـترازێ كـه بڕوایـان بـه خـواو بـه پێغەمبـەران و پەیامەكان هێناوە ئەوانی‌تر گشتی فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخ:

﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا، ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِـنْ كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَانِ عِتِيًّا، ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَى بِهَا صِلِيًّـا، وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا، ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِيـنَ اتَّقَـواْ وَنَـذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا: سوێند بە پەروەردگارت هەمو بێبڕواو شەیتانەكان كۆدەكرێنەوە پاشـان لـە دەوری دۆزەخ ڕایـاندەگرین، ئەژنۆیان شكاوە و لەسـەر چۆكـدا كـەوتون. پاشـان لـە هـەمو چینـەكان ئەوانەی لە ئاست خـوا سەرسـەختتر و سـەهەندەتر بـون

پەلیان دەگرین و بۆ ناو دۆزەخ فڕێیان دەدەین. ئێمە دەزانین کێ شایستەیە زوتر فڕێ دریّ. کەس نیە بە جەهەننەم رانەبوریّ، دەبیّ سەرجەمتان بەسەریدا رابورن، ئەمە بڕیارێکی خوایە و دەبیّ بێتە دی. پاشان بڕوادارە پارێزکارەکان رزگار دەکەین و بێبڕوا ستەمکارەکانیش لە دۆزەخدا جیّ دەهێڵین ﴾ مریم ٦٨-٧٢.

سەید قوتب (بەهەشتی بیّ) لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا دەڵێ: (لێرەدا خوا سوێند بە نەفسی خۆی دەخوات، کە گەورەترین و مەزنترین سوێندە. لەسەر ئەوەی کە هەمویان کۆدەکاتەوە، بڕیارێکەو بڕاوەتەوە ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ ﴾ بە تەنیا نین بەڵکو شەیتانەکانیش ﴿لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ﴾، ئەو شەیتانانەی هانی دەدان، کە پەیوەندیەکی شوێنکەوتو و پێشەنگانە و سەرکردەو ژێرکردانەیان لەگەڵ یەکدا هەبوە لێرەدا وێنەیەکی هەستەکی دەکێشێ، هەمویان لە دەوری دۆزەخدا بەڕیسوایی و سەرشۆڕی لەسەر چۆك کەوتون:

﴿ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴾.

بەڕاستی وێنەیەکی ترسناکە، ئەو ئاپۆرە بیّ هەژمارە لەسەر چۆك کەوتون و هەراو هەنگامە سامناکەکەی دۆزەخ دەبینن، تین و تاوی گەرمیەکەی هوروژم دەکاتە دەموچاویان، چاوەڕێن ئێستا نا ئێستا پەلیان بگرن و فڕێ درێنە ناوی، بەسەر شۆڕیو دڵ پڕ لە ترسەوە لەسەر ئەژنۆ داکەوتونە، بەڕاستی دیمەنێکی پڕ لە زەبونیو ریسواییە بۆ تاوانکارە بە زەبر و زەنگەکان، پاشان دیمەنێکیتر نیشان دەدات کە پەلی سەرسەختەکان دەگرن و ڕایاندەپێچن:

﴿ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَنِ عِتِيًّا﴾

وتەکان توندو تیژییان تێدایە، زەنگ و سێبەری ئەم وتانە وێنەی پەلگرتن و ڕاپێچکردنەکەیان دێنێتە بەرچاو کە پاشانیش فڕێ دەدرێنە ناو ئاگر، وتەکان زیوەیەکی وایان تێدایە دیمەن و وێنەکە لە خەیاڵی مرۆڤ تەواو دەکەن. خوا خۆی دەزانیّ کیّ شایستەیە یەکەمین جار بخرێتە دۆزەخ، لەناو ئەو ئاپۆرە بیّ ئەژمارەدا

کەس نیە ڕەمەکیانە دەربهێندرێ، چونکە خوا یەك یەك هەڵیژماردون و دەزانێ ئەوانە کێن:

﴿ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَى بِهَا صِلِيًّا﴾

سەرسەختەکان هەڵدەبژێردرێن تا ببنە پێشەنگی چونە دۆزەخ).[1]

ئەم بەشە ئایەتە ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾ ڕەوشی چاکانی گۆڕی و شەوی پێ زڕاندن و گوزەرانی لێ گرژ کردن و پێکەنینی لێ تاراندن و خۆشی دنیای لێتاڵ کردن.

ئەبو مەیسەرە کە دەچوە سەر جێگا دەیگوت: خۆزگە نەبام، پاشان دەستی بەگریان دەکرد، لێیان پرسی ئەبو مەیسەرە بۆچ دەگری؟ دەیگوت: چونکە خوا بڕیاری داوە بە دۆزەخدا تێپەڕین بەڵام پێی ڕانەگەیاندوین ڕزگار دەبین یان نا؟ عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك لە حەسەنی بەسرایی دەگێڕێتەوە کە جارێکیان یەکێك بە برایەکەی گوت: دەزانی بە ئاگردا ڕادەبوری؟ گوتی: بەڵێ. گوتی: دەزانی ڕزگار دەبی یان نا؟ گوتی: نەخێر. گوتی: ئەدی ئەو پێکەنینەت لە چ؟ ئیتر ئەو برایە هەتا مرد بۆ جارێکیتر پێنەکەنی.

ئیبنو عەبباس گفتوگۆی لەگەڵ پیاوێك دەکرد و پێی گوت: ئەبو ڕاشد من و تۆ هەردوکمان تێدەپەڕین، جا سەرنجدە ئاخۆ ڕزگارمان دەبێ یان نا؟[2].

---

[1] في ظلال القرآن: (٤/٢٣١٧).

[2] تفسير ابن كثير: (٤/٤٧٦).

## جیناسی سێیەم

# لە پرد پەڕینەوەی بڕواداران و هاوێربونیان لە دوڕوان

**کە کاروباری بێبڕواکان بڕاوەو بە چارەنوسی دۆزەخی خۆیان گەیشتن: تەنها بڕواداره یەکخواناسەکان دەمێننەوە. گوناحبارو دوڕوەکانیش لە گەڵ واندان. ئەو کات پێش پردەکە تاریك تاریك دەبێ. خاتو عائیشە** (ڕەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺم پرسی ئەو وەختەی ئەرزو ئاسمانەکان دەگۆڕێن خەڵك لە کوێ دەبن فەرموی:** ((هم في الظلمة دون الجسر: **لەنێو تاریکستانی خوار پردی دۆزەخدا دەبن)).**

**ڕاڤەنوسی طەحاویە**[1] **دەڵێ: ((لەم شوێنەدا دوڕوەکان لە بڕواداران هاوێر دەکرێن، بڕواداران بە پێش دەکەون و ئەوانیش بە پاش. ئەوجا شورەیەکیان لە نێودا بونیاد دەبێ نایانگەنێ. بەیهەقی بەسەنەدی خۆی لە مەسروقی گێڕاوەتەوە ئەویش لە عەبدوڵلا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ((يجمع الله الناس يوم القيامة))... **تا دەفەرموێ:**

((فمنهم من يعطى نوره مثل الجبل بين يديه، ومنهم من يعطى نوره فوق ذلك، ومنهم من يعطى نوره مثل النخلة بيمينه، ومنهم من يعطي دون ذلك بيمينه، حتى يكون آخر من يعطى نوره في إبهام قدمه. يضيء مرة ويطفأ أخرى، إذا أضاء قدم قدمه، وإذا أطفأ قام، قال: فيمر ويمرون على الصراط، والصراط كحد السيف دحض مزلة، ويقال لهم: امضوا على قدر نوركم، فمنهم من يمر كأنقضاض الكوكب، ومنهم من يمر كالريح، ومنهم من يمر كالطرف، ومنهم من يمر كشدّ الرّجل، يرمل رملاً على قدر أعمالهم، حتى يمر الذي نوره على إبهام قدمه، تخرّ يدٌ، وتعلق يد، وتخر رجل وتعلق رجل، وتصيب جوانبه النار، فيخلصون فإذا

---

[1] شرح الطحاوية: ص ٤٧٠.

خلصوا، قالوا: الحمدلله الذي نجانا منك، بعد أن أراناك. لقد أعطانا ما لم يعط أحد: **خوا له ڕۆژی قیامەتدا خەڵك كۆ دەكاتەوە .... بڕوادار هەیە بەقەد شاخێك ڕوناكی دەخرێتە بەردەمی، هی وا هەیە لەوەش زیاتر، هەیە بەقەد دار خورمایەك ڕوناكی دەخرێتە لای دەستە ڕاستی، هی وا هەیە لەوەش كەمتری دەدرێتێ.**

**بەم جۆرە تا دەگاتە ئەو كەسەی كە ڕوناكی دەدرێتە پەنجەكانی پێی و پێدەبێ و دەكوژێتەوە، كە پێدەبێ هەنگاو داوێ كە دەكوژێتەوە ڕادەوەستێ. هەمویان بەسەر پردەكە ڕادەبورن كە وەكو دەمی شمشێر تیژ و لوس و خلیسكە، پێیان دەڵێن: بە قەد ڕوناكیەكەتان تێپەڕن. هی وا هەیە وەك خێرایی ڕژانی ئەستێرەكان گوزەر دەكات، هەیە وەك با هەیە بە چاوتروكانێك دەپەڕێتەوە، هی واش هەیە وەك كەسێكە پێی زنجیر كرابێ، خێراییان بە گوێرەی كردەوە چاكەكانە. تا ئەو كەسە گوزەر دەكات كە ڕوناكیەكەی لە پەنجەی پێی دایە. ئەم كەسە دەست و پێیەكی دادەنێ ئەوەی تر هەڵدەگرێ، دەست و پێیەكەی تری دادەنێ ئەوەی دی هەڵدەگرێ، ئاگریش لەم لاو ئەو لا هوروژمی بۆ دێنێ، بەم ڕەزاڵەتەوە دەبێ تا ڕزگاری دەبێ، كاتێك كە هەمو ڕزگار دەبن دەڵێن: سوپاس بۆ خوا كە لەو ئاگرەی دەرباز كردین، بەخوا كارەساتێكی گەورەیە، سوپاس بۆ خوا شتێكی وای پێداین كە بە كەسی تری نەداوە)).[1]**

**خوا لەم چەند ئایەتەدا باسی دیمەنی پەڕینەوەی بڕوادارەكانمان بۆ باس دەكات و دەفەرموێ:**

﴿ يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الانْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ. يَوْمَ يَقُولُ

---

[1] شێخ ناصر لە تەخریجي فەرمودەكانی طەحاویەدا (٤٧٠) دەڵێ: ((صحيح أخرجه الحاكم، وأظن أن البيهقي من طريقه رواه، وقال الحالكم (صحيح على شرط الشيخين) ووافقه الذهبي)) وبين الشيخ ان أحد رواته فيه ضعف ثم هو مدلس لكنه توبع وصرح بالتحديث فالحديث صحيح.

الْمنافِقُونَ والْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءكُمْ فَالْتَمِسُوا نُوراً فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ. يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَى وَلَكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّى جَاء أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ. فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ:

**لە ڕۆژی قیامەتدا بڕوادارەکان روناکیان لە بەردەم و لای ڕاستیانەوە هەیە، موژدەیان پێدەدرێ: ئەمڕۆ بە هەمیشەیی دەچنە ناو چەندین بەهەشت، کە ناو و جۆگەلەیان بە بندا دەڕوات، بەڕاستی سەرکەوتنێکی مەزنە. دوڕوەکان داوا لە بڕوادارەکان دەکەن و دەڵێن: تەماشامان بکەن با لە روناکیتان بەهرەوەر بین، ئەوانیش پێیان دەڵێن: بڕۆن بگەڕێنەوە دنیایێ لەوێ ڕوناکی پەیدا بکەن. ئەوجا یەکسەر شورەیەکیان لەنێواندا هەڵدەچنرێ کە روی ناوەوەی پڕ میهرەبانیە و روی دەرەوەی لای دوڕوەکانیش پڕ لە سزاو ئەشکەنجەیە. بانگی بڕوادارەکان دەکەن و دەڵێن: ئەدی ئێمە لە گەڵتان نەبوین؟ دەڵێن: با، بەڵام خۆتان فریو داو چاوەڕێ بون بدۆڕێنین، گومانتان لەو ڕۆژە هەبو، ئاوات و ئارەزوەکان چەواشەی کردن تا ئەو وەختەی مردن یەخەی گرتن، ئێوە بەشەیتان هەڵخەڵەتان. لەم ڕۆژەدا سەرگەردو قوربانی نە لە دوڕوەکان و نە لە بێبڕواکان وەرناگیرێ، هەوارتان دۆزەخە کە چارەنوسێکی نەگبەتە﴾** الحدید ١٢-١٥.

**خوا لەم چەند ئایەتەدا ڕەوشی ئەو بڕوادارانە ڕون دەکاتەوە کە لە دنیادا لەبەر ڕۆشنایی و ڕوناکی ئاینەکەیدا ژیاون، ئەوڕۆکەش لە ڕۆژی قیامەتدا ڕۆشنایی‌و ڕۆناکیان پێدەدرێ تاکو ڕێی تاریکی پێ ببڕن و بچنە نێو بەهەشتە پڕنازو بەهرەکان، ڕێی خلیسك و سامناك دەبڕن و پاشان مژدەی بەهەشتیان پێ دەدرێ، بەڵام دوڕوەکان کە لە دنیادا خۆیان بە موسڵمان نیشان دەداو لە دڵەوەش بێبڕوای زگرەش بون، هاوێر دەبن و لە ڕوناکی بێبەش دەبن، چونکە لە دنیادا لە روناکی قورئانی پیرۆز بێبەش بون، لەوێدا زۆج دەبن، وا تێدەگەن کە لەگەڵ بڕوادارەکاندان**

و ڕوناکیش وەردەگرن! کەچی هەر لە تاریکیدا دەبن، ئەوجا داوا لە بڕواداران دەکەن روناکیان پێ بدەن بەڵام ئەستەمە! پێیان دەڵێن بڕۆنەوە دنیایێ لەوێدا رونـاکی وەرگرن! ئیتر بڕوادارەکان وەپێش دەکەون و دوڕووەکانیش وەپاش. شورەیەکیش لە نێوانیاندا هەڵدەنرێ، سەرەنجام دوڕووەکان لە دۆزەخ و بڕوادارانیش لە بەهەشت دەگیرسێنەوە.

نزای بڕواداران لەو کاتیدا ئەوەیە کە لە خوا دەپاڕێنەوە روناکیەکەیان بۆ تەواو بکات:

﴿يَوْمَ لا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ نُورُهُمْ يَسْعَى بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾: خـوا لـە ڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەرو بڕواداران ڕیسوا ناکـات، لـە پێش و لای ڕاستیانەوە روناکیان هەیە، دەڵێن خوایە! روناکیەکەمان بۆ تەواو بکەو لە گوناحەکانمان خۆش بە، تۆ توانات بەسەر هەمو شتێکدا هەیە﴾التحريم ٨.

موجاهید و ضەححاك و حەسەنی بەسرایی‌و هی‌تریش دەڵێن: بڕواداران لەو وەختەدا ئەو نزایە دەکەن کە دەبینن روناکی دوڕووەکان دەکوژێتەوە.[1]

---

[1] تفسير ابن كثير (٧/٦١).

## جێباسی چوارەم

### بڕواداران بە پردی دۆزەخدا ڕادەبورن نەك هاوبەشپەرستان

لە فەرمودەکانی پێشودا بۆمان ئاشکرا بو کە نەتەوە بێبڕواکان وەدوای پەرستراوەکەیان دەکەون تا لەگەڵ خۆیدا دەیانخەنە ناو دۆزەخەوە. پاشان بڕواداران دەمێننەوە کە هەڵبەت گوناحبارو دوڕوەکانیشیان تێدایە. ئیتر بۆ ئەمان پردی دۆزەخ ڕادەهێشترێ.

من لە پەڕتوکی هیچ زانایەکم نەدیوە ئەو شتەی باس کردبێ کە پردی دۆزەخ تەنها بۆ بڕواداران ساز دەکرێ بەڵام بێبڕواو هاوبەشپەرست و خوانەناسان لە پێشتردا دەخرێنە دۆزەخ و پەڕینەوە ئەوان ناگرێتەوە. تەنها ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی نەبێ، ئەو لە پەڕتوکەکەیدا بەناوی ((التخویف من النار)) باسی کردوەو دەڵێ:

(بزانە، خەڵك بۆ دو چین دابەش دەبن، چینێکیان ئەو بڕوادارانەن کە بەتەنها خوایان پەرستوە، چینیدوەم: ئەو هاوبەشپەرستانەن کە لەگەڵ خوادا شتیتریان پەرستوە. هاوبەشپەرستەکان بەسەر پرددا ڕانابورن بەڵکو بەر لەوەی پرد ساز بکرێ دەکەونە ناو دۆزەخەوە).[1]

پاشان هەندێ لەو فەرمودانەی هێناوەتەوە، یەکێکیان فەرمودەکەی ئەبو سەعیدی خودریە کە لە هەردو صەحیحاندا هەیە. پاشان دەڵێ:

(ئەم فەرمودەیە بە ڕاشکاوی ڕادەگەیەنێ هەمو ئەو کەسانەی کە ناخوایان پەرستوە، وەکو نامەوەران کە مەسیح و عوزەیریان پەرستوە، بەر لەوەی پردی

---

[1] التخويف من النار: ل ١٨٧.

دۆزەخ ڕاهێڵدرێ لە دوای هاوبەشپەرستەکانەوە دەچنە ناو دۆزەخ، بەلام بت و خۆر و مانگ و چ و چ پەرستەکان هەر چینە و بە دوای پەرستراوەکانیان دەڕۆن و لەگەڵ یەك بەردەبنەوە ناو دۆزەخ، ئەوانە یەکەمجار دەچنە دۆزەخ. خوا لەم ئایەتەدا ئەوەی رون کردۆتەوە کە لەبارەی فیرعەوندا دەفەرموێ:

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ﴾ هود: ٩٨.

بەلام ئەو نامەوەرانەی مەسیح و عوزەیریان پەرستوە ئەوانیش لەگەڵ بەناو نەتەوەکانی‌تری پێغەمبەران وەدوا دەخرێن پاشان بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن.

لە فەرمودەیەکی‌تردا هاتوە کە شەیتانێك دەخرێتە سەر شێوەی مەسیح و شەیتانێکیش دەچێتە سەر شێوەی عوزەیر ئینجا وەدوایان دەکەون. بەلام لە فەرمودەکەی کەڕەنادا دەفەرموێ فریشتە خۆی دەخاتە سەر شێوەی عوزەیر و مەسیح. ئیتر دوای ئەوەی ئەوانیش چونە دۆزەخ کەسی‌تر نامێنێتەوە تەنها ئەوانەی خوایان پەرستوە کە بڕوادار و گوناحبارو دوڕوانیش دەگرێتەوە، چونکە دوڕوەکان بەڕواڵەت خۆیان واپیشان داوە موسڵمان بن، بەلام پاشان بە سوژدە نەبرنەکەیان لە بڕواداران هاوێر دەبن، بەوەش هاوێر دەبن کە ڕوناکی دەدرێتە بڕواداران کەچی ئەوان لێی بێبەشن)[1].

ئەمەش دیدێکی راستی خاوەنی ئەم وتەیەیە، بەر میهری خوا بکەوێ.

---

[1] التخويف من النار: ١٨٨.

## جیباسی پینجەم

# واتای بە ئاگردا تێپەڕین

**هەندێ زانا پێیان وایە لەو ئایەتەدا کە خوا دەفەرموێ:**

﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ مريم: ٧٢

**مەبەست لە** ﴿وَارِدُهَا﴾ **چونە ناو دۆزەخە.. ئەمە وتەی ئیبنو عەبباسەﷺ[1]، بۆ بۆچونەکەی ئەو ئایاتانەی بە بەڵگە دەهێناوە کە دەفەرموێ:**

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ﴾ هود: ٩٨.

﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾ مريم: ٨٦.

﴿لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ آلِهَةً مَّا وَرَدُوهَا﴾ الأنبياء: ٩٩.

**موسلیملئەعوەریش لە موجاهید دەگێڕێتەوە کە لە تەفسیری** ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾ **وتویەتی: واتە دەچێتە ناوی.**[2]

**هەندێ زانای‌تر وای بۆ چونە کە مەبەست بە پرددا پەڕینەوە بێ. راڤەنوسی طەحاویە دەڵێ: تەفسیر زانەکان لە واتای (الورد)ی ئەم ئایەتەدا ڕایان جیاوازە کە دەفەرموێ:** ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾ **ئایە مەبەست چیە؟ ڕای پەسەندترو بەهێزتر ئەوەیە کە دەڵێ مەبەست بە پرددا تێپەڕینە، چونکە خوا دەفەرموێ:**

﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾.

**لە صەحیحیشدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((والذي نفسي بيده لا يلج النار من بايع تحت الشجرة: **بەو خوایەی گیانی منی لە دەستە ئەو کەسەی لە ژێر درەختەکەدا پەیمانی داوە ناچێتە ناو ئاگر)).**

---

[1] التخويف من النار: ل ٢٠.

[2] التخويف من النار: ل ٢٠٠.

**حەفصە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی خوا نافەرموێ:**

﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾.

**فەرموی: ئەدی نەتبیستوە دەشفەرموێ:**

﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾.

**لێرەدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە بە ئاگردا تێپەڕین مەرج نیە بچیتە ناوی. چونکە ڕزگار بون لە ناخۆشی ئەوە ناگەیەنێ ناخۆشیەکەی لێ ئالابێ، بەڵکو ئەگەر دوژمن وەدوای یەکێك کەوتن بەڵام نەکەوتە بەردەستیان و دەرباز بو پێی دەڵێن ڕزگاری بو. هەر بۆیەشە خوا دەفەرموێ:**

﴿وَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُوداً﴾هود:٥٨.

﴿فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَالِحًا ﴾هود:٦٦.

﴿وَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا﴾هود:٩٥.

**خۆ سزایەکە توشی ئەوان نەبو بەڵام توشی خەڵکە بێبڕوایەکە بو، ئەگەر خوا هۆکاری ڕزگار بونی بۆ تەرخان نەکردبان ئەوانیشی دەگرتەوە. ڕەوشی ئەوانەی بە ئاگریشدا تێدەپەڕن وەکو وانە کە بەسەر پردی دۆزەخدا تێدەپەڕن بەڵام خوا پارێزکارەکان ڕزگار دەکات و ستەمکارەکانیش دەخرێنە ناو دۆزەخەوە. لە فەرمودەکەی جابردا پێغەمبەرﷺ ڕونی کردۆتەوە کە مەبەست لە (المورود) بەسەر پرد تێپەڕبونە.[١]**

**ڕاستی دەرەنجام ئەوەیە دو جۆرە چونە ناو دۆزەخ هەیە: جۆرێکیان چونە دۆزەخی بێبڕواکانە کە ئەوانە هەر لەوێدا دەمێننەوەو گومانی تێدا نیە وەکو خوا لە بارەی فیرعەون دەفەرموێ:**

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ﴾ هود: ٩٨.

**چونە دۆزەخی دوەم: ئەوەیە کە بڕوادارەکان بەسەر پردی دۆزەخدا تێدەپەڕن هەروەکو لە فەرمودەکان باس کراوە.**

---

[١] شرح العقيدة الطحاوية: ل ٤٧١.

## جێباسی شەشەم

# هەقیقەتی پردی دۆزەخ و بیروباوەڕی یارانی ڕێبازو کۆمەڵ

سەفارینی دەڵێ: (الصراط) لە زماندا واتە ڕێگەی ڕون و ئاشکرا. وتەکەی جەریریش بەو واتایەیە کە دەڵێ:

أمير المؤمنين على صراطا ذا أعوج الموارد مستقيم

لە شەرعیشدا واتە ئەو پردەی کە لەسەر پشتی دۆزەخ ڕاهێڵ دەکرێ و یەکەمین و دواهەمینی بەسەردا دەڕوات، پردەکەش بوارگە(قنطرة)ی نێوان بەهەشت و دۆزەخە.[1]

ڕاڤەکاری طەحاویە بیروباوەڕی خۆی لە بارەوە نوسیوەو دەڵێ: بڕوامان بە (الصراط) هەیە کە پردێکە لەسەر دۆزەخ، کاتێك کە خەڵك لە گۆڕەپانی لێپرسینەوە تەواو دەبن و دێنە نێو تاریکستانی بن ئەو پردە. هەروەکو خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەریان پرسی کە ئەرزو ئاسمانەکان دەگۆڕێن خەڵك لە کوێ دەبن؟ فەرموی: ((لەناو تاریکستانی بن پردی دۆزەخدا دەبن)).[2]

سەفارینی (بەر میهری خوابێ) هەڵوێست و بیروباوەڕی هەمو چینەکانی لەم بارەوە ڕون کردۆتەوە ئاخۆ پردەکە شتێکی مەجازیە یان هەقیقیە؟ پاشان وتەی ئەهلی هەقی هێناوەتەوە، دەڵێ:

(بە تێکڕای وتەی هەر هەمویان پردی دۆزەخیان سەلماندوە کە هەیە، بەڵام ئەهلی هەق وای دەسەلمێنن پردێکە لەسەر پشتی دۆزەخ ڕاهێڵ کراوەو لە دەمی شمشێر تیژترە و لە تاڵە موش باریکترە. بەڵام ئەلقاضی عبدالجباری موعتەزیلەو

---

[1] لوامع الأنوار البهية (١٨٩/٢).

[2] شرح الطحاوية ل ٤٦٩.

زۆربەی شوێنکەوانیشی ئەوە ناسەلمێنن گوایە کەس ناتوانێ بەسەریدا ڕابوری، ئەگەر بشتوانرێ سزاو ئەشکەنجەی تێدایە، ئێ لە ڕۆژی قیامەتیشدا بڕوادار و چاکەکاران سزاو ئەشکەنجە ناخۆن بۆیە مەبەست وا نیە بەڵکو بریتیە لەو ڕێگە بەهەشتەی کە خوا لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ﴾ محمد ٥. هەروەها ئەو ڕێگە دۆزەخەی کە خوا لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ﴾ الصافات ٢٣، هی وا هەیە دەڵێ بەڵگە ڕون و ئاشکراکان و کارە موباحەکان ڕ کردەوە خراپەکانی پێ مەبەستە کە لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی بۆ دیار دەکرێ. بەلآم هەمو ئەم لێکدانەوە و بۆچونانە ئەفسانەو شتی پوچن، چونکە دەق دەبێ وەکو هەقیقەتی خۆی وەربگیرێ.

خۆ پەڕینەوەی پردی دۆزەخ لە فڕینی ناو هەوا و ڕاوەستان و ڕۆیشتن لەسەر ئاو ئەستەم تر نیە؟ پێغەمبەر ﷺ لە وەلامی لەسەر ڕو کۆکردنەوەی بێبڕواکاندا فەرمویەتی توانای خوا ئەوەی پێدەکرێ.

(ئەلقەراڧ) فرەزان نکوڵی کردوە کە پردەکە لە دەمی شمشێر تیژترو لە مو باریکتر بێ، بەر لەویش مامۆستاکەی: شێخ عیززی کوڕی عبدالسلام ئەویش ئینکاری کردوە وابێ.

ڕاستیش ئەوەیە کە پردی دۆزەخ فەرمودەی صەحیحی لەبارەوە هاتوە، وەکو خۆشی بێئەوەی واتاویل بکرێ وەردەگیرێ هەروەکو لە هەردو صەحیحەکان و موسنەدەکان و هەمو صەحیحەکانیتردا چەندین فەرمودەی لەبارەوە هاتوەو فەرمویانە (الصراط): پردێکە لەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەهێڵدرێ و سەرجەم خەڵکیش بەسەریدا دەڕۆن، پەڕینەوەکەشیان جۆرا و جۆرە).[1]

قورتوبیش وتەی ئەوانەی هێناوەتەوە کە واتاوێلی دەکەن و دەڵێن پردێکی مەجازیە: ((ئەو فەرمودانەی لە وەسفی پردی دۆزەخ فەرمویانە لە دەمی شمشێر تیژترەو لە تاڵە مو باریکترە، هەندێ کەس لە بارەیانەوە دەڵێن مەبەست لەوەدا

---

[1] لوامع الأنوار البهية (٢/١٩٢).

ئاسان و ئەستەمیە کە بە گوێرەی چاکە و گوناح دیار دەکرێن، ئەم کارەش هێندە ورد و شاراوەیە جگە لە خوا کەس ئەندازەکەی نازانێ.

باویش وایە شتی ناڕون و شاراوە بە وردی ناو دەبرێ، بۆیە کە دەڵێ لە تاڵە مو باریکترە ئەو مەبەستەی هەیە، کە دەشفەرموێ لە دەمی شمشێر تیژترە مەبەستی ئەوەیە خوا فەرمان بە فریشتەکان دەکات وەکو خێرایی بڕینی شمشێری تیژ خەڵکی چاکەکارو فەرمانبەر بپەڕێننەوە و گەڕانەوەشیان بۆ نیە هەروەکو چۆن شمشێری تیژ گەر بەهێز ڕاوەشێندریێو لە شتێك بدات گەڕانەوەی بۆ نیە ئەویش ئاوەها.

ئەگەر بشڵێن، پردەکە لە دەمی شمشێر تیژترو لە تاڵە مو باریکترە ئەوا، بە هەمان ئەو وەسفانەی لەبارەیدا هەیە ڕەت دەکرێتەوە، کە فریشتەکان لەم لاو ئەولایدا ڕادەوستن، قولاب و دڕکی پێوەیە، یەکێك لەسەری بڕوات بەردەبێتەوە پاشان هەڵدەستێتەوە، هەوەها لە بارەیدا هاتوە کە هەندێك لەوانەی بەسەریدا تێدەپەڕن بە قەد شوێن پێیەکانی ڕوناکی وەردەگرن، لەم وتەیەدا ئاماژە هەیە کە تێپەڕیوان بەقەد شوێن پێیەکانیان جێگەیان هەبێ، ئاشکراشە باریکایی تاڵە مو ئەم هەمو شتە بەخۆوە هەڵناگرێ.[1]

پاش ئەوەی وتەکانی ئەوانی هێناوەتەوە، ئەوجا وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێ: ((وتەکانیان بە پێی ئەو فەرمودانەی هێناومانەوە ڕەت دەکرێنەوە و لەسەرمان واجبە بەو جۆرەی هاتوە بڕوای پێبکەین. ئەو خوایەی توانای هەبێ باڵندە لە هەوادا ڕابگرێ دەشتوانێ بڕواداران لەسەر ئەو پردە ڕاگرێو بیانڕوێنێ، قەت نابێ لە هەقیقەتەوە بچین بۆ مەجاز مەگەر لەو کاتەی مەحاڵ بێتە پێشەوە، بەڵام ئەم فەرمودانە شتی مەحاڵیان تێدا نیە. ڕونکردنەوەی فەرمودەکانیش پیاوە ڕاستەکان کردویانە ﴿وَمَنْ لَمْ يَجْعَلْ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ﴾.[2]

---

[1] التذكرة للقرطبي ٣٣٢.

[2] التذكرة للقرطبي ٣٣٣.

## جێباسی حەفتەم

## ئامۆژگاری پەڕینەوە بەسەر پردی دۆزەخ

قورتوبی دەڵێ: ((بیر بکەوە، کە پردی دۆزەخ دەبینی هێندە باریکە چ ترسێك دێتە دڵت؟ کە ڕەش و تاریکی دۆزەخ دەبینی چت لێ دێت؟ لەگەڵ لرمە و نرکە و جۆشی ئاگر گوێت کاس دەبێ، ئاوەها لاوازو چۆکشکاو، ئاوەها دڵ بە لەرزەو مشاوەشی. باری گوناحانت ئەوەندە گرانە ئەوجا لەگەڵ ئەوانەدا فەرمانت بەسەر دەکرێ بەسەر ئەو پردە تیژو باریکەدا بڕۆی خۆ ئەگەر بەم جۆرە لەسەر فەرشێك بیت ناتوانی بڕۆی، ئەدی ئێستا کە ناچاری پێت لەسەر ئەو تیغە تیژە هەڵگری‌و ناچاری پێیەکەی ترت دابنێی، وا بەچاوی خۆشت دەبینی خەڵك بەردەبنەوە و ساتمە دەکەن، ئاگرەوانەکان بە قولاب و جەنگاڵ سەربەرەو ژێر هەڵیان دەدێرن. تۆش بە چاوی خۆت دەیانبینی پێیان بەرەو سەرەوەو سەریان بەرەو خوارەیەو بەردەبنەوە ناو قولایی دۆزەخ، ئای کە دیمەنێکی سامناکە! ئای کە سەخت و دژوارە)).[1]

هەروەها دەڵێ: ((برام! وا بێنە بەرچاوت لەسەر پردی دۆزەخی و تەماشای خوارەوە دەکەی، هەر تونەك و ڕەشایی دۆزەخ دەبینی، ئاگر دەبینی کە کڵپەی سەندوەو جۆش دەخواتەوە، کەچی تۆش دەڕۆی‌و بەردەبیەوە.

---

[1] التذكرة للقرطبي: ٣٣٢.

**پاشان دەڵێ:**[1]

أبت نفسي تتـــوب فمـا احتيـالي إذا بـرز العبـاد لـذي الجـــلالي

وقـاموا مـن قبورهـم سـكارى بـأوزار كأمثـال الجبـــال

وقد نصب الصراط لكـي يجـوزوا فمنهم من يكـب علـى الشـمال

ومنـهم مـن يسـير لـدار عـدن تلقـاه العرائـس بـالغوالي

يقـول لـه المـهيمن يـا وليـي غفرت لـك الذنـوب فـلا تبـالي

**یەکێکی تر دەڵێ:**

إذا مـد الصـراط علـى جحيـم تصول علـى العصـاة وتسـتطيل

فقـوم في الجحيـم هـم ثبـور وقـوم في الجنـان هـم مقيـل

وبـان الحـق وانكشـف المغطـى وطـال الويـل واتصـل العويـل

[1] التذكرة للقرطبي ٣٣٠.

سەرچاوەكان


١. التخويف من النار، للحافظ ابي الفرج بن الجوزي. طبعة المكتبة العلمية. بيروت.

٢. التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة للقرطبي. طبعة المكتبة السلفية المدينة المنورة.

٣. تفسير الآلوسي. طبعة إدارة الطباعة المنيرية.

٤. تفسير ابن كثير. طبعة دار الأندلس. بيروت. الطبعة الأولى. ١٣٨٥-١٩٦٦.

٥. تفسير القرطبي. طبعة دار الكتاب العربي. القاهرة.

٦. جامع الأصول في أحاديث الرسول لابن الأثير تحقيق عبدالقادر الأرناؤوط. نشر مكتبة الحلواني الطبعة الأولى، ١٣٩٢-١٩٧٢.

٧. الروح لابن القيم. نشر المكتبة العلمية. بيروت.

٨. سلسلة الأحاديث الصحيحة للشيخ ناصرالدين الألباني. نشر المكتب الإسلامي. بيروت. الطبعة الأولى.

٩. شرح العقيدة الطحاوية. لمحمد بن أبي العز الحنفي. نشر المكتب الإسلامي. بيروت. الطبعة الرابعة. ١٣٩١.

١٠. صحيح البخاري. اعتمدنا على متن فتح الباري: طبعة السلفية. القاهرة. الطبعة الأولى.

١١. صحيح الجامع الصغير للسيوطي. تحقيق محمد ناصر الدين الألباني. نشر المكتب الإسلامي. بيروت. الطبعة الأولى. ١٣٨٨-١٩٦٩.

١٢. صحيح مسلم. تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي. طبعة دار إحياء الكتب العربية. بيروت. الطبعة الثانية. ١٩٧٢.

١٣. العهد القَديم والعهد الجديد.

١٤. فتح الباري، لابن حجر العسقلاني. طبعة المكتبة السلفية. القاهرة. الطبعة الأولى.

١٥. في ظلال القرآن، لسيد قطب، طبعة دار الشروق.
١٦. لسان العرب، لابن المنظور. ترتيب يوسف خياط، ونديم مرعشلي، طبعة دار لسان العرب.
١٧. لوامع الأنوار البهية، للسفاريني. طبعة دولة قطر. الطبعة الأولى.
١٨. مجموع فتاوي شيخ الإسلام ابن تيمية. جمع ابن قاسم. طبعة دولة المملكة العربية السعودية. الطبعة الأولى.
١٩. مشكاة المصابيح للخطيب التبريزي. طبعة المكتب الإسلامي. دمشق. الطبعة الأولى. ١٣٨١-١٩٦١.
٢٠. معارج القبول. للشيخ حافظ حكمي طبعة الرئاسة العامة لإدارات البحوث العلمية. الرياض.
٢١. مقاصد المكلفين، لمؤلف هذا الكتاب. طبعة مكتبة الفلاح. الكويت.
٢٢. نهاية البداية والنهاية لابن كثير. مكتبة النهضة الحديثة. الرياض. الطبعة الأولى.١٩٦٨.